پرۆفیسۆر مستەفا زەلمی

# دەروازەیەک بۆ
# خوێندنی شەریعەتی ئیسلامی
# بە شێوازێکی نوێ



وەرگێڕانی: عبدالصمد محمد خەیلانی

# دەروازەیەك بۆ
# خوێندنی شەریعەتی ئیسلامی
# بە شێوازێکی نوێ

نووسینی

**دکتۆر مصطفی زەلمی**

وەرگێڕانی

عبدالصمد محمد خەیلانی

# کۆبەرهەمی دکتۆر مستەفا زەڵمی لە شەریعەت و یاسادا

سەرپەرشتیاری پرۆژە
رێدار رەئوف ئەحمەد

المدخل لدراسة الشريعة الإسلامية في نمط جديد

## دەروازەیەك بۆ خوێندنی شەریعەتی ئیسلامی بە شێوازێکی نوێ

نووسینی : دکتۆر مصطفی زەڵمی
وەرگێڕانی : عبدالصمد محمد خەیلانی
نەخشەسازی : جمعە صدیق کاکە
نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم ۲۰۱۷

نرخی هەر بیست و شەش بەرگ
۲۵۰,۰۰۰ دینار



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ۷٤٤ ) ساڵی ۲۰۱٦ی پێدراوە

﴿ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً ۚ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾

سورة التوبة/١٢٢

**(مَنْ يُرِدْ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ)**

روى البخاري (٧١) ، ومسلم (١٠٣٧)

# ناوەرۆك

# پێشەکی

**أ- هۆکارەکانی پێویستی پێشکەشکردنی ئەو هەوڵە لەخۆبوردەیە بۆ قوتابیانی ئازیزمان لە کۆلێژەکانی یاسای و کۆلێژەکانی شەریعە بریتین لە مانەی خوارەوە:-**

١- نەبوونی هیچ کتێبێك لەو بابەتە کە گشت بەشەکانی فیقهی ئیسلامی لەخۆبگرێت بەجۆرێك کە روون بێت و وەکو پێویست بێت و دوور بێت لە درێژە پێدانی بێزارکەر و کورتییەکی زیان بەخش.

٢- گۆڕینی شێوازی کلاسیکی لە رووی گواستنەوە و خستنەڕووی ئەو نموونانەی کە لە سەدەی بیست و یەك و لە سەردەمی کۆمپیۆتەر و ئەنتەرنێت و پێشکەوتنی زانستی و بەرەوپێشچوونی گشت بوارەکانی ژیان هیچ سوودێکی زانستییان نییە.

٣- تەسککردنەوەی بالّی ناکۆکی لە نێوان ئەو شەریعەتەی کە تاکە یاسای جیهانی ئیسلامییە لە کاتێکا زۆرێك لە میللەتان کار بە یاسای دارستان (قانون الغاب) دەکەن و نێوان ئەو یاسایەی کە بە هۆی وشك بوونی عەقڵی مسولمانان و وەستانی کۆشش (ئیجتهاد) جێگەی شەریعەتی گرتۆتەوە.

٤- تێگەیاندنی قوتابی یاسا کە شەریعەتی ئیسلامی تەنها نەریتێك و دروشمێکی ئاینیی نییە بەڵکو بریتیە لە ئاین و سیستەم و یاسا و تێگەیاندنی قوتابیانی

شەریعەت کە یاسا دوژمنی شەریعەت نییە بەڵکو یاسا لە ڕێکخستنی خێزان ١٠٠٪ و لە مامەڵە داراییەکان ٩٠٪ و لە نەهێشتنی تاوانەکان ٧٠٪ لەگەڵ شەریعەت کۆکە – گونجاوە – و شەریعەت و یاسا دوو چینن و تەواوکەری یەکترن و تەنها نەزانی مرۆڤ جیاوازی لە نێوانیاندا دەکات.

٥– دوورخستنەوەی ورووژاندنی جیاوازی و ناکۆکی کە لە کاتی خۆی میهرەبانی و بەهرە بوو بۆ ئەو گەلە، چونکە ئامانج لە بیروڕای جیاواز بریتی بوو لە گەیشتن بەو شتانەی کە لە بەرژەوەندی تاك و کۆمەڵگە دان، بەڵام ئەمڕۆ بووەتە ئامرازێك بۆ پەرتەوازەبوون و چەکێك کە دەمارگیرەکان لە هەر مەزهەبێك دژی هاوتاکەیان لە مەزهەبێکی تر بە کاری دەهێنن وەکو ئەوەی هەر یەکەیان لە ئاینێکی جیاواز بن.

٦– جیاوازیکردن لە نێوان شەریعەت بە واتای تایبەت تر و تایبەت و گشتی لە فیقهی ئیسلامی لە لایەك و جیاوازیکردن لە نێوان شەریعەت و فیقهی ئیسلامی و یاسا لە لایەکی تر.

**ب– پێناسەی دەروازە – تعریف المدخل:** (مدخل) چاوگی (دخل)یە دژی (خرج) واتا دەرچوو یان ناوێکە بە واتای ڕێڕەوی چوونەژوورەوەی خانوو، و ئەو بابەتە بە (مدخل) نابراوە چونکە بریتیە لە قەبارەیەکی بچووکی گرنگترین ئەحکامەکانی شەریعەت کەوا لە رووی ڕێکخستنی ژیان پەیوەندییەکی راستەوخۆیان بە بڕیارە یاساییەکانەوە هەیە و لە ڕێگەی ئەو بابەتەوە خوێنەر دەچێتە ناو بڕیارە درێژەکان و وردەکارییەکان، بەجۆرێك کە وەکو نەخشەیەکە لە ڕێگەیەوە قوتابی دەگاتە ئەمانجەکانی زانستی دیاریکراوی کورت کە لە داهاتوو خوێندنی درێژی لە سەر دادەمەزرێت.

جـ- له ژێر هەمان ناونیشانی هەردوو دانەری پێشوو[1] پێش چوارێك سەدە باسی ئـەو بابەتەم کردووە بەڵام چارەسەرییەکە بە هەمان شێوەی هەر دانەرێکی بەشداربوو لە ئامادەکردنی ئەو کتێبە کە چەند کەسێك بوون کەم و کوڕی هەیە و لەو کـەم و کوڕییانە پشتگوێ خستنی لایەنە گرنگەکان و گرنگیدان بـە لایەنـە ناگرنگـەکان و سەرەڕای ئەوە کەم و کوڕی و نارێکی لە زۆر لە بابەتەکان هەبوو.

د- بە پشتیوانی خودای گەورە هەوڵمداوە لەو کتێبە نوێیە بە شێوازێکی نـوێ باسـی بابەتەکە بکەم کە لەگەڵ زانستی سەردەمی پێشکەوتوو بگونجێت و لەگەڵ ئـەوە بگونجێت کەوا هەردوو بەشی گشتی و تایبەتی یاساکانی دەسـتکردی سـەردەمی نوێ چارەسـەریان کـردووە بـە شـێوەی ڕیزبەنـدی کـە لـە باسـکردن بابەتـەکانی پێشوو پێش بابەتەکانی دواوە بکەون، و بابەتەکانی دواوە تەواوکەری بابەتـەکانی پێشـەوە بـن دوور لـە کورتەیـەکی زیانبـەخش و درێژەییـەکی بێزارکـەر و بـۆ ئەنجامدانی ئەو هەوڵە لەخۆبوردەیە پشت بە خودای زانا و بە توانا دەبەستم.

هـ- نەخشەی باسکردنی بابەتەکە لە لایەنی شێوەیی:

بۆ ئەوەی بابەتەکە گشت بابەتەکانی شەریعەتی ئیسـلامی لـەخۆبگرێت پێویسـتە بە سەر یانزە بەش دابەش بکرێت بەو جۆرەی خوارەوە:-

**بەشی یەکەم**

**شەریعەت - الشريعة**

**بەشی دووەم**

**حوکمی شەرعی - الحكم الشرعي**

---

[1] - شایەنی باسە گشت ئەوەی لە هەردوو دانەری پێشوو گواستوومەتەوە بە مەبەستی تۆمـاکردن لەو کتێبە نوێیە لە کتێبی تایبـەتی منـە و گشت ئـەو شـتەی هاوکارەکـانم نووسـیویانە دوورم خستۆتەوە لەبەر پاراستنی ئەمانـەتی زانسـتی چـونکە مـن لـەو کەسـانە نـیـم قسـەی یـەکێك بگوازمەوە و بیدەمە پاڵ خۆم.

بەشی سێیەم

سەرچاوەکانی دۆزینەوەی ئەحکامەکانی شەریعەت – المصادر الکاشفة للأحکام الشریعة

بەشی چوارەم

زانستی فیقهی. زانایانی فیقهی. کۆشش. لاسایکردنەوە – الفقه. الفقهاء. الاجتهاد. التقلید

بەشی پێنجەم

فەلسەفەی خواپەرستی لە ئیسلامدا – فلسفة العبادات في الإسلام

بەشی شەشەم

مامەڵە داراییەکان – المعاملات المالیة

بەشی حەوتەم

کاروباری خێزان (باری کەسی) شؤون الأسرة (الأحوال الشخصیة)

بەشی هەشتەم

تاوان و سزاکان – الجرائم و العقوبات

بەشی نۆیەم

ئەو پەیوەندییانەی ملکەچی یاسای گشتی دەبن – العلاقات التي تخضع للقانون العام

بەشی دەیەم

دادگا و ئامرازەکانی سەلماندن – القضاء و وسائل الإثبات

بەشی یانزەهەم

راڤەکردنی چەند نموویەک لە رێسا فیقهییەکانی گشتگیر – شرح نماذج من القواعد الفقهیة الکلیة

# وانەی یەکەم

# شەریعەت

## (الشريعة)

**شەریعەت:**

لە رووی زمانەوانی چەندین واتای هەیە نزیکترینیان لە واتـای زاراوەیـی بریتیـە لـە رێگای راست.

لە رووی زاراوەیی بۆ سێ واتا بـە کاردێـت: واتایـەکی هـەرە تایبـەت، و واتایـەکی تایبەت، و واتایەکی گشتی.

**یەکەم: واتای هەرە تایبەت – المعنى الأخص:**

قورئانی پیرۆز ئەو زاراوەیەی بە دەستەواژەی (شـەریعەت) لـە بەرامبـەر ئـاین لـە شەریعەتەکانی ئاینە ئاسمانییەکان بەکارهێناوە و دەفەرمووێت : ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَـا مِـنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾[1] واتا: بۆ هەریەکێکتان پرۆگرام و بەرنامەمان داناوە.

---

[1] – المائدة/ ٤٨.

له بەرامبەردا دەفەرموێت: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾الشوری/١٣. واتا: ڕێبازی ئاینی بۆ ئێوە داناوە بەو جۆرەی کەوا فەرمان بە نوح کراوە هەر بەو جۆرەی قورئانیشمان بۆ تۆ دابەزاندووە (ئەی محەممەد ﷺ) و بە ئیبراهیم و موسا و عیساشمان ڕاگەیاندووە کە ڕێبازی ئاین بگرن و پەرتەوازە نەبن.

بەپێی ئەوەی پێشوو شەریعەت لە هەر پەیامێکی ئاسمانی بریتیە لە بڕیارەکانی شەریعەت کە لە دەقی ئەو پەیامەدا هاتوون و ئەرکیشی بریتیە لە ڕێکخستنی ژیانی دونیایی مرۆڤ، و ئاین بریتیە لەو بڕیار و حوکمانەی کە گشت کاروبارەکانی پەیوەست بە ژیانی دواڕۆژ ڕێك دەخەن لە باوەڕهێنان بە خودای گەورەوە تا دەگاتە گشت بیروباوەڕەکان و پەنهان و نادیارەکان کەواتە ئاین لە نێوان گشت شەریعەتەکانی ئاسمانی هاوبەشە، بەڵام شەریعەت لە ئومەتێکەوە بۆ ئومەتێکی تر جیاوازە، و قورئانی پیرۆز بریتیە لەو دەستورەی کە گشت دەستورە ئاسمانییەکانی پێشووی هەموارکردووە، و هەر شتێکیش قورئان دانی پێدانا بێت بەشێکە لە شەریعەتی ئێمە.

**دووەم: واتای تایبەت – المعنى الخاص:**

شەریعەت بە واتای تایبەتی بریتیە لە دەقەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ کە گشت بەشەکانی حوکمەکانی شەریعەت لەخۆدەگرێت، هەر وەکو یاسا بریتیە لە دەقە نووسراوەکانی گشت لقەکانی یاسا.

**سێیەم: شەریعەت بە واتا گشتییەکەی – الشريعة بمعناها العام:**

بریتیە لە گشت ئەو حوکمە شەرعیانەی کە سەرچاوەیان بریتیە لە قورئان و فەرموودە و سەرچاوە دەرخستە و روونکەرەوەکان (پاشکۆیی)کانی وەکو (پێوانە – قیاس) و داب و نەریت و هەروەها، و بەو واتایە شەریعەت بریتیە لە فیقهی ئیسلامی هەروەکو زۆر لە توێژەران بەو واتایە بە کاریان هێناوە دوای ئەوەی شەریعەتی ئیسلامی کە سەرچاوەکەی بریتیە لە نیگا (الوحی) لەگەڵ فیقهی ئیسلامی کە بریتیە

له راڤەکردنی شەریعەت بە واتـا تایبەتییەکـەی و بیروڕاکـانی کۆشـش (الاجتهـاد) کـە بەپێی گۆڕانی سەردەم و گەشەکردنی بەرژەوەندییـەکانی مـرۆڤ دەگـۆڕێن و ئەگـەری هەڵە و راستیان هەیە تێکەڵ کران.

## زانستی فیقهی (الفقه):

له رووی زمانەوانی بریتیە لە تێگەیشتن لە شتەکان و زانیـاری هـەبوون لەسـەریان یان بریتیە لە تێگەیشتنی ورد. لە رووی زاراوەیی زانایانی بنەماکانی فیقهی ئیسـلامی (اصـول الفقـه الاسـلامي) و توێـژەران بـەوجۆرە پێناسـەیان کـردووە کـە بریتیـە لـە تێگەیشـتن لـە حوکمـە شـەرعییەکانی فـەرعی[1] کـرداری کـە لـە بەڵگـە درێـژەکان وەردەگیرێن. بە رای ئێمە ئەو پێناسەیە واتای زمانەوانی و زاراوەیی تێکـەڵ کـردووە، چونکە زانستی فیقهی بریتی نییە لە تێگەیشتن لە حوکمەکان بەڵکو بریتیە لە خـودی حوکمـەکان، چـونکە زانسـت و تێگەیشـتن بریتیـە لـە شـێوازی شـتێك لـە عـەقڵ و (بیروهـۆش[2])، و فیقـە لـە دەرەوەی بـیر و هۆشـە جـا مـرۆڤ بیزانێـت یـان نـا و بـۆ کارپێکردنی تێگەیشتن پێویستە، کەواتە زانستی فیقهی لـە حوکمـە سـەپێندراوەکان بریتیە لە واجب[3] و نەدب[4] و حەرام[5] و کەراهە[6] و حەلال[7]، و هەروەها زانسـتی فیقهـی لە حوکمە دانراوەکـان بریتیـە لـە، هۆکاریـیەتی (السـببیة) و مەرجداری (الشـرطیة)و بەربەست (المانعیة)، راست و دروستی و پووچەڵی کە لە مەودوا باسییان دەکەین.

---

[1] – واتا جگە لە لایەنی بیروباوەڕ – اعتقاد.
[2] – البرهان للكلنبوي، للشيخ اسماعيل بن مصطفى، ل١١.
[3] – ئەگەر بیکەی پاداشت وەردەگری و ئەگەر نەیکەی سزا دەدرێت.
[4] – ئەگەر بیکەی پاداشت وەردەگری و ئەگەر نەکەی سزا نادرێیت.
[5] – ئەگەر بیکەی سزا دەدرێت و ئەگەر نەیکەی پاداشت دەکرێیت.
[6] – ئەگەر بیکەی سزا نادرێیت و ئەگەر نەیکەی پاداشت دەکرێیت.
[7] – ئەگەر بیکەی پاداشت ناکرێیت و ئەگەر نەیکەی سزا نادرێیت.

**یاسای دانراو – دەستکرد – القانون الوضعي:**

بریتیە لە کۆمەڵێك ڕێسای گشتی نووسراو و پەیوەندی و ڕەفتارەکانی هەر کۆمەڵگایەك ڕێك دەخەن، و ڕێسای یاسایی ڕێسایەکی پوخت[1] و گشتی[2] و سەپێندراوە هەر کەسێك سەرپێچی بکات سزا دەدرێت.

هەر دەوڵەتێك یاسای تایبەت بە خۆی هەیە، و کۆمەڵێك ڕێسای هاوبەش لە نێوان گشت دەوڵەتان هەن پێیان دەگوترێت یاسای نێودەوڵەتی و پێشتر گوتمان شەریعەت بە واتا تایبەتییەکەی بریتیە لە دەقەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆیە بابەتەکە دەکرێتە دوو باس یەکەمیان تایبەتە بە پێناسەی قورئانی پیرۆز و دووەمیان تایبەتە بە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ.

---

[1] – وات لە کاتی دانانی ئاراستەی چەند کەسێکی دیاریکراو یان چینێکی تایبەتی و ناوەندە سیاسی و کارگێری و کۆمەڵایەتییەکانیان ناکرێت.

[2] – واتا لەسەر گست تاکەکانی کۆمەڵگە پیادە دەکرێت بەبێ جیاوازی یان جیاکردنەوە، تەنها ئەو کەسانۀ نەبێت کە یاسا بە دەقێکی تایبەتی جیای کردونەتەوە.

# باسی یەكەم:
# قورئانی پیرۆز

## القرآن الكريم

ئەو بابەتە دەکرێتە سێ بەش:

- لە یەکەمیان پێناسەی قورئانی پیرۆز دەکەین.
- لە دووەمیان باسی پەیوەندی نێوان شەریعەتی ئیسلامی و فیقهی ئیسلامی دەکەین.
- لە سێیەمیان باسی یاسا و پەیوەندی نێوان یاسا و شەریعەتی ئیسلامی و فیقهی ئیسلامی دەکەین.

# بەشی یەکەم:

# پێناسەی قورئانی پیرۆز

# التعريف بالقرآن الكريم

هەروەکو هەر دەوڵەتێکی جیهان دەستورێکی هەیە کە بنەما گشتییەکان و رێسا گشتگیرەکان لەخۆدەگرێت و ئەو دەستورە رێگە بە دەسەڵاتی یاسادانان دەدات تاکو لە گشت کاروبارەکانی ژیان یاسا دابنێت بەڵام بە مەرجێك ئەو یاسایە یان بەشێك لەو یاسایە لەگەڵ ئەو دەستورە ناکۆك نەبێت، بە هەمان شێوە قورئان بریتیە لە دەستوری ئاسمانی هەمشەیی و چاکترین دەستور بۆ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بە گشتی و شەریعەت و دەستورە ئاسمانییەکانی پێشووی هەموارکردووە و دایکی حوکمەکان لەخۆدەگرێت لەگەڵ باسکردنی چەند شتێکی نوێ کە لە شەریعەتەکانی پێشوو نەبوونە.

قورئانی پیرۆز تەنها باسی بنچینە گشتییەکان و رێسا گشتگیرەکانی کردووە ئەو بنچینە و رێسانەی بەپێی گۆڕانی کات و شوێن و پێشکەوتنی ژیان ناگۆڕێن، و ئەو لایەنە وردەکاری و لاوەکییانەی (الجزئيات)تانەی بە پێی گۆڕانی سەردەم دەگۆڕێن بۆ عەقڵی مرۆڤ بەجێهێشتووە لە چوارچێوەی بازنەی رەوشت، و قورئانی پیرۆز لە زیاتر لە پەنجا ئایەت فەرمانی کردووە بە جوڵاندن و گەڕاندنەوەی لایەنە جوزئییەکان بۆ بڕیارە گشتگیرەکان لە ژێر تیشکی خواست و پێویستییەکانی ژیان، بەجۆرێك کە ئەو جولەیە لە چوارچێوەی بازنەی رەوشت دەرنەچێت.

## بەشەکانی ئەحکامەکانی قورئان – أقسام أحکام القرآن:

ئاشـکرایە ئەحکامـەکانی قورئـانی پـیرۆز سـێ بەشـن و بـریتین لـە ئەحکامـە بیروباوەڕییەکان و ئەحکامە خوڕەوشتییەکان و ئەحکامە کردارییەکان.

بە بۆچوونی ئێمە ئەو دابەشکردنە هەڵەیە چونکە قورئان گشتی بریتیە لە حـوکم، چونکە چیرۆکی نەتەوەکانی پێشوو ئەحکامـە نـەك مێـژوو، و ئایەتـە گەردوونییـەکان ئەحکامن، و قورئانی پیرۆز بە سەر دەروازە و بەشەکان و باسـەکان دابـەش نـەکراوە کە هەر باسێك بابەتێکی دیاریکراو لەخۆبگرێت، بەڵکو هەر لاپەڕەیەکی قورئان بریتیە لە کۆگایەك کەوا گشت پێویستییەکانی ئاینی و دونیایی مرۆڤی تیادایە، و بەپێی ئـەو ڕاستییە ئەحکامەکانی قورئان لە ڕووی سروشتی دەکرێنە پێنج بەش:

١- **ئەحکامە بیروباوەڕییەکان – الأحکام الاعتقادیة**: کە پەیوەستن بە باوەڕهێنان بە خودای گەورە و تەواوی لایەنە بیروباوەڕییەکان، و ئەو جـۆرە ئەحکامـە بـە بنچینەی هەر چوار جۆرەکەی تر دادەنرێت.

٢- **ئەحکامـە خوڕەوشـتییەکان – الاحکـام الخلقیـة**: پەیوەسـتن بـەو شـتانەی پێویستە مرۆڤ لەسەریان بڕوات لە ڕووی خۆڕازاندنەوە بە ڕەوشتە باشـەکان و دووربوون لە ڕەفتارە خراپـەکان، چـونکە نەتـەوە بریتیـە لـە ڕەوشـت ئەگـەر ڕەوشت نەما نەتەوەش نامێنێت.

٣- **ئەحکامەکانی پەند وەرگرتن و ئامۆژگـاری – الاحکـام العبریـة**: بـریتین لـەو ئەحکامانەی لەو ئایەتانە وەردەگیرێن کە باس لـە کاروبارەکـانی نەتـەوەکانی پێشوو دەکەن لە کردەوە چاکە و خراپـەکانیان تـاکو لـە چـاکەکان شـوێنیان بکەوین، و پەند لە چارەنووسی ستەم و دەرەنجـامی کـارە شـەڕانگێزەکانیان وەربگرین، هەر وەکو خودای گەورە فەرموویەتی ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ

لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ﴾[1]. واتا بەڕاستی لە چیرۆك و سەرگوزەشتەی پێغەمبەران پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسانی ژیر.

**٤- ئەحکامە گەردوونییەکان - الاحكام الكونية:** پەیوەستن بە پێویستی بیرکردنەوەی مرۆڤ لەو گەردوونە و گشت بوونەوەرە زیندوو و بێ گیانەکانی دەستەبەرکراو بۆ مرۆڤ لە پێناو هێنانەدی دوو ئامانج:

یەکەم: بە هێزبوونی باوەڕ بە خودا.

دووەم: وەبەرهێنانی خێروبێری زەوی و سوود وەرگرتن لە دۆزینەوە و داهێنانەکانی گەردوون.

خودای گەورە دەربارەی وەربەرهێنانی زەوی فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾[2] واتا: سوێند بە خودا ئێمە لە کتێبی زەبوردا دوای تەورات بڕیارمانداوە کەوا بێگومان چاکەکاران دەبنە خاوەنی زەوی لەو ئایەتە مەبەست لە (صالح) ئەو کەسەیە کە شیاوی ئەوەیە وەبەرهێنان لە زەوی بکات و هەر مرۆڤێك بەشی لەو وەرەبەهێنانە هەیە و پێویستە لە بیری نەکات و پشتگوێی نەخات و هەروەکو خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ﴾[3] واتا: بەشی خۆت لە دونیا لە حەلال بیر نەچێت و چاکە لەگەڵ خەڵکی بکە چۆن خودای گەورە چاکەی لەگەڵ تۆ کردووە.

دەربارەی چوونە ناو بۆشایی ئاسمان فەرموویەتی: ﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانفُذُوا لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ﴾[4] واتا: ئەی کۆمەڵی جنۆکە و مرۆڤەکان ئەگەر دەتوانن لە بەشەکانی ئاسمان و زەوی

---

[1] - يوسف ١١١

[2] - الانبياء ١٠٥.

[3] القصص ٧٧.

[4] - الرحمن ٣٣.

بگەڕێن و دڵنیا بن ناتوانن ئەو کارە بکەن تەنها بە هۆی زانست نەبێت. (السلطان) لەو ئایەتە بریتیە لە زانست و ئەگەر مسولمانان شارەزای ئەحکامە گەردوونییەکان بوونایە ئەو کەشتییەی چۆتە سەر هەسارەی مەریخ کەشتییەکانی ئیسلامی دەبوو نەك ئەمریکی چونکە کاتێك ئەو ئایەتە دابەزی (ئەمریکا لە کێوێتی و حشیەتیدا دەژیا و بە یاسای دارستان حوکمی دەکرد). بەڵام مسولمانان تەنها ٥٪ ئەحکامەکانی قورئان دەزانن، و تەواوی ئەحکامەکانی تر پشتگوێ خراون و فەرامۆشکراون یان لە گۆڕستانەکان لە سەر مردووان دەخوێندرێن، وەکو ئەوەی قورئان بۆ مردووییان هاتبێت نەك بۆ زیندووان.

ئەگەر مسولمانان بە فەرموودەی خودای گەورەیان زانی بایە کە فەرموویەتی: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّهِ وَعَدُوَّكُمْ ....﴾[1] واتا: هەرچی توانات هەیە هێز و کەل و پەلی سەربازی ئامادە بکەن و دوژمنانی خودا و دوژمنانی خۆتان پێ بترسێنن، ئێستا یەك لە سەر سێی دانیشتوانی مسولمانی سەر زەوی نەدەبووە تۆپی یاری بەردەستی وڵاتە گەورەکان بۆ هێنانەدی ئامانجەکانیان، و مەبەست لە (الارهاب) لەو ئایەتە دەستدرێژی و زێدەڕۆیی نییە بۆ سەر مافی کەسانی تر هەر وەکو دوژمنان گومانیان وایە بەڵکو مەبەست لەو وشەیە ترساندن و بەرگریکردنە لە دژی مەترسی دوژمن بە ڕێگاکانی خۆپارێزی کە بریتین لە هێز و ئامادەکردنی ژمارە و کەرەستەی بەرەنگاربوونەوە چونکە ئەگەر دوژمن زانی کە لایەنی بەرامبەر بە قەد ئەو بە هێزە یان لە ئەو بە هێزترە دەستدرێژی ناکاتە سەری بۆ نموونە قەوارەی جولەکە هەڵسوکەوتی لەگەڵ مسولمانان بە تایبەتی لەگەڵ عەرەب هەڵسوکەوتێکی نایاساییە و پێچەوانەی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان و داب و نەریتە نێودەوڵەتییەکانە چونکە خۆی بە هێز دەبینێت و عەرەب و مسولمانانیش بە

---

[1] – الانفال ٦٠.

بێهێز دەبنێت چونکە وەکو ئەو بەهێز نین، و ئەو لاوازییەش لە پشتگوێ خستنی فەرمانی خودای گەورە سەرچاوەی گرتووە ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ...﴾.

٥- **ئەحکامە کردارییەکان – الاحكام العملية:** و پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودای خۆی و پەیوەندی خەڵکی لە نێوان خۆیاندا رێك دەخەن کە بریتین لە حەوت جۆر:

**جۆری یەکەم: ئەحکامەکانی خواپەشتی (الاحكام العبادات)**، کە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودای گەورە رێك دەخەن بە مەبەستی دروستکردنی وزەیەکی روحی کە چاودێری کرێکار لە کارگەکەی و جوتیار لە کێڵگەکەی و مامۆستا لە قوتابخانەکەی و فەرمانبەر لە بارەگای کارەکەی و سەرباز لە گۆڕەپانی جەنگ و دایك لەماڵەکەی و دەسەڵاتدار لە کاتی بەکارهێنانی بەرپرسیارییەتییەکەی بکات و مرۆڤ دەسەڵاتی ئەوەی نییە بیان گۆڕێت یان هەمواریان بکات.

**جۆری دووەم: ئەحکامەکانی خێزان** (الاحكام الاسرية)، و قورئانی پیرۆز بە درێژی باسی ئەحکامەکانی خێزانی کردووە چونکە خێزان بریتیە لە کرۆکی کۆمەڵگە و ئەگەر خێزان باش بوو کۆمەڵگەش باش دەبێت و باشی و چاکە زۆر دەبێت و ئەگەر خێزان خراپ بوو کۆمەڵگەش خراپ دەبێت و بەرەڵایی و خراپەکاری زۆر دەبێت و مەجالی لێکدانەوە و کۆشش (اجتهاد)ی مرۆڤ لە ئەحکامەکانی خێزان کەمە.

**جۆری سێیەم: ئەحکامەکانی مامەڵە داراییەکان** (الاحكام المعاملات المالية)، و قورئانی پیرۆز باسی گرنگترین ئەحکام و رەگەزەکانی دارایی کردووە کە بە پێی گۆڕانی کات و شوێن ناگۆڕێن وەکو رەزامەندی و جێبەجێکردنی گرێبەست و بەجێگەیاندنی سپاردەکان و هەروەها تەواوی لایەنەکانی تری دارایی بۆ عەقڵی مرۆڤ بەجێهێشتووە تاکو لە ژێر تیشکی پێویستییەکانی ژیان دیارییان بکات بە مەرجێك لە چوارچێوەی بازنەی خورەوشت دەرنەچێت.

**جۆری چوارەم: ئەحکامە داراییە گشتییەکان (الاحكام المالية العامة)**، و قورئـانی پیرۆز تەنها باسی هەندێك دەرامەت و بەرهەم و خەرجی دارایی گشتی کردووە و وردەکارییەکانی بۆ عەقڵی مرۆڤ بەجێهێشتووە.

**جۆری پێنجەم: ئەحکامە دەستوورییەکان (الاحكـام الدسـتورية)**، قورئـانی پـیرۆز تەنها باسی کۆڵەگە بنچینەییەکانی هەر سیسـتەمێکی دەسـتوری کـردووە کـە بریتین لـە کـارکردن بـە بنـەمای راوێـژکردن و بیروراگۆڕینـەوە و رەچـاوکردنی دادپــەروەری لــە هێنانــەدی یەکســانی لــە مــافی و ئەرکــەکان و رێزگــرتن لــەو سیسـتەمەی کـە قورئـان بـە گوێڕایـەلیکردنی فـەرمانڕەوا نـاوی بـردووە واتـا گوێڕایـەڵیکردنی ئـەو سیسـتەمەی فـەرمانڕەوا نوێنەرایـەتی دەکـات، خـودای گەورە فەرموویەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُـواْ أَطِيعُـواْ اللّـهَ وَأَطِيعُـواْ الرَّسُـولَ وَأُوْلِـي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾[1] واتـا: ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە گوێڕایــەڵی خــودا و پێغەمبــەر و فــەرمانڕەوای لــەخۆتان بــن و ئەگــەر لــە مەسەلەیەکدا ناکۆکیتان هەبوو بگەڕێنەوە بۆ لای خودا و پێغەمبـەر ﷺ ئەگـەر ئێوە باوەڕتان بە خودا و رۆژی دوایی هەیە ئەوە باشترین رێگایە بۆ چارەسەی کێشەکانتان. گوێڕایەڵیکردنی خودای گەورە بریتیە بەجێگەیاندنی فەرمانەکانی خـودا و خۆپاراسـتن لـە قەدەغـەکراوەکانی، و گوێڕایـەڵیکردنی پێغەمبـەر ﷺ بریتیە لە کارکردن بەپێی وتە و کـردەوە و هەڵوێسـتەکانی وەکـو پێغەمبـەر و راگەیەنەری نیگای خودای گەورە نەکو وەکو مرۆڤێکی ئاسایی.

**جۆری شەشەم: ئەحکامەکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییـەکان (الاحكـام العلاقـات الدولية)**، قورئـانی پـیرۆز پەیوەنـدی نێـوان میللـەتان و نەتـەوەکانی لـە سـەر شەش بنچینە دامەزراندووە:

---

[1] — النساء ٥٩.

**بنچینەی یەکەم: یەکبوونی رەچەڵەك** خودای گەورە فەرموویەتی ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ الحجرات/١٣. واتا: ئەی خەڵکینە ئێوەمان لە پیاو و ئافرەت دروستکردووە و بۆ ئەوە ئێوەمان کردۆتە چەند هۆز و تیرە و نەتەوە تاکو یەکتری بناسن و بەرێزترین کەستان لەلای خودا بە سوود ترین و چاکەکارترین کەستانە و خودای گەورە زانا و لێزانە.

کەواتە خێزانی مرۆڤایەتی برا و خوشکن و رەوشتی برایەتیش بریتیە لە یەکتر تەواوکردن و پشتی یەکترگرتن و هاوکاری یەکترکردن و هاوبەشی یەکتر بوون.

**بنچینەی دووەم:** یوکبوونی کانزا و گشت مرۆڤێك لە یەك کانزا دروستکراوە کە بریتیە لە خۆڵ (گڵ) چونکە لە دوو رەگەز پێك دێت ناوی پیاو و هێلکۆکەی ئافرەت و هەردووکیان لە چەند ماددەیەکی خواردەمەنی پێك دێن کە پێك هاتەکەیان خۆڵە کەواتە مرۆڤ بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە خۆڵ دروستکراوە هەروەکو باوکمان ئادەم (عیلە سلام) بە شێوەیەکی راستەوخۆ لە خۆڵ دروستکراوە و خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ﴾ الروم/٢٠ واتا: یەکێك لە نیشانە و بەڵگەکانی گەورەی خودا ئەوەیە کەوا ئێوەی لە خۆل دروست کردووە و دواتر بە زەویدا بڵاوبوونەتەوە، و پێغەمبەری ﷺ جەختی لە سەر ئەو دوو بنچینەیە کردووە کە فەرموویەتی: (كلكم من آدم و آدم من تراب) واتا: هەمووتان لە ئادەمن و ئادەمیش لە خۆڵە.

**بنچینەی سێیەم:** یەکبوونی دروستکەر: کە بریتیە لە خودای تاك و تەنها و بێ هاوبەش کەواتە هەندێك مرۆڤ دروستکەرێك و هەندێکی تریش دروستکەرێکی تر دروستی نەکردوون تاکو بواری خۆ بەچاکتر زانین هەبێت، خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾البقرة/٢١. واتا، ئەی خەڵکینە ئەو پەروەردیگارەتان بپەرستن کە ئێوە و

ئەوانەی پێش ئێوەشی دروستکردووە بە ئومێدی ئەوەی خۆتان لە بێ فەرمانی خودا بپارێزن.

**بنچینەی چوارەم:** یەکبوونی بەرژەوەندییەکان، خوادی گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ الأنبياء/١٠٧ واتا: ئەی محمد ﷺ ئێمە تەنها تۆمان وەکو سوود و رەحمەت بۆ جیهان ناردووە. رەحمەت لەو ئایەتە بریتیە لە بەرژەوەندی باش (سوودی بە دەست هێنراو) و خراپ (زیانی دوورخراوە) یەکسانە بەرژەوەندییەکە ماددی بێت یان مەعنەوی و دونیایی بێت یان دوارۆژی.

**بنچینەی پێنجەم:** یەکسان بوون لە وەبەرهێنانی پیت و بەرەکەتی زەوی و سوود لێ وەرگرتنیان بەبێ جیاوازی لە نێوان بەهێز و بێ هێز و مرۆڤی چاك ئەو کەسەیە کە خێروبێری زەوی بەرهەم دەهێنێت هەروەکو خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾الأنبياء/١٠٥ واتا: بە ڕاستی ئێمە لە زەبووردا دوای تەورات بڕیارمان داوە کە بەندە چاکەکارەکان دەبنە خاوەنی زەوی. هەرچی لە ناو زەوی و دەرەوەی زەوی دایە مرۆڤ دەتوانێت لە ژیانی هاویەشی سوودیان لێ وەربگرێت و بۆ گشت کەسێك حەلالن بەبێ جیاوازی یان جیاکاری هەروەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً...﴾ البقرة/ ٢٩ واتا: خودای گەورە ئەو زاتەیە کە گشت شتێکی ناو زەوی بۆ ئێوە دروستکردووە.

**بنچینەی شەشەم:** یەکبوونی چارەنووس، لە رووی ژیان و مردن و لێپێچینەوە و پاداشتی چاکە و سزای خراپە و خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا الْمَصِيرُ﴾ق/٤٣ واتا: ئێمە دەژیێنین و دەمرێنین و چارەنووس بۆ لای ئێمەیە، و دەفەرموێت: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ﴾الزلزال/٧و٨. واتا: هەر کەسێك بە قەدە دەنکە گەردیلەیەك چاکەی هەبێت دەبینێت و ئەوەشی بە قەد دەنکە گەردیلەیەك خراپەی هەبێت دەبینێت.

ئەو شەش بنچینەیە بەڵگەی بنبڕن لە سەر ئەوەی کە ئیسلام لە بنەڕەتدا بریتیە لە ئاشتی و شەڕکردن تەنها بۆ بەرگریکردنە و ئیسلام ئاینی تیرۆر و تۆقاندن نییە هەروەکو دوژمنان گومانیان وایە.

**جۆری حەوتەم:** تاوان و سزاکان: قورئانی پیرۆز ئاماژەی بەو تاوانانە کردووە کەوا سزایان دیاریکراوە (جرائم الحدود) [1] و هەروەها ئاماژەی بە تاوانەکانی چەشن بە چەشن (القصاص[2]) و خوێنبایی (الدية[3]) و سزای ئەو تاوانانەی دیاریکردووە لە بەر مەترسی ئەو تاوانانە لە سەر کۆمەڵگە و، دەسەڵاتی داهێنانی تاوان و سزاکانی داوە بە دەسەڵاتی یاسادانانی کاتی بەپێی خواستەکانی ژیان و ئەو تاوانانەش پێیان دەگوترێت تاوان و سزاکانی تەمبێکردن (التعزيرية[4]).

لەو روونکردنەوە کورتە بۆمان دەردەکەوێت کە کەمکردنەوەی خوێندنی شەریعەتی ئیسلامی لە یاسای تایبەتی لە زانکۆکانی عیراقی هەڵەیەکی ئاشکرایە و خودای گەورە لێپێچینەوەیەکی توند لەگەڵ بەرپرسەکانی ئەو زانکۆیانە و بە تایبەتی بەرپرسەکانی کۆلێژەکانی یاسا دەکات لەسەر پشتگوێ خستنی خوێندنی ڕێسا گشتییەکانی شەریعەتی ئیسلامی و وردەکارییەکانی فیقهی ئیسلامی کەوا گشت لقەکانی یاسای دانراو (دەستکرد) لەخۆدەگرێت لەگەڵ لایەنی زیاتر کە بریتیە لە رێکخستنی پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ پەروەردیگاری لە خواپەرستەنەکان (العبادات).

---

[1] – واتا: سزاکەیان بە دەقی قورئان دیاریکراوە و کەم و زیادی تیادا نییە.

[2] – واتا: چۆنی کردووە وای لەگەڵ بکرێتەوە.

[3] – قەرەبووکردنەوە لە جیاتی تاوان.

[4] – ئەو تاوانانەی سزایان دیاری نەکراوە.

# بەشی دووەم:
# فیقهی ئیسلامی و پەیوەندی بە شەریعەتی ئیسلامییەوە
# الفقه الإسلامي و صلته بالشريعة

هەروەك باسمانكرد فیقهی ئیسلامی بریتیە لە ئەحكامە شرعییەكانی كرداری لاوەكی وەرگیراو لە بەڵگە دریژەكان[1]، لە رووی سەرچاوە سێ جۆرن:

١- فیقهی قورئان: بریتیە لەو فیقهەی بە شێوەیەكی راستەوخۆ لە ئایەتەكانی قورئان وەرگیراوە.

٢- فیقهی فەرموودە (فقه السنة): بریتیە لەو فیقهەی راستەوخۆ لە فەرموودەكانی پێغەمبەرﷺ وەرگیراون.

٣- فیقهی لێكدانەوە و كۆشش (فقه الإجتهاد): بریتیە لەو فیقهەی بە شێوەیەكی ناراستەوخۆ واتا لە ڕێگەی سەرچاوەكانی دۆزینەوە (المصادر الكاشفة) لە قورئان فەرموودە وەرگیراون و پێیان دەگوترێت سەرچاوە پاشكۆییەكان (المصادر التبعية) وەكو كۆدەنگی زانایان (الاجماع[2]) و پێوانە (القياس[3]) و داب و نەریت (العرف) و بەرژەوەندی (المصلحة) و تەواوی سەرچاوەكانی دۆزینەوەی حوكمەكان كە لەمەودوا

---

[1] - لە (اصول الفقه) باسكراوە.

[2] - الاجماع: واتا: ڕێككەوتنی زانایانی مللەتی ئیسلامی لە سەردەمێك، لەسەر حوكمێكی شەرعی، و لە دوای كۆچی دوای پێغەمبەر(ﷺ).

[3] - بڕیاردان لەسەر مەسەلەیەك كە دەقی لەسەر نەبێت بە هەمان شێوەی بڕیاری ئەو مەلەسەیەی كە دەقی لەسەرە، لەبەر هاوبەشی هەردووكیان لە هۆكاری حوكم.

باسییان دەکەین[١] یان بریتیە لەو فیقهەی کە لەو دەقانە وەردەگیرێت کە بەشێوەی گومانی[٢] حوکمەکان دەگەیەنن و ئەو سەرچاوانە بە شێوەی مەجازی واتا ناراستەقینە پێیان دەگوترێت سەرچاوەکانی فیقهی ئیسلامی چونکە ئەو سەرچاوانە چەند رێگایەکن بۆ گەرانەوەی جوزئییەکان بۆ گشتگیرەکانی شەریعەت، کەواتە سەرچاوەی روونکەرەوەی حوکمەکانن نەك دروستکردنی حوکمەکان، و بیروڕای جیاواز دەربارەی بە بەلگەدانانی ئەو سەرچاوانە جیاوازییەکی زارەکییە[٣] لەلایەن کەسانی خاوەن عەقلی تەواو.

## پەیوەندی نێوان شەریعەت و فیقهی ئیسلامی بەپێی هاتنەدی – النسبة بین الشریعة و الفقه بحسب التحقق:

١– پەیوەندی نێوان شەریعەت و فیقهی قورئان و فەرموودە بەپێی هاتنەدی پەیوەندییەکی گشتی و تایبەتی رەهایە ئەگەر زانستی فیقهی واتای بنبڕ بگەیەنێت[٤]. کەواتە هەر کاتێك ئەو فیقهە هاتەدی شەریعەتیش دەهێتەدی چونکە پەیوەست و تایبەتە بە شەریعەت و بەبێ پەیوەستەکەی ناهێتەدی.

بەلام هەندێك جار شەریعەت جگە لە ئەحکامە کردارییەکان لەخۆدەگرێت لەکاتێکا فیقه لەو ئەحکامانە نییە وەکو ئەحکامە بیروباوەڕییەکان.

---

[١] – وەکو وتەی یاوەران (قول صحابي) داخستنی هۆکارەکان (سد الذرائع)، بەچاکزانین (الاستحسان)، و بەردەوامی حوکمی یەکەم (الاستصحاب)

[٢] – لە (اصولی فیقه)ە.

[٣] – چونکە لە رووی سەرچاوەی داهێنانی حوکمەکان بەلگە نییە بەلکو لە رووی سەرچاوەی روونکرەوە بەلگەیە.

[٤] – وەکو نیوەی میراتی ئافرەتی مردوو بۆ مێردەکەی ئەگەر نە لەو مێردە و نە لە مێردێکی تر مندالی نەبێت هەروەکو خودای گەورە فەرمویوویەتی (وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ) النساء/١٢.

٢- پەیوەندی نێوان شەریعەت و فیقهی لێکدانەوە (فیقه الاجتهادي) لە ڕووێکەوە گشتی و تایبەتییە و ئەگەر هاتوو ئەو حوکمە ئیجتهادییەی کە موجتەهید پێی گەیشتووە حوکمی خودای گەورە بێت واتا حوکمێکی ڕاست بێت لەو حالەتە شەریعەت و فیقهی ئیجتیهادی بە یەکتری دەگەن و جگە لە ئەحکامە کردارییەکان شەریعەت بەبێ فیقهی ئیجتیهادی بوونی هەیە وەکو ئەحکامە بیروباوەڕی و گەردوونییەکان و ئەحکامەکانی پەند وەرگرتن.

ئەگەر حوکمی ڕوونکەرەوە حوکمی خودای گەورە نەبێت واتا موجتەهید هەڵە بێت فیقهی ئیجتیهادی بەبێ شەریعەت دەهێتەدی.

ئاشکرایە هەر موجتەهیدێك لە هەر پلەیەکی زانستی بێت لە ڕوونکردنەوە و دەرخستنی حوکمی خودای گەورە چۆن ڕاست دەکات و بە هەمان شێوە هەندێك جاریش هەڵە دەکات بەپێی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ (إذا حكم الحاكم فأجتهد ثم أصاب فله أجران فإذا حكم و اجتهد و اخطأ فله أجر[1]) واتا: ئەگەر دادوەر دادوەری کرد و لێکدانەوەی کرد و ڕاستی کرد دوو پاداشتی هەیە و ئەگەر دادوەری کرد و لێکدانەوەی کرد و هەڵەی کرد یەك پاداشتی هەیە.

لێرەدا مەبەست لە حاکم (دادوەر) موجتەهیدە واتا ئەگەر موجتەهید ویستی حوکم بکات و لێکدانەوەی کرد ئەگەر ڕاستی کرد دوو پاداشتی هەیە یەکێکیان لەسەر ڕاستکردنی لە حوکمی خودای گەورە و دوومیان لەسەر هەوڵدانی، بەڵام ئەگەر هەڵەی کرد یەك پاداشتی هەیە ئەویش لەسەر هەوڵدانی بە نیاز پاکی.

### هاوسەنگی لە نێوان شەریعەتی ئیسلامی و فیقهی ئیجتهادی

سەرەڕای پەیوەندییان بە یەکترەوە لە چەندین شتی تری سەرەکی جیاوازن گرنگترینیان بریتین لەوانەی خوارەوە:

---

[1] - البخاری بشرح فتح الباري، كتاب الاعتصام بالسنة ١٣/٣٩٣.

١– شەریعەت بە شێوەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ سەرچاوەی فیقهی ئیجتیهادییە.

٢– شەریعەت لە ڕووی دەقەکانی هەمیشەییە بەجۆرێك کە قابیلی گۆڕین و هەموارکردن و هەڵوەشانەوە نییە بەڵام دەکرێت فیقهی ئیجتیهادی بەپێی خواست و پێویستییەکانی ژیان بگۆڕدرێت یان هەموار بکرێت یان هەڵبوەشێندرێتەوە، کەواتە فیقهی ئیجتیهادی وەکو یاسایە هەروەکو ئەو ڕێسایەی دەڵێت: (گۆڕانی ئەحکامەکان بەپێی گۆڕانی کات و سەردەم نکوڵی لێ ناکرێت[1]) واتا: ئەحکامە ئیجتهادییەکان.

٣– پێویستە گشت مرۆڤێك باوەڕ بە شەریعەت بهێنێت و کاری پێ بکات بە پێچەوانەی فیقهی ئیجتیهادی، کە باوەڕ پێهێنان و کارپێکردنی نە لە سەر موجتەهید و نە لە سەر موقەلید[2] پێویست نییە ئەگەر دادوەر فەرمانی نەکرد بێت بە کارپێکردنی چونکە ئەگەری ڕاست و هەڵەی هەیە، و یەکێك لە هەڵە بەربڵاوەکان لە جیهانی ئیسلامی بریتیە لە شوێنکەوتنی مەزهەبێکی دیاریکراو بە درێژایی ژیان لە گشت شتێك چونکە لە سەدەی یەکەمی ئیسلام هیچ مەزهەبێك نەبوو کە مسولمان لە گشت مەسەلەکان پێیەوە پابەند بێت.

چونکە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿... فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ الأنبياء/٧ واتا: پرسیار لە کەسانی خاوەن زانست بکەن ئەگەر ئێوە نەزانن.

٤– گشت ئەحکامەکانی شەریعەت ڕاستن چونکە بریتین لە نیگا و نیگاش قابیلی هەڵە نییە بە پێچەوانەی فیقهی ئیجتیهادی چونکە لە ڕێگەی لێکدانەوە (الاجتهاد) دروست بووە و گشت موجتەهیدێك جۆن ڕاست دەکات و بە هەمان شێوە هەڵەش دەکات.

---

[1] – مادەی ٣٩ گۆڤاری ئەحکامە دادییەکان.

[2] – واتا: شوێنکەوتەی موجتەهید.

# بەشی سێیەم:
# یاسا و پەیوەندی بە
# شەریعەت و فیقهی ئیسلامییەوە
# القانون و صلته بالشريعة و الفقه الاسلامي

## یەکەم: پەیوەندی نێوان شەریعەت و ڕێسای یاسایی.

لە چەند ڕوویێکەوە وەك یەکن و چەند ڕوویێکی تریشەوە جیاوازن:

**أ- لایەنە هاوشێوەکان:**

١- ئامانجی هەردووکیان بریتیە لە بەرژەوەندی مرۆڤ لە ڕێگەی ڕێکخستنی ژیانی مرۆڤ.

٢- هەردووکیان پوخت و گشتین.

٣- کارکردن بە هەردووکیان پێویستە.

٤- هەردووکیان سزایان لە گەڵدایە بۆ ئەو کەسەی سەرپێچییان بکات.

٥- لە وردەکاری و جوزئییەکان لە زۆر لە پیادەکردنەکان بە یەکتری دەگەن.

٦- بە شێوەیەکی جیاواز لە وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان شەریعەت سەرچاوەی یاسایە.

٧- لە وڵاتە نائیسلامییەکان زۆر لە ئەحکامە یاساییەکان لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامی ناکوك نین.

**ب- لایەنە جیاوازەکان:**

لە زۆر لە شتە سەرەکییەکان جیاوازن گرنگترینیان بریتین لەوانەی خوارەوە:

١- سەرچاوەی دەقی ڕێسای شەریعەت بریتیە لە نیگا (الوحي) و سەرچاوەی ڕێسای یاسایی بریتیە لە عەقڵ و لێکدانەوەی مرۆڤ.

٢- دەقی ڕێسای شەریعەت قابیلی گۆڕان و هەموارکردن و هەڵوەشانەوە نییە بە پێچەوانەی ڕێسای یاسایی کە بەپێی گۆڕانی بەرژەوەندی و پێشکەوتن و خواستەکانی ژیان دەگۆڕدرێت و هەڵدەوەشێتەوە و هەموار دەکرێت یەکسانە ڕێسای دەقی بێت یان ئیجتهادی.

٣- گشتگیری ڕێسای شەریعەت زۆر فراوانترە لە گشتگیری ڕێسای یاسایی چونکە یەکەم جار ڕوو لە تێکڕای مرۆڤ دەکات، و دەفەرموێت: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا﴾الفرقان/١. واتا: بەرز و بێگەردی بۆ خوادی گەورە کە قورئانی جیاکەرەوەی ڕاست و ناڕاستی بە سەر بەندەی خۆی محمد ﷺ دابەزاندووە تاکو ببێتە ئاگادارکەرەوە بۆ گشت خەڵکی جیهان. دووەمیان ڕوو لە کۆمەڵە خەڵکێکی ناو هەرێمی دیاریکراو لە دەوڵەتێکی دیاریکراوی خاوەن فەرمانڕەوایەتی دەکات و تەنها لە چەند حاڵەتی جیاکەرەوە نەبێت لە سەر ئەو کەسە پیادە ناکرێت کە لە دەرەوەی ئەو هەرێمە بێت.

٤- ڕێسای شەریعەت چۆن سزای لەگەڵ دایە بە هەمان شێوە پاداشتیشی لەگەڵ دایە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ، وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾ الزلزلة/ ٧و٨. واتا: هەر کەسێك بە قەد دەنکە گەردیلەیەك چاکەی هەبێت دەیبینێت و هەر کەسێك بە قەد دەنکە گەردیلەیەك خراپەی هەبێت دەیبینێت. لە کاتێکا ڕێسای

یاسایی بە زۆری سزای لەگەڵدایە چونکە ئەو مرۆڤەی لە ژیانیدا تاوانی ئەنجام نەداوە پاداشت ناکرێت.

٥- سزای ڕێسای شەریعەت دونیایی و دواڕۆژییە لە کاتێکا سزای ڕێسای یاسایی تەنها دونیاییە و لەسەر سەلماندنی تاوان لە بەردەم دادوەر دەوەستێت ئەگەرنا بڕیار دەدرێت بەبێ تاوانی تۆمەتبار چونکە تۆمەتبار بێ تاوانە تاکو دەسەلمێندێت تاوانبارە.

٦- ڕێسای یاسایی تەنها بڕیار لەسەر لایەنی ئاشکرا و بەرچاو دەدات و ناچێتە ناو ناخی دڵەکان و ئەوەی لە ناو دەروونی مرۆڤ دایە یاسا باسی ناکات، ئەگەر دەرنەکەوت بێت، لە کاتێکا ڕێسای شەریعەت چۆن بڕیار لە لایەنی بەرچاو دەدات بە هەمان شێوە بڕیار لە لایەنی شاراوەش دەدات خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ﴾ البقرة/٢٨٤. واتا: ئەگەر ئەوەی لە دەروونتان دایە دەری بخەن یان بیشارنەوە خودای گەورە لە سەری لێتان دەپرسێتەوە. چونکە ئیسلام داوا لە مرۆڤ دەکات کەوا ڕواڵەتی هاوشێوەی ناو دەروونی بێت.

ئەوەی دەڵێت ئەو ئایەتە بە ئایەتی ﴿لا يكلف الله نفسا الا وسعها﴾ واتا: هەر کەسێك تەنها ئەوەی بەسەردا دەسەپێندرێت کە لە توانای دایە، سڕاوەتەوە (نەسخ بۆتەوە) هەڵەیەکی گەورەیە.

**دووەم: پەیوەندی نێوان فیقهی ئیسلامی ئیجتهادی و یاسا - الصلة بين الفقه الإسلامي الإجتهادي و القانون:**

لە چەند رووێکەوە وەك یەکن و لە چەند رووێکی تریشەوە جیاوازن:

**لایەنە جیاوازەکان:**

لە چەند شتێکەوە جیاوازن گرنگترینیان:

١- فیقهی ئیسلامی خاوەنی سروشتێکی سەربەخۆیە و هیچ یاسایەك کاری تێدا ناکات و لە هیچ یاسایەك وەرنەگیراوە، و ئەو کەسەی گومانی وایە یاسای رۆمانی کاریگەری لە سەر فیقهی ئیسلامی هەبووە هەڵەیکردووە چونکە لە رووی شوێن و کات و سەردەم و زمان هیچ پەیوەندییەك لە نێوان پێشەوایانی مەزهەبە فیقهییەکان و یاسای رۆمانی نییە و تەنها دەبینین لە چەند رێسا و ئەحکام هاوشێوەن و ئەو رێسا و ئەحکامانەش لە ئیجتیهادی عەقڵی سەرچاوەیان گرتووە و عەقڵی گشت خەڵکیش لە زۆر شت لە یەکتری نزیکن.

٢- سەرچاوەکانی فیقهی ئیسلامی جیاوازن لەگەڵ سەرچاوەکانی یاسا، چونکە سەرچاوە بنەڕەتییەکانی فیقهی ئیسلامی بریتین لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرﷺ و سەرچاوە پاشکۆییەکان وەکو قیاس و مەصلەحە و ئیستحسان، ئیستصحاب[1] و سد الذرائع[2]، و جگە لەوانە.

٣- لە فیقهی ئیسلامی هەر کەسێك کاری دەرهێنانی ئەحکامەکان بگرێتە ئەستۆ پێویستە مەرجەکانی ئیجتیهادی تێدا بێت بە پێچەوانەی یاسا چونکە زۆربەی ئەو کەسانەی بەشداری دەکەن لە ئامادەکردنی پرۆژە یاسا لەو کەسانە نیین کە شیاوی ئیجتیهادن بە واتای زاراوەیی.

---

[1] - الاستصحاب: واتا، مانەوەی شتێك وەکو خۆ ئەگەر شتێك نەبێت لەسەر گۆڕانی.

[2] - سد الذرائع: واتا، داخستنی ئەو رێگایەی بەرەو خراپە سەر دەکێشێت.

٤- ئەحكامەكانی فیقهی ئیسلامی چۆن پەیوەندی نێوان مرۆڤەكان رێك دەخەن بە هەمان شێوە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و پەروەردیگاریش رێك دەخەن بە پێچەوانەی ئەحكامەكانی یاسا.
٥- ئەحكامەكانی فیقهی ئیسلامی پڕیانە لە ئەخلاق و خۆڕەوشت چونكە سەرچاوەی سەرەكییان بریتیە لە شەریعەتی ئیسلامی بە پێچەوانەی ئەحكامەكانی یاسا.

**لایەنە هاوشێوەكان:**

لە چەند رووێكەوە پەیوەندییان بە یەكەوە هەیە گرنگترینیان:
١- هەر یەك لە فیقهی ئیسلامی ئیجتهادی و یاسا ئەگەری ئەوەیان هەیە كەم و كوڕیان تیادا بێت چونكە بە پێی عەقڵی مرۆڤ دانراون و عەقڵی مرۆڤیش شارەزایی لە سەر گشت رووداوەكانی داهاتوو نییە.
٢- هەردووكیان هەندێك جار هەڵەیان تیادا دەبێت چونكە موجتەهید چۆن راست دەكات بە هەمان شێوە هەڵەش دەكات، و پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (إذا حكم الحاكم فأجتهد ثم أصاب فله أجران فإذا حكم و اجتهد و اخطأ فله أجر) واتا یەك پاداشتی هەیە لە سەر هەوڵدانی.
٣- هەردووكیان قابیلی گۆڕین و هەمواركردنن بەپێی پێویستی و پێشكەوتنی ژیان ئەگەر حوكمەكە بە كۆدەنگی - ئیجماعی - گشت موجتەهیدەكان نەبێت، و تەنانەت لەو حاڵەتەش ئەگەر بەڵگەی ئیجماع بەرژەوەندی بێت و گۆڕا بێت بە ئیجماعێكی تر دەگۆڕێت كە لەگەڵ بەرژەوەندییەكی نوێ بگونجێت بەپێی رێسای گۆڕانی ئیجماع بە پێی گۆڕانی سەردەم.
٤- هەردووكیان ئامانجیان بەرژەوەندی مرۆڤە كە بریتیە لە سوود گەیاندن بە مرۆڤ و دوورخستنەوەی زیان لە مرۆڤ.

٥- فیقهی ئیسلامی سەرچاوەی سەرەکی ئەو یاسایانەیە کە بە ڕێژەی ١٠٠٪ - ٥٠٪ بە فیقهی ناوبراو کاریگرن.

هەندێك لە یاساکانی وڵاتە ئیسلامییەکان بە ڕێژەی ١٠٠٪[1] لە فیقهی ئیسلامی وەرگیراون و یاساکانی باری کەسی گشت وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان ١٠٠٪ لە فیقهی ئیسلامی وەرگیراون و یاساکانی شارستانی ئەو وڵاتانە بە ڕێژەی ٩٠٪ سەرچاوەیان بریتیە لە فیقهی ئیسلامی وەکو یاسای شارستانی عیراقی و ئوردنی و کوێتی[2] و یاسای شارستانی میسری سەرەڕای کاریگەر بوونی بە فیقهی فەرەنسی زۆری لە فیقهی ئیسلامی وەرگیراوە بە شاهێدی زانایانی یاسا لە کۆماری میسری عەرەبی[3]، و لە ڕێگەی ئەو یاسایە چووەتە ناو ئەو یاسا عەرەبییان بە یاسای میسری کاریگەرن، و ئەو حوکمانەی لە یاسای شارستانی میسری و یاساکانی کاریگەر بەو یاسایە لە فیقهی ئیسلامی وەرگیراون بریتین لە: تیۆری تاکڕەوی لە بەکارهێنانی ماف، و تیۆری گواستنەوەی قەرز، و تیۆری باروبۆخە لە ناکاوەکان، و زۆربەی ئەحکامەکانی کڕین و دیاری و گرێبەستی بە کرێگرتن و ئەرکەکانی دراوسێیەتی، و دیواری هاوبەش، و ئەحکامەکانی هاوتەنیشتی (الشفعة) و جگە لەوانە.

---

[1] - هەروەکو یاساکانی یەمەنی.

[2] - لە سەرەتای یاسای شارستانی کوێتی ژمارە ٦٧ی ساڵی ١٩٨٠ هاتووە، (ئەو بەرزی و پێگەیەی لە یاسای شارستانی ئێمە دیارە ئەو ئەحکامەنەیە کە بە تەواوەتی لەگەڵ ئەحکامەکانی فیقهی ئیسلامی گونجاون لەگەڵ جیاوازی مەزهەبەکان تاکو حوکمێکی تیادانە بێت کە لە یەکێك لە مەزهەبە ئیسلامییەکان وەرگیرا بێت یان لەگەڵ روحی شەریعەتی ئیسلامی پیرۆز ناکۆك بێت).

[3] - لەوانە راوێژکار علی منصور سەرۆکی پێشووی دادگای تێهەڵچوونەوە لە کتێبەکەی (شەریعەتی ئیسلامی و یاسای نێودەوڵەتی گشتی) ،چ١٩٦٥، و پرۆفیسۆر احمد موافی راوێژکاری دادگای پێداچوونەوە لە کتێبەکەی فیقهی تاوانی بەراووردکردن لە نێوان شەریعەت و یاسا، چ١٩٦٥ و راوێژکار عبدالستار ئادەم لە کتێبەکەی (شەریعەتی ئیسلامی و یاسای شارستانی میسری، چ١٩٦٦).

هـەروەها یاسـا سـزاییەکانی عـەرەبی لـە زۆر لـە تاوانـەکانی تـەمبێکردن – ڕووشکێنکردن – (التعزير) لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامی و فیقهی ئیسـلامی دەگـونجێن چونکە تاوانی تەمبێکردن بریتیە لە هەر تاوانێك کە داهێنان و دیاریکردنی سزاکەی بۆ دەسەڵاتی یاسادانانی سەردەم بەجێهێڵدرا بێت و ئەو تاوانانە دەکرێنە سێ جۆر:

**جۆری یەکەم:** هەر تاوانێکی حەد بۆ دانراو واتا: سـزاکەی بـە دەق دیـاری کـرا بێت، ئەگەر گومانی تیادا بوو بە شێوەیەکی سروشـتی دەبێتـە تـاوانی تـەمبێکردن و ملکەچی یاسای سزاکان دەبێت وەکو دزیکردن لە نێوان باوان و نەوەکان یان لە نێوان ژن و مێرد، یان لە نێوان دوو کەسی هاوبەش، و وەکو تاوانی زینا کە بە چوار شـاهێد یان بە دانپیانانی تاوانبار نەسەلمێندرا بێت و دادوەر بە هۆی بەڵگە یـان ئامرازەکـانی زانسـتی سـەردەم بـاوەڕی وابێـت تاوانەکـە ڕوویـداوە لـەو حالەتـە سـزای دیـاریکراو نامێنێت و دەبێتە سزای تەمبێکردن کە بە یاسای سزاکان دیاری دەکرێت.

**جۆری دووەم:** هەر تاوانێك لە دەقی شەریعەتی ئیسلامی بە تاوان دانرابێـت بـەڵام سزای دیاری نەکرا بێت بە تاوانی تـەمبێکردن دادەنرێـت و ملکەچـی یاسـای سـزاکان دەبێت وەکو تاوانی زەوتکردن، و دەست پیسـی، و سـاختە و بـەرتیل و سـیخوڕی و هتد، کە لە دەقی شەریعەت بە تاوان دانراون بەڵام سزای بۆ دیاری نەکردوون.

**جۆری سێیەم:** فەرمانڕەوا (سـەرۆکی دەوڵـەت) بـۆی هەیـە بـە هاوکـاری لەگـەڵ ئەهلی ڕاوێژ هەر کردەوەیەك زیان بە بەرژەوەندی گشتی بگەیەنێت بە تاوانی دابنێـت و سزای بە دەقێـك بـۆ دیـاری بکـات بـە مـەرجێك سـزاکە لەگـەڵ قـەبارە و مەترسـی تاوانەکە بگونجێت.

بەوپێیە گشت تاوانەکانی تـەمبێکردن لـە شـەریعەتی ئیسـلامی ملکەچـی یاسـای سزاکان دەبن ئەگەر یاساکە لەگـەڵ ڕێسـای شـەریعەتی قورئـان و فـەرموودە نـاکۆك نـەبێت، و هـەروەها یاسـاکانی وڵاتـە نائیسـلامییەکان بـە ڕێژەیـەکی زۆر لەگـەڵ شەریعەتی ئیسلامی ناکۆك نین مادام ئەو یاسایانە خزمەتی کۆمەڵگاکەیان دەکـەن و لەگەڵ ڕێسای جێگیری شەریعەتی ئیسلامی ناکۆك نەبن چونکە قورئانی پـیرۆز تـەنها

باسی لایەنە گشتگیرەکانی (الکلیات) کردووە و ڕێگەیداوە بە عەقڵی مرۆڤ تاکو لایەنە لاوەکییەکان – جوزئییەکان – بگەڕێنێتەوە بۆ ئەو لایەنە گشتگیرانە لە ژێر تیشکی پێویستییەکانی ژیان لە گشت کات و شوێنێك ئەگەر ئەو گەڕانەوەیە لە چوارچێوەی خوڕەوشت دەرنەچوبێت.

# باسی دووەم:
# فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)

## السنة النبوية

ئەو باسە دوو بابەت لەخۆدەگرێت یەکەمیان پێناسەی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) و دووەمیان ئەرکەکانی فەرموودە بۆیە باسەکەمانە دەکەین دوو بەش:

## بەشی یەکەم:
## پێناسەی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)
## التعريف بالسنة النبوية

السنة: لە رووی زمانەوانی بە چەند واتا هاتووە لەوانە: رێگە یەکسانە چ رێگای چاکە بێت یان رێگای خراپە[1].

---

[1] – لسان العرب لابن منظور/فصل السين/ حرف النون، و بەو واتایە لە فەرموودەی پێغەمبەر (ص) هاتووە : (من سن في الاسلام سنة حسنة فيعمل بها بعده كتب له مثل أجر من عمل بها بعده و لاينقص من أجورهم شيء .. و من سن في الاسلام سنة سيئة فعمل بها بعده كتب له مثل وزر من عمل بها و لا ينص من اوزارهم شيء) صحيح مسلم بشرح النووي ٨/٦١. واتا: هەر کەسێك رێگایەکی چاکە لە ئیسلام دابهێنێت و لە دوای ئەو کاری پێ بکرێت بە قەد ئەو کەسەی کاری پێدەکات پاداشتی بۆ دەنوسرێت و بەبێ ئەوەی لە پاداشتی هیچیان کەم ببێتەوە ... و هەر کەسێك رێگایەکی خراپە لە ئیسلام دابهێنێت و لە دوای ئەو کاری پێ بکرێت بە قەد ئەو کەسەی کاری پێ دەکات تاوانی بۆ دەنوسرێت و بەبێ ئەوەی لە تاوانی هیچیان کەم ببێتەوە.

لە زاراوەی زانایانی فیقهی بریتیە لە: کردەوەیەکی داواکراو لە شەریعەتی ئیسلامی بەڵام بە شێوەیەکی پێویست (واجیب) نا[1].

هاواتایە لەگەڵ مەندوب و موستەحەب و تطوع و نافلە[2].

لە زاراوەی زانایانی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی بریتیە لە هەر کردەوەیەك یان وتەیەك یان هەڵوێستێکی پێغەمبەر (ﷺ)[3]. حەدیسی قودسی واتاکەی لەلایەن خودای گەورە خراوەتە ناو دڵی پێغەمبەر و وشەکانی لەیەن پێغەمبەر(ﷺ) دارێژکراون[4] و ئێمە بە واتای زانایانی بنەکانی فیقهی ئیسلامی باسی (السنة) دەکەین.

## گرنگی فەرموودە – أهمية السنة:

گرنگی فەرموودە لە ئەرکەکانی دەردەکەوێت کە لەمەودوا لە بەشی دووەمی ئەو باسە باسی دەکەین.

## بە بەڵگەدانانی فەرموودە – حجية السنة:

بەپێی قورئان و حەدیس و ئیجماع و عەقڵ فەرموودە بە بەڵگە دانراوە:

١- قورئانی پیرۆز: یەکێك لەو ئایەتانەی کە فەرموودەی بە سەرچاوەی دووەم لە دوای قورئانی پیرۆز دادەناوە خوادی گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ

---

[1] -واتا کردنی پاشتی هەیە و نەکردنی سزایی نییە.

[2] - شرح المنهج بهامش البجيرمي ١/٤٤٦.

[3] – القاشي العضد بشرح مختصر ابن الحاجب ٢/٢٢.

[4] – بۆ نموونە فەرموودەی (ياعبادي أني حرمت الظلم على نفسيي فلا تظلموا، ياعبادي كلكم ضال الا مَن هديته فأستهدوني اهديكم) اخرجه مسلم في باب تحريم الظلم بشرح النووي ١٦/١٦٨.

تَأْوِيلاً﴾.النساء/٥٩. واتا: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی خودای گەورە و گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمانڕەوای خۆتان بکەن و ئەگەر لە شتێکا ناکۆکیتان هەبوو بگەڕێنەوە بۆ لای خودای گەورە و پێغەمبەر (ﷺ).

گەڕانەوە بۆلای خودای گەورە بریتیە لە کارکردن بە قورئان و گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) بریتیە لە کارکردن بە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و مەبەست لە وەلی ئەمر گوێڕایەڵی سیستەمی گشتییە کە وەلی ئەمر (سەرۆکی دەوڵەت) سەرکردایەتی دەکات بەو پێیەی کە کەسایەتییەکی مەعنەوییە و نەك وەکو کەسێکی سروشتی.

٢- فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): یەکێك لەو فەرموودانەی کە فەرموودەی پێغەمبەر بە بەڵگە دادەنێت بریتیە لە حەدیسی موعازی کوڕی جەبەل کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) هەڵیبژارد بۆ ئەوەی ببێتە دادوەر و والی لە یەمەن و شایستەیی بۆ ئەو ئەرکە تاقیکردەوە و پێی فەرموو: (ئەگەر کێشەیەکت هاتە پێش چۆن دادوەری دەکەی؟ فەرمووی: بە کتێبی خودا، فەرمووی ئەگەر لە کتێبی خودا دەستت نەکەوت. فەرمووی: بە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) ، فەرمووی: ئەگەر لە فەرموودەی پێغەمبەر و کتێبی خودای گەورە دەستت نەکەوت فەرمووی: ئیجتیهاد دەکەم و کەمتەرخەمی ناکەم و پێغەمبەر(ﷺ) دەستی لە سینگی (موعان) دا و فەرموودی سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە پەیامبەری پێغەمبەری خودای سەرخست لەوەی پێغەمبەری خودا رازی بکات[1]).

---

[1] – ئیمامی إحمد لە مسنەدەکەی ٥/٢٣٦، و ئەبو داود لە سننەکەی حەدیسی ژمارە ٣٥٧٦ و بەیهەقی لە سنەنەکەی ١/١١٤ گێڕاویانەتەوە.

مەبەست لە کەمتەرخەمی ناکەم واتا کەمتەخەمی ناکەم لە پەنابردن بۆ ئیجتیهاد و بەکارهێنانی بیرورا و دەرهێنانی حوکم لە حالەتی نەبوونی دەقی قورئان و فەرموودە و پێویستی بابەتەکە بە ئیجتیهاد.

٣- ئیجماع: زانایانی شەریعەتی ئیسلامی لە سەرەتای ئیسلام کۆکن لە سەر ئەوەی کە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای قورئانی پیرۆز دێت.

٤- عەقلّ: عەقڵی تەواو وادەخوازێت کە خودای گەورە هەر کەسێك بە پێغەمبەر هەڵبژێرێت بۆ راگەیاندنی پەیامەکەی بە تەواوی مرۆڤایەتی گشت وتە و کردەوەیەك کە بە سیفەتی پێغەمبەر نەك بە سیفەتی مرۆڤی ئاسایی ئەنجامی بدات لە دوای قورئانی پیرۆز بە بەڵگە و بە سەرچاوەی ئەحکامەکانی شەریعەت دادەنرێت.

## جۆرەکانی فەرموودە – انواع السنة:

فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) لە چەند رووێکەوە بە سەر چەندین جۆری جیاجیا دابەش دەکرێت بەو جۆرەی خوارەوە:

**أ- لە رووی سروشتی فەرموودە بریتیە لە فەرموودەی گوفتاری و کرداری و هەڵوێستی:**

**١- فەرموودەی گوفتاری – السنة القولية:** وەکو قسە و گوفتارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هەر وەکو فەرموویەتی (إذا حكم الحاكم فأجتهد ثم أصاب فله أجران فإذا حكم و اجتهد و أخطأ فله أجر[1]).

**٢- فەرموودەی کرداری – السنة الفعلية:** وەکو کردارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە بەو کردارانەی لایەنە کورتەکانی قورئانی روونکردۆتەوە بەپێی فەرموودەی خودای گەورە ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾النحل/٤٤. واتا: ئێمە قورئانمان بۆ تۆ دابەزاندوە تاکو ئەوە بۆ خەڵکی روون بکەیتەوە کە بۆیان دابەزیوە،

[1] – متفق عليه – صحيح النووي – كتاب الاقضية ١١/٢٥٤ دەروازەی پاداشتی دادوەر ئەگەر ئیجتهادی کرد.

هەروەکو فەرموویەتی ﴿ وأقيموا الصلاة﴾يونس/٨٧. واتا: نوێژ بکەن، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) بە ئامادەبوونی یاوەرانی نوێژی دەکرد و روکن و مەرج و سونەتەکانی نوێژی بەجێ دەگەیاند و دواتر پێی دەفەرموون (صلوا كما رأيتموني أصلي[1]) واتا: نوێژ بکەن هەر وەك منتان بینی نوێژم کرد.

٣- **فەرموودەی هەڵوێستی - السنة القريرية**: واتا کردەوەیەك یان قەسەیەکی کەسێکی تری بۆ گێڕدرابێتەوە یان گوێبیستی بوو بێت یان بە ئامادەبوونی ئەو ئەنجام درابێت و بێ دەنگ بووبێت چونکە بێ دەنگ بوونی پێغەمبەر(ﷺ) بە سیفەتی پێغەمبەرایەتی بەڵگەیەکی شاراوەیە لەسەر رەوایەتی قسەکە یان کردەوەکە.

**ب- لە رووی گێڕانەوە: متصل و مرسل – من حيث سنده: متصل مرسل:**

١- **فەرموودەی متصل**: بریتیە لەو فەرموودەیەی کە سەنەدەکەی گەیشتۆتە پێغەمبەر(ﷺ) بەبێ پچڕانی راویەك[2] لە زنجیرەی گێڕانەوەکەی.

٢- **فەرموودەی مرسل**: بریتیە لەو فەرموودەیەی کە سەنەدەکەی نەگەیشتۆتە پێغەمبەر(ﷺ) یان گەیشتۆتە پێغەمبەر بەڵام یەکێك لە یاوەران لە گێڕانەوەکەی دیار نەبێت.

**ج- لە رووی هێزی پابەند بوون بریتیە لە فەرموودەی متواتر و ئاحاد لەلایەن ( جمهور[3] )، و متواتر و مستفيض ( مشهور ) و ئاحاد، لەلایەن هەندێك لە زانایان و لە پێش هەموویان ئیمامی ( حەنەفی ):**

١- **فەرموودەی متواتر**: بریتیە لەو فەرمودەیەی راستەوخۆ کۆمەڵە یاوەرێك لە پێغەمبەریان(ﷺ) گێڕابێتەوە و عادەتەن ئەستەم بێت ئەو کۆمەڵە یاوەرە لە سەر درۆ

---

[1] – ئیمامی احمد لە مسنەدەکەی گێڕاویەتیەوە ٣/٢٧٨.

[2] – راوی: واتا ئەو کەسەی فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

[3] – بە بۆچوونی زانایانی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی بریتین لە جگە لە (حەنەفی) .

ڕێککەون و دواتر کۆمەڵە تابیعیەك[1] و تابیعی تابیعیەك بە هەمان سیفەت لە یاوەرانیان گێڕابێتەوە.

یەکێك لە فەرموودە گوفتارییە موتواتیرەکان (لَا تَكْتُبُوا عَنِّي وَمَنْ كَتَبَ عَنِّي غَيْرَ الْقُرْآنِ فَلْيَمْحُهُ وَحَدِّثُوا عَنِّي وَلَا حَرَجَ وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ[2]) واتا: هیچ شتێکی لە زمانی من مەنووسن و هەر کەسێك جگە لە قورئان شتێکی لە زمانی منەوە نووسیوە با لە ناوی ببات، و قسەی من بگێڕنەوە هیچی تێدا نییە، و هەر کەسێك بە ئەنقەست درۆ بە زمانی منەوە بکات با شوێنی خۆی لە ئاگری دۆزەخ دیاری بکات، و زیاتر لە سەد یاوەر ئەو فەرموودەیان گێڕاوەتەوە.

لە ڕووی دەربڕین موتەواتیر بریتیە لە موتەواتیری بە وشە یان بە واتا:

موتەواتیری بە وشە (المتواتر اللفظي): بریتیە لە بەرکارهێنانی هەمان ئەو وشانەی لە پێغەمبەرﷺ بیستراون بەبێ ئەوەی دەربڕینی هیچ راوییەك لەگەل ئەوی تر جیاواز بێت.

موتەواتیری بە واتا (المتواتر المعنوي): لە واتادا یەکە بەڵام دەربڕینەکان جیاوازن وەکو فەرموودەی (إنما الاعمال بالنيات) واتا: کردەوەکان بە نیازن و ئەو فەرموودەیە بە چەندین وشە و دەربڕینی جیاجیا گێڕدراوەتەوە بەڵام لە واتادا یەکن.

**مەرجەکانی تەواتور:**

أ- دەبێت بە ڕێگەی هەستکردن و گوێ بیست بوون یان بیستن لە پێغەمبەرﷺ وەرگیرا بێت.

ب- عادەتەن لە ڕووی عەقڵییەوە ئەستەم بێت ئەو کەسانە لە سەر درۆ ڕێك بکەون لەبەر زۆریان و دادپەروەرییان و دەست پاکییان و جیاوازی خوویان و جیاوازی

---

[1] - تابیعی: واتا ئەوەی دوای سەردەمی پێغەمبەر کە مسولمان بوونە و پێغەمبەریان نەبینیوە بەڵام هەندێك لە یاوەرانی پێغەمبەریان بینیوە.

[2] - صحیح مسلم ٥/٨٤٧ مسند احمد ٣/٢١.

شوێنیان.

ج- دەبێت مەرجی دووەم لە هەر سێ چینەکە بهێتەدی (چینی یاوەران و چینی شوێنەکەوتووان (تابعین) شوێنەکەوتەی و شوێنکەوتووان (تابعي التابعین).

حوکمی فەرموودەی موتەواتیر: پێویستە کاری پێ بکرێت و لەلای زانایان نکولیکردن لەو فەرموودەیە کافر بوونە.

٢- **فەرموودەی مەشهور**: بریتیە لەو فەرمودەیەی کە یەك کەس یان دوو کەس یان ژمارەیەکی کەم لە یاوەران لە پێغەمبەریان(ﷺ) گێراوەتەوە کە ژمارەیان ناگاتە ئاستی تەواتور و دواتر ژمارەی ئەو کەسانە لە سەردەمی تابیعین یان سەردەمی تابیعی تابیعین زیادی کردووە بەجۆرێك کە ژمارەیەك گێڕاویانەتەوە کە عادەتەن ئەستەمە لەسەر درۆ رێك بکەون.

**حوکمی فەرموودەی مەشهور**: واتای گومانێکی نزیك لە یەقین دەگەنێت و واتای دڵنیایی دەگەیەنێت، و لەبەرئەوە وەکو موتەواتیر پێویستە کاری پێ بکرێت و بەو فەرموودەیە دەقی گشتی قورئانی پیرۆز تایبەت دەکرێت و دەقی رەهای قورئان سنووردار دەکات و لە کاتی تێگیرانی لەگەڵ قیاس و ئیجماع ئەو فەرموودەیە پێش دەکەوێت.

٣- **فەرموودەی ئاحاد**: بریتیە لەو فەرموودەیەی کە لە هەرسێ چینی ناوبراو مەرجەکانی تەواتوری تیادا نییە.

شایەنی باسە زۆربەی فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لەو جۆرەی سێیەمن.

حوکمی ئەو فەرموودەیە: زاڵبوونی گومان پێویست دەکات و پێویستە کاری پێ بکرێت ئەگەر بەڵگەیەك نەبێت لە سەر ناڕاستی فەرموودەکە.

**د- فەرموودە لە رووی سەلماندن دەکرێتە دوو بەش فەرموودەی بنبڕ و گومانی ( قطعي و ظني ):**

١- سەلماندنی بنبڕ (قطعي الثبوت): بریتیە لە فەرموودەی موتەواتیر.

٢- سەلماندنی گومانی (ظني الثبوت): بریتیە لەو فەرموودەیەی کەوا مەرجەکانی تەواتوری تیادا نەبێت.

**هـ- لە رووی گەیاندنی حوکم، حوکمی بنبڕ و حوکمی گومانی دەگەیەنێت:-**

١- گەیاندنی حوکمی بنبڕ (قطعي الدلالة): بریتیـە لـەو فەرموودەیـەی تـەنها یـەك واتا دەگەنێت وەکو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) (أعطوا الجدة السـدس) واتـا: یـەك لـە سەر شەش بە داپیرە بدەن.

٢- گەیاندنی حوکمی گومانی (ظني الدلالة): بریتیـە لـەو فەرموودەیـەی زیـاتر لـە یەك واتا دەگەیەنێت وەکو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) (لا تبع ماليس عندك) واتا؟ ئەو شتە مەفرۆشە کە لەلای تۆ نییە.

وشەی (ما) سامانی گوێزەرەوە و خانوبەرە (سامانی نەگوێزەرەوە) و خواردن و جگە لەوە دەگرێتەوە بۆیە زانایانی شەریعەت لە راڤەکردنی ئەو وشەیە رای جیاوازیان هەیـە و هەنـدێکیان بـە سـامانی گـوێزەرەوەی لێـك دەدەنـەوە، چـونکە سـامانی نـەگوێزەرەوە بـە بـەخاوەنکردن (تملیکـردن) یـان وەرگـرتن لـە یـەکێکی تـر هـیچ گۆڕانکـاری بـە سـەردا نایـەت بـە پێچـەوانەی سـامانی گـوێزەرەوە و هەنـدێکیان بـە خواردنی لێك دەنەوە چونك بە خێرایی تێك دەچێت و لەناو دەچێت.

هەندێکیان کار بە گشتییەتی وشەی (ما) دەکەن و دەڵێن: گشـت سـامانێك پـێش بە خاوەنکردنی یان وەرگرتنی دروست نییە بفرۆشرێت بـە مەبەسـتی رێگـەگرتن لـەو زیانەی کە بە کڕیان یان بە هەردوو لایەنی کڕیار و فرۆشیار دەکەوێت.

بە بۆچوونی ئێمە هۆکاری ئەو قەدەغەکردنە بریتیـە لـە لەناوچـوون و گۆڕانکـاری بەسەرداهاتن کەواتە ئەگەر سامانی فرۆشراو لە مـاوەی عـادەتی تێـك نەدەچـوو ئـەوا

هیچی تێدا نییە پێش بە خاوەنکردنی یان وەرگرتنی بفرۆشرێت بە هۆی گەشەکردنی ژیانی ئابوری و خێرایی ئاڵوگۆڕی نێوان فرۆشیار و کڕیار.

**و- لە رووی راستی فەرمووده دەکرێتە دوو بەش فەرموودەی راست و فەرموودەی دروستکراو:**

**١- فەرموودەی راست (الحدیث الصحیح)**: بریتیە لەو فەرموودەیەی کەوا بە شێوەیەکی راستەقینە لە پێغەمبەر(ﷺ) دەرچووە.

**٢- فەرموودەی دروستکراو (الحدیث المختلق)**: بریتیە لەو فەرموودەیەی کەوا بە زمانی پێغەمبەر(ﷺ) دانراوە جا دانانەکە بە نیاز پاکی بوو بێت یان بە نیاز خراپی هەروەکو (عبدالله ی کوڕی سبأ)ی بە رەسەن جولەکە وای کرد و بە شێوەی پیلان و دووڕوویی هاتبووە ناو ئیسلام و لە ساتەکانی کۆتایی تەمەنی بە موسولمانانی دەوروبەری خۆی گوت: هازاران فەرموودەم بە ناوی پێغەمبەری ئێوە داناوە و لەو فەرموودانەدا حەرامم و حەلال کردووە و حەلالیشم حەرام کردووە.

## پێوەری جیاوایکردن لە نێوان فەرموودەی راست و دانراو:

گرنگترین پێوەرەکانی جیاکردنەوەی فەرموودەی دانراو لە فەرموودەی راست بریتین لە:

١- ئەگەر پێچەوانەی دەقی روونی قورئانی پیرۆز بێت.

٢- ئەگەر پێچەوانەی داهێنانە زانستییەکانی سەردەم بێت ئەو داهێنانانەی کەوا بە تەواتور سەلمێندراون.

٣- ئەگەر پێچەوانەی هەستپێکراوە ئاشکرا و روونەکان بێت.

٤- ئەگەر عەقڵی تەواو و پێگەیشتووی باوەڕدار قەبولی نەکات.

٥- ئەگەر فەرموودەکە شایستەی پێگە و گەورەیی پێغەمبەر(ﷺ) نەبێت کە فەیلەسوفە نامسولمانەکان شاهێدی گەورەیی ئەو پێغەمبەرەیان داوە لەوانە

(ئۆغست کنت) که یەکێکه له فەیلەسوفەکانی رۆژئاوا دەڵێت: (شاهێدەی ئەدەم ئەی موحەمەد که تۆ خودا نی بەڵام تۆ مرۆڤێکی بە گشت واتا و بەها بەرزەکان).

شایەنی باسه ئەگەر فەرمووده له یەکێك له سەرچاوه باوەرپێکراوەکان لەلایەن مسولمانان هات بێت بەڵگەیەکی بنبڕ نییه له سەر راستی فەرموودەکه چونکه پێش نووسینەوه و دوای نووسینەوەی فەرمووده و پێش بڵاوکردنەوەی زۆر کەس فەرموودەیان دادەنا سەرەرای ئەوەی زانایانی مسولمانانی ناودار زۆر هەوڵیاندا بۆ دڵنیابوون له راستی فەرموودەکه دوای گێرانەوه و کۆکردنەوه و بڵاوکردنەوەی فەرمووده.

**سەرچاوه باوەرپێکراوەکان لەلایەن جمهوری زانایان:**

١- الجامع الصحيح للامام عبدالله بن محمد بن اسماعيل بن ابراهيم البخاري — صحيح البخاري(١٤٩-٢٥٦)هـ.

٢- صحيح مسلم بن الحجاج النسابوري (٢٠٤-٢٦١) هـ.

٣- سنن النسائي أبي عبدالرحمن شعيب الخراساني (٢١٥ — ٣٠٣هـ).

٤- سنن أبي داود سليمان بن الاشعث بن اسحاق الاسدي (٢٠- ٢٧٥ هـ).

٥- جامع الترمذي محمد بن عيسى الترمزي (٢٠٩-٢٧٩ هـ).

٦- سنن إبن ماجة محمد بن يزيد بن ماجة القزويني (٢٠٧-٢٧٣ هـ).

- سەرچاوه باوەرپێکراوەکان لەلایەن پێشەواییەکان (الامامية):-

١- الكافي للكليني محمد بن يعقوب الكليني (ت٣٢٨هـ).

٢- من لايحضره الفقيه لابي جعفر محمد بن علي بن الحسين (ت٣٨١هـ).

٣- الاستبصار للطوسي محمد بن الحسين بن علي (ت٤١١هـ).

**مەرجەکانی کارکردن بە فەرموودەی ئاحاد:**

أ/ زانایانی حەنەفی توندبوونه له دانانی مەرجەکانی کارکردن بە فەرموودەی ئاحاد چونکه سەردەمی ئەوان دانەرانی فەرمووده دەرکەوتن و فەرموودەیان بە ناوی

پێغەمبەر(ﷺ) دروست دەکرد – جا ئەو دانانە یان بە نیاز پاکی بوو یان بە نیاز خراپی وەکو ئەو فەرموودانەی لەلایەن پیلانگێرەکان دانراون.

**گرنگترین مەرجەکانی زانایانی حەنەفی:**

١– نابێت راوی بە پێچەوانەی ئەو فەرموودەیەی گێراویەتییەوە کار بکات چونکە کارکردنی بە پێچەوانەی گێرانەوەکەی بەڵگەیە لە سەر سڕینەوەی فەرموودەکە بە قورئان یان بە فەرموودەیەکی تر یان دەرکەوتنی ناڕاستی فەرموودەکە[1].

٢– نابێت فەرموودەکە دەبارەی روونکردنەوەی مەسەلەیەکی گرنگی ژیانی مرۆڤ بێت کە ئەو مەسەلەیە رۆژانە دووبارە ببێتەوە وەکو پەشیمانەوە لە کڕین و فرۆشتن لە دانیشتن (خیار المجلس فی البیوع[2]) چونکە لەو حاڵەتە فەرموودە بە ئاحادی نامێنێتەوە بەڵکو دەبێتە فەرموودەیەکی موتەواتیر یان بە لایەنی کەم دەبێتە فەرموودەیەکی مەشهور[3].

٣– نابێت پێچەوانەی قیاس بێت ئەگەر ئەوەی گێڕاویەتییەوە کەسێکی زانا نەبێت[4].

---

[1] – لەبەرئەوەی کار بەو فەرموودەیە ناکەن کە عائیشە ر–خ گێڕاویەتییەوە (هەر ئافرەتێک بەبێ مۆڵەتی وەلیەکەی خۆی مارە بکات ماربڕینەکەی پووچەڵە) لەبەرئەوەی عائیشە بە پێچەوانەی ئەو فەرموودەیە کاری کردووە چونکە کچی برای خۆی حەفصەی کچی عبدالرحمن کوڕی ئەبو بەکری مارەکرد و عبدالرحمن لە شام بوو بەبێ مۆڵەتی وەلی کچەکە.

[2] – واتا: کڕیار و فرۆشیار بۆیان هەیە پەشیمان بنەوە تاکو لە یەکتری جیا دەبنەوە.

[3] – لەبەرئەوەی کار بەو فەرموودە ناکەن کە دەفەرمووێت: (کڕیار و فرۆشیار سەرپشکن ئەگەر لە یەکتری جیانەبووبنەوە).

[4] – لەبەرئەوەی کار بە فەرموودەی معقل بن سنان ناکەن کە دەفەرمووێت: (پێغەمبەر (صلی الله علیە و سلم) بڕیاریدا بە مارەیی هاوشێوە (مهر المثل) بۆ ئافرەتێک بە ناوی – بروعی کچی ئەشق – کە مێردی مرد بوو پێش ئەوەی مارەیی بۆ دیاری بکات پێش ئەوەی بیگوازێتەوە). چونکە ئەوەی گێڕاویەتییەوە زانا نەبووە.

٤- پێچەوانەی بەڵگەیەکی لە خۆی بە هێزتر نەبێت وەکو قورئـان و فـەرموودەی موتەواتیر و فەرموودەی مەشهور و ئەو ڕێسا گشتییانەی زانایان لەسەریان کۆکن[١].

ب/ یەکێك لە مەرجەکانی مالیکی نابێت فەرموودەکە پێچەوانەی کـاری خـەڵکی شاری مەدینە بێت[٢].

جـ/ یەکێك لە مەرجەکانی شافیعی و حەنبەلی لەسەر ڕاسـتی سـەنەدی فـەرموودە ئەوەیە کە لە زنجیرەی گێڕانەوەی گەیشتبێتەوە پێغەمبەر(ﷺ).

د/ لە مەرجەکانی شیعەی ئیمامی:

١- چەند کەسێك گێڕابیانەوە (زیاتر لە یەك کەس).

٢- ئەوەی گێڕایەوتییەوە لـە خانـەوادەی پێغەمبـەر(ﷺ) بێـت واتـا: ئـالی بـەیت بێت[٣].

---

١ - لەبەرئەوەی کار بە فەرموودەی ئەبو هورەیرە ناکەن کە دەفەرموێت: (شیر لە گوانی حوشتر و بزن و مەڕ مەهێڵنەوە و هەر کەسێك دوای ئـەوە بیکڕێـت دوای دۆشـینی سەرپشـکە ئەگـەر ڕازییە با بۆخۆی هەڵیگرێت و ئەگەرنا لەگەڵ ڕوبەیەك خورما بیگەڕێنێتەوە بـۆ فرۆشـیار). واتـا هێشتنەوەی شیری زۆر لە ناو گوانی ئاژەڵ و وازهێنان لە شیر بۆ ماوەیەك تاکو کڕیار وابزانێـت ئەو ئاژەڵە شیری زۆرە و دەڵێن: ئەو فەرموودەیە پێچەوانەی قورئانی پیرۆزە کە دەفـەموێت: (فمن اعتدى عليكم فعتدوا عليه بمثل معتدى عليكم) و خورمان وەکو شیر نییـە، و پێچـەوانەی فەرموودەی (الخراج بالضمان) چونکە ئـاژەڵی فرۆشـراو دوای وەرگرتنـی دەکەوێتـە ئەسـتۆی کڕیار و داهاتی (شـیرەکەی) بـۆ ئـەوە هـەروەها زانەکەشـی لەسـەر ئـەوە ئەگـەر لەناوچـوو و پێچەوانەی ئیجماعە چونکە ئـەو شـتانەی وێنـەیان هەیـە لـە هـەمان وێنـەی خۆیـان لـەجیاتی دەدرێت و ئەو شتانەی وێنەیان نییە نرخەکەیان دەدرێت و خورما وەکو شیر نییـە ناکرێـت بـە نرخ دابنرێت چونکە چونکە نرخ بەپێی بڕی سامانی لەناوچـوو زیـاد و کـەم دەکـات بـە هـەمان شێوە لە شیردا.

٢ - لەبەرئەوە کار بە فەرموودەی (خيار المجلس)ی ناوبراو ناکەن چونکە خـەڵکی مەدینـە کاریـان پێ نەکردووە لەگەڵ ئەوەی شاری مەدینە کانگای وەحی بووە.

٣ - لەبەرئەوە کار بە فەرموودەی (لايجمع بـين المـرأة و عمتهـا و لا بـين المـرأة و خالتهـا) ناکـەن چونکە بەپێی گومانی ئەوان ئەو فەرموودەیە لەلایەن ئالی بەیت نەگێڕدراوەتەوە.

# بەشی دووەم:
# ئەرکەکانی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)
# وظائف السنة النبوية

پێشتر لە بەشی یەکەم باسمانکرد کەوا ئەحکامەکانی قورئانی پیرۆز پێنجن و بریتین لە: ئەحکامە بیروباوەڕییەکان و ئەحکامە خوڕەوشتییەکان، و ئەحکامە گەردوونییە، و ئەحکامە پەند و ئامۆژگارییەکان، و ئەحکامە کردارییەکان.

فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆڵێکی زۆری هەیە لە جەختکردنەوە لە سەر ئەو ئەحکامانە و ڕوونکردنەوەی ئەو ئەحکامانە و زیادکردنی ئەو شتانەی قورئان باسی نەکردوون و باسکردنی ئەرکەکانی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) لە گشت ئەو ئەحکامانە پێویستی بە چەندین کتێب هەیە بەجۆرێك کە ئەستەمە بتوانرێت باس لە گشت ئەو ئەرکانە بکرێت.

سەرەڕای ئەوە ئامانجی سەرەکی لە خوێندنی ئەو دەروازەیە بریتیە لە ڕوونکردنەوەی ئامانجی شەریعەتی ئیسلامی لە لایەنی ئەحکامە کردارییەکان.

بۆیە تەنها باسی چەند نموونەیەك لە ئەرکەکانی فەرموودەی پێغەمبەری تایبەت بە ئەحکامە کردارییەکان دەکەین کە بریتین لە: تایبەتکردنی دەقی گشتی قورئان کە گشتییەتی مەبەست نییە یان سنووردارکردنی دەقی ڕەها کە ڕەهایەتی مەبەست نییە، یان ڕوونکردنەوەی دەقی نادیار کە تێگەیشتنی کەسی ڕاسپێدراو (المكلف)[1] لە بڕیاری ئەو دەقە ئاسان نییە، یان جەختکردنەوە لە سەر ئەو ئەحکامە کردارییانەی

---

[1] – (مكلف) واتا: و شێت و منداڵ نەبێت.

له قورئانی پیرۆز هاتوون له بەر گرنگی ئەو ئەحکامانە لە ژیانی کرداری مرۆڤ، یان باسکردنی ئەو شتەی کە قورئانی پیرۆز بە راشکاوی باسی نەکردووە و لەبەر گرنگی ئەو شتە پێغەمبەر(ﷺ) باسی کردووە، و لە خوارەوە ئەو ئەرکانە روون دەکەینەوە:-

## یەکەم: تایبەتکردنی دەقی گشتی قورئانی پیرۆز ئەگەر لە بنەڕەتدا گشتییەتی دەقەکە مەبەست نەبێت

گشتی: بریتیە لەوەی کە بە یەکجار لە رووی زمانەوانی یان داب و نەریت یان عەقڵ گشت شتەکانی وەکو یەکتر بگرێتەوە.

تایبەتکردن: دەرهێنانی هەندێك لە یەکە گشتییەکانی ناو دەقەکە وەکو کرداری لێك دەرکردنی بیرکاری.

بۆ نموونە فەرموودەی خودای گەورە ﴿لِّلرِّجَالِ نَصيِبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾النساء/٧. واتا: پیاو بەشی هەیە لەوەی دایك و باوك و خزمەکان بەجێی دەهێڵن و ئافرەتیش بەشی هەیە لەوەی دایك و باوك و خزمان بە جێی دەهێڵن و لە کەم یان زۆر بەشی هەر کەسێك دیاریکراوە پێویستە پێی بدرێت. روون و ئاشکرایە کە هەریەك لە وشەی (الرجال) و (النساء) کۆی پیاو و ئافرەتن و (ال/الاستغراق)یان لە سەرە کە واتای گشتی دەگەیەنێت چونکە یەکەم گشت نێرینەیەك دەگرێتەوە گەورە بێت یان بچووك و دووەم گشت مێینەیەك دەگرێتەوە گەورە بێت یان بچووك.

لەبەرئەوەی لە بنەڕەتدا ئەو گشتییە مەبەست نییە بۆیە گشتییەتی هەریەك لەو دوو دەستەواژەیە بە فەرموودەی (لايريث القاتل/ بکوژ میرات نابات) تایبەتکراوە و لەو شوێنە وشەی بکوژ بۆ پیاو و ئافرەت بە کاردێت کەواتە هەر میرات گرێك پیاو بێت یان ئافرەت ئەگەر میرات لێگیراوەکەی خۆی بە ئەنقەست بکوژێت لە میراتی ئەو

کەسە بێبەش دەکرێت وەکو سزایەکی پاشکۆیی سەر بە سزای قیصاص یان هەر سزایەکی تر.

هۆکار و فەلسەفەی ئەو بێبەشکردنە ئەوەیە چونکە ئامانجی بکوژ لەو کوشتنە بریتی بووە لە پەلەکردن لە بە دەستهێنانی میراتی کوژراو و ڕێسایەکی شەرعی و یاساییش هەیە دەڵێت: (هەر کەسێك پەلەی لە شتێك کرد بێت پێش ئەوەی کاتی خۆی دابێت بە بێبەش بوون لەو شتە سزا دەدرێت[1]) و زانایان بکوژی وەسیەتبۆکراو و دیاری پێدراو کاتێك وەسیەتکار یان دیاری بەخشەکە دەکوژێت قیاسیان کردۆتە سەر بکوژی میراتگر بەجۆرێك کە ئەوانیش بێبەش دەبن لە وەسیەت و دیاری ئەگەر بەرامبەرەکەیان بکوژن چونکە لەلایەك فەلسەفەی ناوبراو و لەلایەکی تر پاراستنی گیانی بێتاوانان لە هەر سێ حالەتەکە هەیە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ ئەو میراتگرانەشی لەو دەقە دەرهێناوون کە ئاینیان لەگەڵ یەکتری جیاوازە بۆ نموونە ئەگەر یەکێکیان مسولمان بێت ئەوەی تریش مسولمان نەبێت و دەفەرمووێت: (دوو میللەتی جیاواز میرات لە یەکتری ناگرن) بەڵام جیاوازی ئاین ڕێگر نییە لە وەرگرتنی وەسیەت چونکە ئامانج لە وەسیەت بریتییە لە دەستەبەری و هاوسەنگی ئابووری.

بۆیە پێشنیار دەکەم لە حالەتی جیاوازی ئاین هەریەك لە ژن و مێرد وەسیەت بۆ یەکتری بکەن کە بڕی وەسیەتەکە لە یەك لە سەر سێی میرات زیاتر نەبێت بۆ نموونە ئەگەر پیاو مسولمان بێت و ئافرەتەکە خاوەن کتێبی ئاسمانی واتا (جولەکە یان مەسیحی) بێت.

---

[1] – گۆڤاری (الاحكام العدلية) ماددەی ٩٩.

## دووەم: سنووردارکردنی دەقی ڕەها – تقييد النص المطلق:

**ڕەها – مطلق:** واتا پێك هاتەیەکی هاوبەش لە نێوان چەندین جۆر یان چەشن یان تاك و دەکرێت مەبەست هەریەك لەوانە بێت بە شێوەی یەك لە دوای یەك پێش ئەوەی دەقەکە سنووردار بکرێت یان گشت یان بەشێك لە بڕی شتەکە بگرێتەوە.

ئەگەر دەقێکی ڕەها لە قورئانی پیرۆز هاتبێت و لە بنەڕەتدا مەبەست ڕەهایەتی نەبێت پێغەمبەرﷺ بەپێی ویستی خودای گەورە سنوورداری کردووە.

یەکێك لە نموونەکانی سنووردارکردنی دەقی قورئانی پیرۆز بە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾البقرة/١٨٠. واتا: پێویستکراوە لە سەرتان ئەگەر گەیشتنە سەرەمەرگ وەسیەت بکەن کە هەندێك لەو سامانەی بەجێتان هێشتووە بە شێوەیەکی جوان بە دایك و باوك و خزمان بدرێت و ئەوەش لە سەر کەسانی پارێزگار پێویستە. وشەی (الوصية) وشەیەکی ڕەهایە و گشت یان دوو لە سەر سێ یان نیوە یان یەك لە سەر سێی یان جگە لەوە دەگرێتەوە.

لە بەرئەوەی لە بنەڕەت مەبەست ئەو ڕەهایەتی و گشتگیرییە نییە بۆیە پێغەمبەرﷺ دیاریکردووە کردویە بە یەك لە سەر سێ هەروەکو (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس) کە یاوەرێکی پایەبەرزی پێغەمبەرەﷺ فەرموویەتی: (گوتم ئەی پێغەمبەرﷺ من خاوەن سامانم و لە ریواتێکی تر هاتووە من سامانم زۆرە تەنها کچێکی میراتگرم هەیە ئایا دوو لە سەر سێی سامانەکەم ببەخشم؟ فەرمووی نەخێر: گوتم: ئایا نیوەی ببەخشم؟ فەرمووی نەخێر گوتم: ئایا یەك لە سەر سێی ببەخشم؟ فەرمووی سێیەك و سێیەك زۆرە و تۆ میراتگرانت بە دەوڵەمەندی بەجێبهێڵی باشترە لەوەی بە هەژارییان بەجێبهێڵی و دەست لە بەر خەڵکی پان بکەنەوە[1]).

---

[1] – ئەو فەرموودەیە (متفق عليه)یە لە بوخاری هاتووە فەرموودەی ژمارە (١٥٢٠) و مسلم لە (كتاب الوصية باب الوصية بالثلث بشرح النووي١١/٨٥).

## سێیەم: ڕوونكردنەوەی دەقی كورتی قورئانی پیرۆز – بیان نص مجمل في القرآن الكريم:

كورت – المجمل: بریتیە لە وشەیەك كە واتاكەی ڕوون نەبێت یان لە واتای زمانەوانی گوازرابێتەوە بۆ واتای شەرعی، بۆ نموونە دەربارەی نوێژ خودای گەورە فەرموویەتی ﴿وأقيموا الصلاة﴾ ئەو دەقەی قورئان كورتە و باسی كۆڵەگە و مەرج و سونەتەكانی نوێژی نەكردووە و پێغەمبەرﷺ لە بەردەم یاوەرانی نوێژی بەجێگەیاند بە گشت كۆڵەگە و مەرج و ئادابەكانی و دواتر فەرمووی (چۆن منتان بینی نوێژم كرد ئاوا نوێژ بكەن).

نموونەی ڕوونكردنەوەی دەقی كورت دەربارەی زەكات خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وآتوا الزكاة﴾ ئەو دەقە كورتە چونكە باسی ئەو سامانەی نەكردووە كە پێویستە زەكاتی لێ بدرێت، و هەروەها بڕی ئەو سامانەی دیاری نەكردووە واتا كەمترین ئاستی سامانی دیارینەكردووە كە زەكاتی لێ دەكەوێت و ئەو بڕە سامانەی دیاری نەكردووە كە وەكو زەكات لە سامانەكە دەردەهێندرێت و بە كەسانی پێویست دەدرێت بۆیە پێغەمبەرﷺ ئەو ئەركەی گرتۆتە ئەستۆ و مەبەستی ئەو ئایەتەی دیاریكردووە و جۆری ئەو سامانەی دیاریكردووە كە زەكاتی لێ دەكەوێت، بۆ نموونە لە ئاژەڵ چوار جۆری دیاریكردووە كە بریتین لە حوشتر و جێڵ و بزن و مەڕ، و لە دانەوێڵە زەكات لە گەنم و جۆ پێویستە و لە میوەجات زەكات لە ترێ و خورما پێویستە، و لە پارە زەكات لە زێڕو زیو و هەر دراوێكی تر پێویستە كە لە جیاتی زێڕ و زیو لە جیهان ئاڵوگۆڕی پێدەكرێت.

سەرەڕای ئەوە زەكات لە چوار سامانی بازرگانی و سەرمایەداری پێویستە و زەكات لە هەر سامانێكی گوێزەرەوە و نەگوێزەرەوە پێویستە كە بۆ مەبەستی كارپێكردن تەرخانكراوە بەجۆرێك كە زەكات لە قازانجی ئەو سامانە دەكەوێت نەك لە

سەرمایەکە و دەقی فەرموودەکانی تایبەت بە زەکاتم باس نەکردووە بۆ ئەوەی بابەتەکە درێژ نەبێت[1].

یەکێك لە نموونەکان دەربارەی حەج خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلِلّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً[2]﴾ (آل عمران/٩٧) واتا: خودای گەورە پێویستی کردووە لە سەر ئەو کەسانەی توانای دارایی و ڕێگایان هەیە سەردانی ماڵی خودا لە مەککەی پیرۆز بکەن، لەبەر کورتی ئەو ئایەتە پێغەمبەرﷺ ئەرکەکان و چۆنیەتی حەجکردنی لەبەردەم یاوەرانی ئەنجامداوە و دواتر پێی فەرموون (چۆنیەتی حەجکردن لە منەوە فێربن[3]).

## چوارەم: جەختکردنەوە لە سەر ئەو ئەحکامانەی لە قورئانی پیرۆز هاتوون چونکە بۆ ژیانی مرۆڤ زۆر گرنگ – تاکید ماورد في القرآن من الاحکام لزیادة اهمیتها في الحیاة البشریة:

بۆ نموونە وەکو فەرموودەی خودای گەورە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ وَلاَ تَقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾النساء/٢٩. واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە سامانی یەکتر بە ناڕەوا مەخۆن تەنها ئەگەر بە ڕێگەی بازرگانی و ڕەزامەندی نێوانتان نەبێت، ئەو ئایەتە باس لە پێویستی ڕەزامەندی لە مامەڵەکان دەکات چونکە وشەی (التراضي) واتای ڕەزامەندی هەردوولا دەگەیەنێت کەواتە ڕەزامەندی یەك لایەن بەس نییە.

---

[1] – بۆ سەیرکردنی ئەو فەرموودانە بگەڕێوە بۆ: صحیح مسلم ٢/٦٧ و دواتر (کتاب الزکاة) صحیح البخاري بشرح فتح الباري ٣/٣٠٩ دواتر (باب قدرکم یعطي من الزکاة و الصدقة) و سنن ابي داود بشرح عون المعبود (ج)٢ کتاب الزکاة.

[2] – سورة آل عمران ٩٧.

[3] – سبل السلام ٤/٣٢.

پێغەمبەرﷺ جەختی لە سەر ڕەزامەندی کردۆتەوە و فەرموویەتی: (سامانی هیچ مرۆڤێك حەلاڵ نییە تەنها بە ڕەزامەندی خاوەنەکەی نەبێت).

## پێنجەم: باسی ئەو شتانەی کردووە کە قورئان بە ڕاشکاوی باسی نەکردووە – ذکر ما سکت عنه القرآن صراحة:

نموونەکانی ئەو ئەرکە هەژمار ناکرێن بۆیە تەنها ئاماژە بە چەند نموونەیەك دەکەین لەوانە:

أ– قەدەغەکردنی مارەبڕینی ئافرەتێك لەگەڵ پوری یان خاڵەتی بە یەکەوە و پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (ئافرەتێك و پوری و ئافرەتێك و خاڵەتی بە یەکەوە کۆمەکەنەوە[1]) واتا: دروست نییە پیاوێك ئافرەتێك لەگەڵ پوری یان لەگەڵ خاڵەتی بە یەکەوە مارە بکات و یەکێك لە هەردوو ریواتەکە دەربارەی هۆکاری ئەو قەدەغەکردنە دەڵێت: (ئەگەر ئێوە ئەو کارە بکەن پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕێنن) بە هۆی ناکۆکی و جیاوازی نێوان هەردوو ئافرەتی هەوێی یەکتر بە پێی خۆپسکی و سروشتی ئەو کارە.

ب– بڕیاردان بە سوێندانی داوالێکراو ئەگەر داواکار بەڵگە گونجاوی نەبوو بۆ سەلماندنی داواکەی و پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (ئەگەر هەرچی خەڵکی داوای دەکەن پێیان بدرێت خەڵکی داوای خوێن و سامانی یەکتری دەکەن بەڵام سوێند خواردن لە سەر داوالێکراوە[2]) و لە فەموودەیەکی تر هاتووە (لە سەر داواکار پێویستە شاهێدی هەبێت و لە سەر نکوڵی کار پێویستە سوێند بخوات[3]) و هۆکارەکەی ئەوەیە کە داواکار داوای شتێك دەکات کە پێچەوانەی ڕەسن (أصل)ە کە بریتیە لە پاکانەی

---

[1] – صحيح مسلم ٢/١٠٢٨.

[2] – صحيح مسلم ٣/١٣٣٦ فەرموودەی ژمارە ١٧١١.

[3] – نيل الاوطال للشوكاني ٧/٤٤٤.

ئەستۆ بۆیە تەنها بە بەڵگە و شاهێد نەبێت داواکەی قەبول ناکرێت، داوالێکراو لەگەڵ ڕەسەنە کە بریتیە لە پاکانەی ئەستۆ بۆیە تەنها سوێندخواردنی بەسە.

ج- بڕیاری دادوەر نابێتە دانان بە ڕووداوێك کەواتە حەرام حەلال ناکات و حەلالیش حەرام ناکات پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (من تەنها مرۆڤێکم و کاتێك کێشەیەك دەهێنە لام لەوانەیە هەندێکتان لە هەندێکتان قسەزانتر بن و گومانم وابێت ڕاستە دەکات و بڕیار لە بەرژەوەندی ئەو دەربکەم بۆیە ئەگەر مافی مسولمانێکم پێدا[1] ئەوا پارچەیەك ئاگرم پێداوە جا یان با هەڵی بگرێت یان وازی لێبێنێت[2]).

شایەنی باسە وا بڵاوە لە نێوان خەڵکی کە فەرموودە ئەرکی شەشەمیشی هەیە کە بریتیە لە سڕینەوەی - نەسخ بوونی - قورئان بە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ بەلام ئەوە هەڵەیەکە جێگەی بەخشین نییە، چونکە فەرموودە هەرچەندە موتەواتیریش بێت بێهێزترە لە قورئانی پیرۆز و سڕینەوە بۆ نەهێشتنی ناکۆکییە لە نێوان دوو بەڵگەی دژ بە یەك و دەبێت ئەو دوو بەڵگەیە لە هێزدا یەکسان بن بەوپێیە ئەگەر ئایەتێکی قورئان لەگەڵ فەرموودەیەك پێچەوانە بوو پێویستە کار بەو فەرموودەیە نەکرێت کە لەگەڵ ئایەتەکە پێچەوانەیە[3].

---

[1] - واتا مافی مسولمانێکی تر. دیاریکردنی (موسولمان) تێگەیشتنی چێچەوانەی (مفهوم المخالفة)ی نییە چونکە مسولمان و نامسولمان لە ماف دونیاییەکان و مامەڵە داراییەکان یەکسانن.

[2] - صحیح مسلم ٣/١٣٣٨.

[3] - بۆ زیاتر درێژە بگەڕێوە بۆ کتێبی ئێمە (التبیان لرفع غموض النسخ في القرآن) باتیەتی مەرجەکانی نەسخ.

# وانەی دووەم

## حوکمی شەرعی

## الحكم الشرعي

حوکمی شەرعی کرداری: بریتیە لە پەیامی خودای گەورەی پەیوەست بە رەفتارەکانی مرۆڤ و رووداوەکان بەشێوەی پێویستکردن یان سەرپشک کردن یان دانان.

**شیکردنەوەی دەستەواژەکانی ئەو پێناسەیە:**

**پەیام – خطاب**: بریتیە لەو دەقە شەرعییە بنەڕەتییانەی ئاراستەی خانەوادەی مرۆڤایەتی کراون وەکو فەرمانەکان خودای گەورە فەرموویەتی ﴿... وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ... ﴾البقرة/٨٣. واتا نوێژ بکەن و زەکات بدەن و قەدەغەکردنەکان خودای گەورە فەرموویەتی ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالحَقِّ﴾الإسراء/٣٣. واتا: ئەو کەسە مەکوژن کە خودا کوشتنی قەدەغەکردووە تەنها مەگەر کوشتنی رەوا بێت.

**پەیوەست - المتعلق**: واتا: ئەحکامەکانی رەفتارەکانی مرۆڤ لە رووی رێگەپێدان – حەلال بوون – و قەدەغەکردن و لە رووی راستی و پووچەڵی و ناڕاستی رێك

دەخات و روونیان دەکاتـەوە، و رۆڵـی رووداوەکـان لـە هۆکارییـەتی و مەرجییـەتی و بەربەستییەتی روون دەکاتەوە.

**رەفتارەکان – التصرفات:** بریتین لە هەر قسەیەك یان هەر کردەوەیەك کە مـرۆڤ بە ویستێکی ئازاد دەری ببڕێت و ئەنجامی بدات بەجۆرێك کـە لـە رووی شـەریعەتەوە شوێنەوارێکی لیّ بکەوێتەوە یەکسانە رێگەپێدراو بێت یان نا، قسە بێت یان کـردەوە. قسەی رێگە پێدراو وەکـو گرێبەسـتەکان و قسـەی رێگـە پێنـەدراو وەکـو بوختـان و پاشەملە باسکردن و دووزمانی.

کردەوەی رێگەپێدراو وەکو رزگارکردنی کەسی نقومبوو، و رێگـە پێنـەدراو وەکـو کوشتنی بە ناڕەوا.

لەو پێناسەیە دەردەکەوێت کە رەفتاری شەرعی یان یاسایی لە سەر پێنج رەگـەز دەوەستێت کە بریتین لە:

١– دەبێت کردەوەی مرۆڤ بێت کەواتە هەرکردەوەیەك جگـە لـە کـردەوەی مـرۆڤ وەکو کردەوەی ئاژەڵ و سروشت پێی دەگوترێت رووداو.

٢– دەبێت بە ویست و ئیرادە ئەنجامدرا بێت کەواتە هـەر رەفتـارێکی منـداڵ یـان شێت و هەر کەسێکی لەو جۆرە بە رووداو دادەنرێت.

٣– دەبێـت بـە ویسـتی ئـازاد ئـەنجام درابێـت کەواتـە هـەر رەفتـارێکی کەسـی زۆرلێکراو و ناچار دەبێتە رووداو.

٤– دەبێت بە ویستێکی ئازاد و هۆشیار ئەنجام درابێت کەواتە رەفتاری نووستوو و ئەو کەسەی بە هەڵە داچووە و هەڵەکار و بیّ ئاگا و سەرخۆش و ناموەیـەز و هتـد پێی دەگوترێت رووداو.

٥– لە رووی شەرعی یـان یاسـایی شـوێنەواری هـەبێت، کەواتـە قسـە و کـردەوە ئاسـاییەکان و کۆمەڵایەتییـەکان بـە رەفتـاری شـەرعی یـان یاسـای دانـانرێن و بـەو رووداوانەش دانانرێن کە لە رووی شەرعی یان یاسایی شوێنەواری لیّ دەکەوێتەوە.

**ڕووداوەکان – الوقائع:** بریتین لەو ڕووداوانەی بەبێ ویستی مرۆڤ ڕوودەدەن یەکسانە دەرەنجامی کردەوەی مرۆڤ بن وەکو ڕووداوەکانی ئۆتۆمبێل یان بە هێزێکی زاڵ ڕوویان دابێت وەکو کەوتنەخوارەوەی فڕۆکە لە ئاسمان، یان بە ویست ڕوویدا بێت بەڵام لە ڕووی شەرع یان یاسا شوێنەوارەی لێ نەکەوێتەوە وەکو وتوێژ بۆ لێك تێگەیشتن و کردەوە ئاساییەکان وەکو خواردن و خواردنەوە و نووستن و هتد یەکسانە ڕووداوی ماددی بن وەکو لەناوبردنی سامانی یەکێك لەلایەن شێتێك، یان ڕووداوی مەعنەوی بن وەکو شێتبوون و خزمایەتی و عەقڵ و سەرەڕای ڕووداوە ناوبراوەکان هەر کردەوەیەکی ئاژەڵ پێی دەگوترێت ڕووداو.

**پێویستکردن – الاقتضاء:** بریتیە لە داواکردنی کردەوەیەك بە شێوەی پێویستکردن و سەپاندن یان بە شێوەی والەپێشترە و واباشترە – الاولویة أو الافضلیة، و بریتیە لە داواکردنی وازهێنان بە شێوەی پێویست یان بە شێوەی والەپێشترە و واباشترە.

**سەرپشکردن – التخییر:** واتا: سەرپشککردنی مرۆڤ لە نێوان ئەنجامدانی یان ئەنجام نەدانی کردەوەکە.

**دانان – الوضع:** واتا: دانانی کردەوەیەك بە هۆکار یان مەرج یان بە بەربەست یان دانانی بە ڕاست یان بە پووچەڵ یان بە ناتەواو.

## هۆکارەکانی هەڵبژاردنی ئەو پێناسەیە:

أ– لە سەرچاوەکانی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی هیچ پێناسەیەکی حوکمی شەرعیم نەدۆزییەوە و کە وشەی ڕاسپێردراو یان ڕاسپێردراوانی (المکلف أو المکلفین)ی تێدا نەبێت و باسی ڕووداوەکان بکات کە بریتین لە کرۆکی حوکمی شەرعی سەرەڕای ئەوەی زۆر جار ئەو ڕووداوانە لە ئەنجامی کردەوەی ڕاسپێردراوان ناهێنەدەی.

ب- هەندێك لە زانایانی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی (اصول الفقه الاسلامي[1])
حوکمی شەرعی بە حوکمی شەرعی تەکلیفی واتا راسپاردن دادەنێن و دواتر دابەشی دەکەن بەسەر حوکمی شەرعی (تەکلیفی) و حوکمی شەرعی (وەضعي) لەگەڵ ئەوەی دوو بەشی جیاوازن وەکو ئەوە وایە شتێك بۆ خۆی و بۆ جگە لە خۆی دابەش بکرێت کە ئەوەش لە رووی عەقڵ و مەتنیق رەتدەکرێتەوە.

ج- پیاوانی یاسا رووداو و رەفتارە کردارییەکانی بە مەبەستی مرۆڤیان تێکەڵکردووە ئەو رەفتارەیان بە رووداو داناوە لەگەڵ ئەوەی ئەو رووداوانە سەرەڕای ئەوەی بە ویستی مرۆڤ یان بەبێ ویستی مرۆڤ روودەدەن بەڵام لە رووی شەرع یان یاسا هیچ شوێنەوارێکی شەرعی یان یاساییان لێ ناکەوێتەوە لەگەڵ ئەوەی پیاوانی یاسا تەنها گرێبەست و ویستی یەکلایەنە بە رەفتار دادەنێن و ئەوەش پێچەوانەی مەنتیق و راستییە.

## بەشەکانی حوکمی شەرعی:

لە پێناسەی ناوبراو دەردەکەوێت کەوا حوکمی شەرعی دەکرێتە دوو بەش حوکمی تەکلیفی و حکومی وەضعی و بۆ هەر یەکەیان باسێکی سەربەخۆ تەرخان دەکەین.

[1] - کإبن السبکي/ جمع الجوامع.

## باسی یەکەم:
## حوکمی شەرعی سەپێندراو
# الحكم الشرعي التكليفي

بریتیە لە پەیامی خودای گەورەی پەیوەست بە رەفتاری راسپێدراوان بە شێوەی پێویستکردن یان سەرپشکردن.

**راسپێردراو – المكلف**: بریتیە لەو مرۆڤەی کەوا ئەو پێنج مەرجەی تیادایە: (پێگەیشتن – بالیغبوون – ژیری و زانیاری لەسەر ئەوەی پێی راسپێردراوە و توانای ئەنجامدانی ئەو راسپاردەیەی هەبێت کە لە سەری پێویستکراوە، و سەرپشك بێت).

ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەهاتەدی فەرمانی ئاراستە ناکرێت چونکە خودای گەورە فەرموویەتی: (لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا) واتا: خودای گەورە ئەرك لە سەر کەسێك پێویست ناکات تەنها مەگەر لە توانایدا نەبێت و پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (خودای گەورە هەڵە و لەبیرچوون و زۆرلێکردن لە ئومەتی من ناگرێت) و فەرموویەتی: (سێ کەس بەرپرسیار نین: نوستوو تاکو بە ئاگا دێتەوە، و شێت تاکو بەخۆ دێتەوە، و منداڵ تاکو گەورە دەبێت – یان بالیغ دەبێت)[1].

## جۆرەکانی حوکمی راسپێردراو:

حوکمی شەرعی راسپێردراو دەکرێتە پێنج جۆر چوار جۆریان لە ژێر دەستەواژەی (پێویستکردن – الاقتضاء)دا کۆبوونەتەوە و پێنجەمیان لە ژێر دەستەواژەی (سەرپشکی – التخيير)دایە کە بریتیە لە حەلال (الاباحة) بەپێی ئەو روونکردنەوەیە:

---

[1] – صحيح البخاري.

١– پێویستکردن (الایجاب): بریتیە لە داواکردنی کردەوەیەك بەشێوەی پێویستکردن و داواکردن خەسڵەتی خودای گەورەیە و ئەو شوێنەوارەی لێی دەکەوێتەوە بریتیە لە واجب (حوکمی فیقهی) کە بریتیە لە کردەوەی داواکراو و داواکراو واجبە و بەوجۆرە پێناسە دەکرێت کە بریتیە لە داواکردنی شتێك بە شێوەی پێویستکردن و ئەنجام دەرەکەی لە دونیادا شیاوی رێزە و لە دوارۆژیشدا شیاوی پاداشتە.

ئەو کەسەی ئەنجامی نەدات دووچارەی سەرکۆنە و سزادان دەبێتەوە و ئەنجام نەدانی بریتیە لە تاوانی نەرێنی چونکە کۆڵەگەی ماددی کردەوەی نەرێنی بریتیە لە بەجێ نەگەیاندنی واجب[١].

**واجب و فەرض:**

بەڕای جمهوری زانایانی فیقهی و بنەماکانی فیقهی دوو دەستەواژەی هاوواتان چونکە مەبەست لە هەر یەکێك لەو دوو دەستەواژەیە بریتیە لە داواکردنی کردەوەیەك بە شێوەی پێویستکردن یەکسانە کردەوەکە بە بەڵگەی گومانی (ظني) وەکو فەرموودەی ئاحاد سەلمێندرا بێت یان بە بەڵگەی بنبڕ سەلمێندرا بێت وەکو یەکێك لە ئایەتەکانی قورئان، و هەندێك – وەکو حەنەفی – دەڵێن: فەرض بریتیە لەوەی کە بە بەڵگەی بنبڕ سەلمێندراوە وەکو زەکاتدان و فەرمانکردن بە چاکە و هاوکاریکردن لە سەر چاکە و خۆپاراستن لە تاوان و هتد، و واجب بریتیە لەوەی بە بەڵگەی گومانی سەلمێندراوە وەکو زەکاتی سەرفیترە و قوربانی و هاوشێوی ئەوانە.

بۆچوونی جمهور گونجاو ترە چونکە لە هەردوو حاڵەتەکە بریتیە لە داواکردنی

---

[١] – بەو جۆرە جیاوازی نێوان (الایجاب و الوجوب و الواجب) دەردەکەوێت و یەکەم بریتیە لە حوکمێکی ئوصولی خەسڵەتی خودای گەورە و دووەم حوکمێکی فیقهیە و خەسڵەتی رەفتاری مرۆڤی راسپێرپێراوە و سێیەم کردەوەی داواکراوە کە بریتیە لە خەسڵەتی مرۆڤی راسپێردراو و گشت جۆرەکانی حوکمی راسپێدراو بەوجۆرەن.

کردەوەیەك بەشێوەی پێویستکردن و یەکسانە خودی کردەوەی داواکراو واجب بێت یان شتێکی تر واجب بکات[1].

٢- **سونەت – الاستحباب**: بریتیە لە داواکردنی کردەوەیەك بەشێوەی باشترین واتا ئەنجامدانی باشترە و بریتیە لە خەسڵەتی خودای گەورەیە و شوێنەوارەکەشی بریتیە لە سونەت کە بە رێگەی رەفتارەکانی مرۆڤ ئەنجام دەدرێت و کردەوەی داواکراو پێی دەگوترێت: (مندوب، مستحب، سنة، نفل).

٣- **قەدەغەکردن (التحریم)**: بریتیە لەوەی کە خودای گەورە داوای ئەنجام نەدانی کردەوەیەك دەکات بە شێوەی پێویست و شوێنەواری قەدەغەکردنەکەش بریتیە لە حەرامکردن کەوا خەسڵەتی خودای گەورەیە و دووەم بریتیە لە خەسڵەتی رەفتاری ناڕەوای مرۆڤ، و کردەوەی داواکراو بریتیە لە قەدەغەکردن و کاری قەدەغەکراو پێی دەگوترێت حەرام، و ئەنجامدەرەکەی شیاوی سەرکۆنە و سزادانە و ئەنجام نەدانیشی بە نیازی بەجێ گەیاندنی فەرمانی خودا شیاوی رێز و پاداشتە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً﴾الإسراء/٣٢. واتا: نزیکی زینا نەبنەوە چونکە زینا کارێکی ناڕەوا و قێزەونە و خراپترین رێگایە.

حەرام و وەکو واجب هەندێك جار خودی کردەوەکە حەرامە وەکو تاوانی زینا و هەندێك جار لەبەر کردەوەیەکی تر حەرامە وەکو داخوازیکردنی ئافرەت لە سەر

---

[1] – هەندێك – وەکو خاوەنی جمع و الجوامع – ١/٨٨، پێیان وایە جیاوازییەکە زارەکییە و ئەوە راست نییە چونکە جیاوازی زارەکی نابێتە هۆی بیروڕای جیاواز لە کاتێکا ئەو جیاوازییە بووەتە هۆی جیاوازی نێوان حەنەفی و شافیعی لە هەندێك مەسەلەی فیقهی لەوانە نوێژ بەبێ خوێندنی سورەتی فاتیحە لەگەڵ ئەوەی توانای خوێندنی هەبێت بە رای شافیعی بەتاڵە و بە رای حەنەفی دروستە ئەگەر بە قەد سورتی فاتیحە چەند ئایەتێکی تری قورئان بخوێنێت هەروەکو ئاشکرایە کە خوێندنی سورەتی فاتیحە لە نوێژدا بە بەڵگەی گومانای سەلمێندراوە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) ئەو نوێژە دروست نییە کە فاتیحەی تیادا نەبێت. موسلیم گێراویەتەوە ٤/٣٤٣ کتاب الصلاة وجوب قراأة الفاتحة بشرح النووي.

داخوازی کەسێکی تر.

٤- **بەناپەسند دانان (الاستكراه)**؛ بریتیە لە داواکردنی ئەنجام نەدانی کردەوەیەك بەشێوەی باشترین واتا باشتروایە ئەنجام نەدرێت وەکو خۆهەڵقورتاندن لە کاری کەسانی تر بەبێ پاساو کە داواکردنی ئەنجام نەدان بریتیە لە خەسڵەتی خودای گەورە و شوێنەواری ئەو داواکردنەش پێی دەگوترێت کراهیە کە خەسڵەتی رەفتاری مرۆڤە و کردەوەی داوای ئەنجام نەدانی کراوە پێی دەگوترێت مەکروە.

٥- **رێگە پێدان (الاستباحة)**: بریتیە لەوەی کە خودای گەورە مرۆڤی سەرپشك کردووە لە نێوان ئەنجام دان و ئەنجام نەدانی کارێك کەواتە ئەنجام دان و ئەنجام نەدانی یەکسانە بەبێ ئەوەی مرۆڤ دووچاری سەرکۆنە یان مەدح یان پاداشت یان سزا ببێتەوە هەروەکو فەرموودەی خودای گەورە ﴿الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ ....﴾المائدة/٥. واتا: شتی پاك بۆ ئێوە حەلال کراوە و خواردنی خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان بۆ ئێوە حەلالە و خواردنی ئێوەش بۆ ئەوان حەلالە.

شایەنی باسە زانایانی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی ئەدب وەکو خەسڵەتی خودای گەورە و خەسڵەتی کردەوەی مرۆڤیان بەکارهێناوە و هەروەها بە هەمان شێوە سەبارەت بە کراهیە و ئیباحە و ئەوەش پێچەوانەی مەنتی راست و دروستە بۆیە دەستەواژەی (الاستحباب)مان بۆ خەسڵەتی خودای گەورە بەکار هێناوە و (المستحب) بریتیە لە خەسڵەتی کردەوەی مرۆڤ، و (الاستكراه) بۆ خەسڵەتی خودای گەورە و (الكراهية) بۆ خەسڵەتی کردەوەی مرۆڤ، و (الاستباحة) بۆ خەسڵەتی خودای گەورە و (الاباحة) بۆ خەسڵەتی کردەوەی مرۆڤ[1].

---

[1] – شایەنی باسە هەندێك لە زانایانی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی وەکو ئیمامی غەزالی (رەحمەتی خودای لێ بێت) لە کتێبەکەی بە ناوی (المستصفى) مكتبة الجندي، مصر١٩٧٠، ل٨٠، دەڵێت: ئەحکامە شەرعییەکانی تەکلیفی پێنجن و بریتین لە الواجب و المندوب و المحرم و المكروه و المباح، لەگەڵ ئەوەی ئەوانە چەند کارێکن بە حوکمێکی شەرعی تەکلیفی سەلمێندراون بۆ ←

# باسی دووەم:
# حوکمی شەرعی دانراو
# الحكم الشرعي الوضعي

بریتیە لە پەیامی خودای گەورەی پەیوەست بە رەفتارەکانی مرۆڤ یان پەیوەست بە رووداوە شەرعییەکان بە شێوەی دانان واتا دانانی شتێك بە هۆکاری یان مەرجی یان بەربەستی شتێك.

## ١- هۆکار (السبب):

لە رووی زمانەوانی بریتیە لەوەی کە دەکرێت بە هۆیەوە بە ئامانج بگەیت بۆیە بە رێگا دەگوترێت هۆکار.

لە زاراوەی زانایانی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی: خەسڵەتێکی بەرچاوی چەسپاوە[١] و خودای گەورە بە هۆیەوە حوکمێك دێنێتە کایەوە کە بوون و نەبوونی حوکمەکە بەندە بە بوون و نەبوونی هۆکار وەکو خزمایەتی هۆکارە بۆ میراتگرتن و کوشتنی بە ئەنقەست هۆکارە بۆ قیصاص و هتد ...

---

نموونە واجب بریتیە لە کردەوە و حوکمی سەلماندنی واجب بریتیە وجوب، و مکروە بریتیە لە کردەوە و ئەو حوکمە تەکلیفییەی سەماندویەتی بریتیە لە کراهیە و لە تەواوی جۆرەکانی حوکمی تەکلیفی بەو جۆرەیە و کردەوەکە و حوکمەکە تێکەڵکراون.

[١] – واتا بەپێی کات و شوێن ناگۆرێت.

### هۆکار و عیللەت:

زانایانی بنەماکان دەربارەی پەیوەندی نێوان هۆکار و عیللەت بیروڕای جیاوازییان هەیە:

أ– هەندێکیان دەڵێن: هەردووکیان هاوواتان.

ب– هەندێکیان دەڵێن: عیلەت هاوبەشی هۆکارە لە سەر ئەو بنچینەیەی کەوا عیللەت یەکێکە لە جۆرەکانی حوکمی دانراو.

ج– هەندێکی تر دەڵێن: عیللەت تایبەت تر و رەهاترە لە هۆکار کەواتە گشت عیللەتێك هۆکارە بەڵام گشت هۆکارێك عیللەت نییە چونکە ئەگەر مرۆڤ هەستی بە پەیوەندی نێوان هۆکار و ئەنجامدەر (المسبب) کرد وەکو کوشتن کە هۆکاری قیصاصە[1] و لەناوبردن کە هۆکاری قەرەبووکردنەوەیە لەو حالەتە هۆکار عیللەتە بەڵام ئەگەر عەقلی مرۆڤ هەست بە حیکمەت و پەیوەندی نێوان هۆکار و موسەبیب نەکات وەکو لادانی خۆر کە بریتیە لە هۆکاری واجب بوونی نوێژی نیوەڕۆ لەو حالەتە هۆکار عیللەت نییە.

د– ئەو بۆچوونەی کەوا ئێمە هەڵی دەبژێرین ئەوەیە کە عیللەت لە رووی راستەقینە و ناوەڕۆك جیاوازە لەگەڵ هۆکار چونکە عیللەت لە روحی شەریعەتی ئیسلامی بریتیە لە ئامانجی پیادەکردنی حوکمی شەرعی و حیکمەتی دانانی حوکمی شەرعی و ئەو ئامانجە (یان مەبەست) بریتیە لە دەرەنجامی پیادەکردنی ئەحکامەکانی خودای گەورە هەروەکو داواکراوە و ئەو دەرەنجامە بریتیە لە هێنانەدی بەرژەوەندی خەڵکی و دوورخستنەوەی خراپە لە خەڵکی بۆ نموونە هۆکاری پێویست بوونی قیصاص بریتیە لە کوشتنی بە ئەنقەستی دوژمنکاری و عیللەتی قیصاص بریتیە لە پارێزگاریکردن لە گیان و سەلامەتی کەسانی بێتاوان، و هۆکاری پێویست

---

[1] – کوشتن بریتیە لە (هۆکار – السبب) و بکوژەکەش بریتیە لە (مسبِب، بکسر ما قبل الاخیر) و قصاصەکەش بریتیە لە (مسبَب، بفتح ما قبل الاخیر).

بوونی قامچی (جەلد) بریتیە لە زینا و عیللەتی جەلد بریتیە لە پاراستنی ناموس و نەوەکان، و هۆکاری پێویست بوونی دەست برین بریتیە لە دزی و عیللەتی دەست برین بریتیە لە پاراستنی سامانی خەڵکی و بەوجۆرە و بەپێی وتەکانی هەندێك لە فەیلەسوفەکانی مسولمان وەکو (موعتەزیلە) و جگە لە فەیلەسوفەکانی مسولمان ئەوەیە واتای عیللەت (عیللەتی ئەحکامەکانی خودای گەورە بریتیە لە ئامانج).

هەندێکی تر پێچەوانەی ئەوانەن وەکو ئەشاعیرە – دەڵێن: ئەو وتەیە راست نییە چونکە واتای کەم و کوڕی شارع[1] و پێویستی بە دانانی ئەحکامەکان دەگەیەنێت، بەڵام ئەوە گومانێکی ورد و دەقیق نییە چونکە ئامانجەکان و عیللەتەکان و حوکم و دەرەنجامەکان و بەرژەوەندییەکانی دانان و پیادەکانی ئەحکامەکان تەنها پەیوەستن بە کەسانی راسپێردراو بە جێبەجێکردنی ئەو ئەحکامانە نەك دانان و فەرمانکردن بە پیادەکردنیان.

## ٢- مەرج (الشرط):

مەرج لە رووی زمانەوانی بریتیە لە نیشانە، وەکو فەموودەی خودای گەورە ﴿فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا السَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً فَقَدْ جَاء أَشْرَاطُهَا فَأَنَّى لَهُمْ إِذَا جَاءتْهُمْ ذِكْرَاهُمْ﴾محمد/١٨. واتا: ئایا ئەوان چاوەڕوانی چی دەکەن جگە لە قیامەت کە لە ناکاو بێت بەسەریانا چونکە بە راستی هەندێك لە نیشانەکانی هاتوونەتەدی.

لە زاراوەی شەرعی یان یاسایی بریتیە لەو شتەی کە بوون یان خەسڵەتی شتێکی پێیەوە بەندە بەبێ ئەوەی بەشێك بێت لە خودی شتەکە بە جۆرێك کە نەبوونی مەرج دەبێتە هۆی نەبوونی شتەکە بەڵام بوونی مەرج نابێتە هۆی بوونی شتەکە بۆ نموونە ئامادە بوونی دوو شاهێد لە گرێبەستی مارەبڕین نابێتە هۆی تەواوبوونی مارەبڕین

---

[1] – لێرەدا مەبەست لە یاسادانەر – شارع – خودای گەورەیە.

بەڵام نەبوونی دوو شاهێد لەلای جمهوری زانایانی فیقهی دەبێتە هۆی تەواو نەبوونی گرێبەستی مارەبڕین[1].

**جۆرەکانی مەرج لە ڕووی سەرچاوەکەی:**

**أ- مەرجی شەرعی:** بریتیە لە خەسڵەتێکی ئاشکرای چەسپاو کەوا یاسادانەر بوونی بۆ گرێدانی – چەسپانی – یان دروست بوونی[2] یان بەکاربوونی[3] یان سەپێندراوی[4] ڕەفتارێك بە پێویست داناوە.

**ب- مەرجی عەقلی:** بریتیە لەو مەرجەی کەوا بەپێی عەقڵ بوونی شتێکی پێیەوە بەندە وەکو ژیان مەرجی زانستە.

**ج- مەرجی نەریتی (عادەتی):** بریتیە لەو مەرجەی کەوا عادەتەن بوونی شتێکی پێیەوە بەندە وەکو دروستکردنی قادرمە (پەیکانە) مەرجە بۆ سەرکەوتنە سەربان.

**د- مەرجی یاسایی:** بریتیە لەو مەرجەی کەوا سەرچاوەکەی بریتیە لە یاسا وەکو مەرجی یاسایی بۆ دامەزراندنی فەرمانبەر لە فەرمانگەکان و وەرگرتنی قوتابی لە کۆلێژەکان.

**هـ- مەرجی دانراو یان مەرجی زارەکی:** بریتیە لەو مەرجەی کەوا سەرچاوەکەی بریتیە لە ویستی لایەنەکانی گرێبەست و بریتیە لە ڕستەیەکی مەرجی کە بە یەکێك لە ئامرازەکانی مەرج دەست پێ دەکات وەکو مەرجی دانانی خەرجییەکانی تەسلیمکردنی فرۆشراو لەسەر فرۆشیار[5].

---

[1] – بەڵام لەلای شیعەی ئیمامی مەرج نییە بۆ دروست بوونی مارەبڕین.

[2] – وەکو نیەت لە دەست نوێژ مەرجێکە بۆ دروست بوونی نوێژ.

[3] – بۆ نموونە تەواو بوونی شیاوی – ئەهلیە –ی مرۆڤ مەرجە بۆ بەکاربوونی ڕەفتارەکانی مرۆڤ.

[4] – وەکو نەبوونی عەیبێکی شاراوە لە شتی فرۆشراو مەرجە بۆ پێویست بوونی گرێبەستی فرۆشتن.

[5] – بۆ درێژەی مەرج و جۆرەکانی مەرج بڕوانە کتێبەکەمان (اصول الفقه في نسيجه الجديد ج٢)،ل٢٧٤ و لاپەڕەکانی دواتر.

٣- **بەربەست (المانع)**: لە رووی زمانەوانی بریتیە لە ئاستەنگ و ئەو شتەی قەدەغەت دەکات لە ئەنجامدانی کارێك و لە زاراوەی زانایانی بنەماکانی فیقهی خەسڵەتێکی ئیرادیە[١] ئەگەر لەگەڵ هۆکاری حوکم کۆبوویەوە کاریگەری حوکمەکە پووچەڵ دەکاتەوە و دەیکاتە هۆکارێکی شێوەیی، یان دەبێتە رێگر لەبەردەم ئەوەی حوکمی لێ بکەوێتەوە لەگەڵ ئەوەی وەکو هۆکارێکی راستەقینە دەمێنێتەوە.

بەربەست لە چەندین روویەکەوە دەکرێتە چەند جۆرێکی جیاواز لەوانە:

أ- **بەربەستی حوکم**: هەندێك جار هۆکاری شەرعی دەهێتەدی و مەرجەکانیشی دەهێنەدی بەلام حوکمی لێ ناکەوێتەوە چونکە بەربەستێك هەیە بەپێی ئەو رێسایەی دەڵێت: (ئەگەر بەربەست و پێویستی (مقتضي) تێکگیران بەربەست بەپێش دەکەوێت) وەکو کوشتن بەربەستە لە بەردەم میراتگرتن هەرچەندە هۆکارەکەی هاتۆتەدی کە بریتیە لە خزمایەتی و هاوسەرگیری.

ب- **بەربەستی هۆکار**: بریتیە لەو بەربەستەی کەوا هۆکارەکە لە بنەڕەتدا هەڵدەوەشێنێتەوە بەجۆرێك کە دەیکاتە هۆکارێکی شێوەیی وەکو قەرز بە بۆچوونی هەندێك لە زانایانی فیقهی بەربەستە بۆ واجب بوونی زەکات هەرچەندە بگاتە ئاستی زەکات چونکە ئەگەر کەسێك یەك ملیۆن دیناری هەبێت و یەك ملیۆن دیناریش قەرزدار بێت زەکاتی لەسەر نییە[٢].

---

[١]– بەربەستی ئیرادی وەکو ئەوەیە کەوا میراتگر بە ویستی خۆی میرتلێگراوەکەی بکوژێت دەبێتە بەربەست لەبەردەم ئەوەی میراتی لێ بگرێت.

[٢]– بۆ درێژەی بەربەستەکان بڕوانە کتێبەکەمان (اصول الفقه في نسيجه الجديد ج٢)،ل٢٥٥ و لاپەڕەکانی دواتر.

# وانەی سێیەم

# سەرچاوە ڕوونکەرەوەکانی (دەرخستنی) ئەحکامەکانی شەریعەت

## المصادر الكاشفة للاحكام الشرعية

پێشتر لە بەشی یەکەم باسی ئەوەمان کرد کەوا قورئانی پیرۆز دەستوری خودای گەورەیە و هەمیشەییە و دەستورە ئاسمانییەکانی پێشووی هەموارکردووە و ئەو ئەحکامانەی پاراستوون کەوا بەپێی سەردەم و شوێن ناگۆڕێن و چەند ئەحکامێکی نوێی زیادکرووە کە لەگەڵ گەشەکردنی عەقڵی مرۆڤایەتی دەگونجێن.

قورئانی پیرۆز بازنەی ئەخلاقی دروست کردووە و لە زیاتر لە پەنجا ئایەتی قورئان فەرمان بە عەقڵی مرۆڤایەتی دەکات بۆ ئەوەی بجولێت و لە گشت کات و سەردەمێك و بەپێی پێویستی و خواستەکانی ژیان ئەحکامە لاوەکییەکان لە ئەحکامە گشتییەکان وەربگرێت بە مەرجێك لە بازنەی ئەخلاق دەرنەچێت و بەوجۆرە

قورئان ئاگادارمان دەکاتەوە کەوا عەقل و نەقل[1] تەواوکەری یەکترن و نەقل بەبێ عەقڵ پاڵ بە مرۆڤەوە نانێت کەوا ئەحکامە لاوەکییەکان بە شێوەیەکی راستەقینە لە ئەحکامە گشتییەکان وەربگرێت، و هەروەها عەقڵ بە تەنها ناتوانێت پایەمەکەی بە شێوەیەکی تەواو بەجێ بگەیەنێت.

لەبەرئەوە و بەڵکو لەبەر زیاتر لەمە زانایانی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی و زانایانی فیقهی چەند رێگایەکیان داناوە کە یارمەتی موجتەهید و موفتی و دادوەر دەدەن بۆ ئەوەی لە ئەحکامە لاوەکییەکان و شتە نوێیەکان بگەڕێنەوە بۆ گشتییەکان کە سەرچاوەیان بریتیە لە نیگای خودای گەورە و هەڵەیان تیادا نییە و گشت وشکایەتی و داخراوییەکی عەقڵی مرۆڤ و پابەند بوون بە مەزهەبێکی دیاریکراو رەتدەکەنەوە.

گرنگترین رێگاکانی دەرخستن (روونکردنەوە) کە زانایانی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی پێی دەڵێن: (سەرچاوە پاشکۆییەکان — المصادر التبعية): بریتین لە ئیجماع و عورف و پێشینەی دادوەری خەلیفەکانی راشیدین و زانایانی یاوەری پێغەمبەر ﷺ کە پێی دەگوترێت (واتەی یاوەران — قول الصحابي)، و شەریعەتی نەتەوەکانی پێش ئێمە، ئەو چوار رێگایە (یان سەرچاوەکانی دەرخستنی ئەحکامەکانی خودای گەورە) سەرچاوەی گوازراوەن چونکە لە ئەوەی پێشوو گوازراونەتەوە بۆ ئەوەی دواتر بەوجۆرە و لە باسێکی سەربەخۆ باسییان دەکەین.

سەرەڕای ئەو سەرچاوە گوزراوانە پێنج سەرچاوەی عەقڵی هەن کە بریتین لە: القياس و الاستحسان و المصلحة و سد الذرائع و الاستصحاب: و لە باسی دووەم باسییان دەکەین.

---

[1] — واتە ئایەتەکان و فەرموودەکان و ئیجماع و عورف و پێشینەی دادوەری خولەفەکانی راشیدین و زانایانی ئەصحابە کە پێی دەگوترێت (واتەی یاوەران — قول الصحابي)، و شەریعەتی ئوممەتەکانی پێش ئێمە.

# باسی یەکەم:
# سەرچاوەکانی دەرخستنی گوازراوە
# المصادر الكاشفة النقلية

لەو باسە بە کورتی و بەپێی ئەو ریزبەندەی باسمانکرد باسییان دەکەین:

## یەکەم: کۆدەنگی زانایان - الاجماع:

لە زمانەوانی بریتیە لە رێککەوتن بە گشتی، و لە زاراوەی زانایانی شەرع ناس بریتیە لە رێککەوتنی گشت موجتەهیدەکانی ئوممەتی محمد لە یەکێك لەسەردەمەکان لەسەر حوکمێکی شەرعی پاڵشت بە بەڵگەیەکی شەرعی.

لەو پێناسەیە دەردەکەوێت کەوا لێکدانەوەی شەرعی بەندە بە هاتنەدی شەش رەگەز و بریتین لە:

١- شایستەیی بۆ ئیجتهاد و بۆ هاتنەدی ئەو شایستەییە پێویستە ئەو هەر سێ رەگەزەی خوارەوە بهێنەدی:

أ- تێگەیشتن لە روح و ناوەڕۆك و ئامانجەکانی شەریعەتی ئیسلامی.

ب- تێگەیشتن لە روح و ناوەڕۆك و خواستەکانی ژیان.

ج- تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی پەیوەندی نێوان ژیان و شەریعەتی ئیسلامی.

هەر کەسێك ئەو رەگەزانەی تیادا بێت شایستەی ئیجتیهادە یەکسانە پیاو بێت یان ئافرەت و دادپەروەر بێت یان فاسیق.

رێککەوتنی بە کۆمەڵی مەجتەهیدەکانی ئومەتی پێغەمبەرﷺ تەنها لە سەردەمی یاوەران بووە پێش ئەوەی بە سەر ناوچە ئیسلامییەکان بڵاوببنەوە و ئیجماع یان

بریتیە لە ئیجماعی روون و ئاشكرا و راشكاوانە ئەگەر گشتییان بە وتە یان بە كردار یان بە بڕیاری دادوەری لەسەری رێككەوتبن و یان بریتیە لە ئیجماعی بێدەنگی (السكوتي) ئەگەر هەندێكیان فەتوا لەسەر بابەتێك بدەن ئەوانی تریش بێدەنگ بن بەبێ ئەوەی بە ئاشكرا یان بە نهێنی لە دژی بوەستن وەكو بڕیاردانی ئیمامی عومەرﷺ بە راگرتنی بەشی (المؤلفة قلوبهم – واتا: ئەوانەی بۆ راكێشانی دڵیان بۆلای ئیسلام سامانیان پێدەدرا) و تەواوی یاوەران لەو بڕیارە بێدەنگ بوون و بۆچوونی پێچەوانیان نەبوو.

٢– دەبێت گشت موجتەهیدەكان لە ئوممەتی محمدی پێغەمبەرﷺ بن.

٣– دەبێت رێككەوتنەكە بە وتە یان بە كردار یان بە بڕیاری دادوەری روون بێت دوای تێگەیشتن لە بابەتەكە.

٤– دەبێت رێككەوتن لە دوای سەردەمی پێغەمبەرﷺ بێت چونكە ئەگەر پێغەمبەریانﷺ لەگەڵدا بێت سەرچاوەی حوكم فەرموودەی پێغەمبەرەﷺ نەك ئیجماع.

٥– دەبێت حوكمێكی شەرعی بێت یەكسانە ئاینی بێت یان دونیایی.

٦– دەبێت ئیجماع بەڵگەیەكی شەرعی هەبێت ئەو بەڵگەیە یان بریتیە لە ئایەتی قورئان یان فەرموودەی ﷺ یان بەرژەوەندییەكی شەرعی.

شایەنی باسە لە كاتی بوونی دەقی شەرعی لەسەر حوكمی داواكراو بە شێوەی بنبڕ پەنا بۆ ئیجماع نابردرێت بەڵام ئەگەر دەقەكە زیاتر لە یەك واتا بگەیەنێت یان دەقێكی گومانی بێت بەجۆرێك: كە فەرموودەیەكی ئاحاد بێت لێرەدا سوودی ئیجماع بریتیە لە دیاریكردنی واتای مەبەست لە دەقی گومانی و دەقی گومانی دەكاتە دەقێكی بنبڕ وەكو ئیجماعی (ئیمامی عەلیﷺ) لەسەر یەك لەسەر شەشی بەشی داپیرە پاڵپشت بە وتەی پێغەمبەرﷺ كە دەفەرمووێت: (یەك لەسەر شەش بە داپیرە بدەن).

به بەڵگەدانانی ئیجماع:

١- بە بۆچوونی گشت زانایانی ئیسلام ئیجماعی روون و راشکاوانە بەلگەیەکی بنبڕە.

٢- ئیجماعی بێدەگی بەلگەیەکی گومانییە.

بە بۆچوونی ئێمە رێککەوتنی زۆرینە لە هەردوو کۆمەڵەکە بەلگەیە و پێویستە کاری پێ بکرێت.

## دووەم: داب و نەریت (العرف):

لە زاراوەی شەرع ناسان بریتیە لەو کردەوەیە یان وتەیەی کەوا چەندین جار بەکارهێنراوە تاکو خەسڵەتی بەردەوامی لە دەروونداا وەرگرتووە و لە رووی عەقڵ و رەچاوکردن لە رەفتارە شەرعی و یاساییەکان قەبولکراوە[1].

رەگەزەکانی عورف (ماددی و مەعنەوی):

١- رەگەزی ماددی: بریتیە لەو کردەوەیە یان وتەیەی کە بە شێوەیەکی دووبارە بەکارهاتووە.

٢- رەگەزی مەعنەوی (دەروونی): بریتیە لە خەسڵەتی قەبولکردن و رێزگرتن و پابەند بوون پێیەوە ئەو دوو رەگەزە لە کۆڵەگەکانن بەڵام مەرجەکانی کارپێکردنی بریتین لە:

١- دەبێت عورفێکی راست و دروست بێت واتا پێچەوانەی بەلگەیەکی شەرعی و رێسایەکی بنچینەیی نەبێت.

---

[1] - ئەو پێناسەیە پێشنیاری ئێمەیە لە کتێبەکەمان (اصول الفقه في نسیجه الجدید).

٢- دەبێت گشتی و بەردەوام بێت کەواتە ئەگەر بەردەوام نەبێت بەجۆرێك کەوا لە هەندێك حالەت پیادە بکرێت و لە هەندێك حالەتی تر پیادە نەکرێت ناگونجێت بۆ ئەوەی ببێتە سەرچاوەی دەرخستنی حوکم.

٣- دەبێت پێش ئەو رووداوە هەبوو بێت کە لەسەری پیادە دەکرێت و حوکمی لەسەر دادەمەزرێت.

٤- دەبێت لە ئەحکامە گشتییەکان گشتی بێت و لە ئەحکامە تایبەتییەکان تایبەتی بێت.

٥- لایەنەکانی پەیوەندییەکە رێك نەکەوت بن لەسەر کارکردن بە پێچەوانەی عورفی باو ئەگەرنا کار بە رێککەوتن دەکرێت نەك بە عورف.

**جۆرەکانی عورف:**

عورف لە چەند رووێکی جیاجیا دەکرێتە چەندین جۆر لەوانە:

أ- لە رووی سنور - چوارچێوە - بریتیە لە عورفی گشتی و تایبەتی:

١- **عورفی گشتی:** بریتیە لەو عورفەی کەوا تایبەت نییە بە هەرێمێك و دەوڵەتێك وەکو داب و نەریتە نێودەوڵەتییەکان کە لە گشت دەوڵەتان کارییان پێدەکرێت وەکو خۆهەڵنەقورتانی هەر دەوڵەتێك لە کاروباری دەوڵەتێکی تر چونکە زیان بە سەروەری وڵاتان دەگەیەنێت.

٢- **عورفی تایبەتی:** بریتیە لەو عورفەی کەوا تایبەتە بە هەرێمێك یان چەند هەرێمێکی دیاریکراو وەکو جلی کوردی و عەرەبی و دانی بەشێك لە مارەیی و دواخستنی بەشەکەی تر - مارەیی پێشەکی و مارەیی پاشەکی.

**ب- لە رووی سوود و زیان بریتیە لە عورفی راست و عورفی ناتەواو:**

١- عورفی راست و دروست (العرف الصحيح): بریتیە لەو عورفەی پێچەوانەی سیستەمی گشتی و ئاکارە گشتییەکان نییە وەکو فرۆشتنی کاڵاکان بە قیست و

گرەنتـی کۆمپانیاکـان بـۆ سـەلامەتی کاڵاکـان یـان شـت و مەکـە فرۆشـراوەکان بـۆ ماوەیەکی دیاریکراو.

٢- عورفی ناتەواو - خراپ (العرف الفاسد): بریتیە لەو عورفەی کـەوا پێچـەوانەی سیستەمی گشتی یان ئاکارە گشتییەکان بێت وەکو خـۆ دەرخسـتنی ئافرەتـان لـەو سەردەمە و خۆڕازاندنەوەیان بە شێوەی سەردەمی نەفامی.

ج- لە رووی سروشتی بریتیە لە عورفی زاراوەیی و عورفی کرداری:

١- عـورفی زاراوەیـی (العـرف اللفظـي): وەکـو داب و نـەریتی عـەرەب بـە دانـانی وشەی (الولد) بۆ کوڕ.

٢- عورفی کرداری (العرف العملي): وەکو دانی.بەشـێك لـە مـارەیی و دواخسـتنی بەشەکەی تر - مارەیی پێشەکی و مارەیی پاشەکی.

**بەڵگەدانانی عورف:**

عورفی راست و دروست بە بەڵگە دادەنرێت بەپێی ئەو بەڵگانەی خوارەوە:

١- قورئانی پیرۆز: قورئانی پیرۆز لە زۆر لە ئایەتەکانی گوزارشتی لە عـورف یـان مەعروف کردووە لەوانە فـەرمووودەی خـودای گـەورە دەربـارەی مـاف و ئەرکـەکانی هاوسەرێتی بەپێی داب و نەریتی باو ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾البقرة/٢٢٨. واتا: ئافرەتان چۆن مافی پیاوانیان لەسەر بە هەمان شێوەی مافیان بەسەر پیاوانەوە هەیە بەپێی داب و نەریت.

واتـا پێویسـتە هـەر یـەکێك لـە ژن و مێـرد ئەرکـەکانی هاوسـەرێتی و مافـەکانی بەرامبەر بەوەی تر بەجێ بگەیەنێت لە ژێر تیشکی داب و نەریتی راسـت و دروسـت و باوی وڵاتەکەیان.

٢- فەرموودەی پێغەمبەرﷺ (ئەوەی باوەڕداران بە باشـی بـزانن لەلایـەن خـودای گەورە باشە و ئەوەی باوەڕداران بە خراپی بزانن لەلایەن خودای گەورە خراپە).

٣- ئیجماع: زانایانی فیقهی و ـ 'وەن عەقڵەکان کۆکن لە سەر ئەوەی کەوا عورفی راست و دروستی باو پێویستە لە رەفتارەکان و ماف و ئەرکەکان رەچاو بکرێت.

٤- عەقڵی تەواو بە پێویست دەزانێت کەوا داب و نەریتە راستەکانی نێودەوڵەتی و ناوخۆیی رەچاو بکرێن و لە سەرپێچی کردنی ئەو داب و نەریتانە سەرپێچیکار دووچاری رەخنە و لۆمە و سەرکۆنە دەبێتەوە و بە ئیهمال و کەمتەرخەم ناو دەبرێت.

## سێیەم: پێشینەکانی دادوەری زانایانی فیقهی یاوەران (خوا لێیان رازی بێت):-

چونکە یاوەران لە قوتابخانەی پێغەمبەرﷺ پێگەیشتوون و شارەزای ئەحکامەکانی قورئان و هۆکارەکانی دابەزینی ئایەتەکانی قورئان بوونە لەگەڵ ئەوەی بە راست و دروستی تێگەیشتوون لە حەلال کردنی ئەو شتەی بۆ تاک یان بۆ کۆمەڵگە یان بۆ هەردووکیان بە سوودە و حەرام کردنی ئەو شتەی بۆ تاک یان بۆ کۆمەڵگە یان بۆ هەردووکیان زیان بەخشە.

لە ژێر تیشکی ئەو تێگەیشتنە راستە فەتوایان داوە و دادوەرییان کردووە و دواتر ئەوە بووەتە سەرچاوەیەکی بەرهەمداری فیقهی زانایانی دوای ئەوان.

بۆ نموونە: ئیمامی عمر (خوا لێی رازی بێت) لە سەردەمی خەلافەتی خۆی بڕیاریدا بە راگرتنی سزای دز ئەگەر بە هۆی پێویستی دزی کرد بێت، و هەروەها عوسمانی کوڕی عەففان (خوا لێی رازی بێت) لەسەردەمی خەلافەتی خۆی بڕیاریدا بە پێدانی میرات بەو ئافرەتەی پیاوەکەی لە نەخۆشی مردن تەلاقی دەدات چونکە تەلاقدانەکەی بە نیازی خراپە کە بریتیە لە بێبەشکردنی هاوسەرەکەی لە میرات.

وەکو بڕیاری یاوەری پایەبەرز عەبدوڵای کوڕی مەسعودﷺ بەوەی کە هەر کەسێك مرد و خێزانی هەبوو بەڵام نەیگواستبوویەوە بۆماڵی هاوسەری و مارەیشی بۆ دیاری نەکردبوو:- میرات لە پیاوەکە دەگرێت و مارەیی هاوشێوەی (مهر المثل) لە میراتی پیاوەکەی دەکەوێت و زانایانی فیقهی ئیسلامی پاش یاوەران کۆکن لەسەر

ئەوەی پێشینەکانی دادوەری و بڕیارەکانی یاوەرانی پێغەمبەرﷺ بەڵگەنە و پێویستە لەسەر دادوەر و موفتی کاریان پێ بکات.

## چوارەم: شەریعەتی نەتەوەکانی پێش ئێمە (شرع من قبلنا):-

واتا هەر شەریعەتێکی ئاسمانی کە پێش پێغەمبەریﷺ ئێمە بۆ پێغەمبەران دابەزیوە وەکو شەریعەتی موسی و عیسا (سەلامی خوایان لەسەر بێت) ئەگەر نەگۆڕدرا بێت.

بەداخەوە دەبنین زانایانی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی بەشێکی زۆر لە کتێبەکانیان تەرخانکردووە بۆ بۆچوونی جیاوازییان دەربارەی بە.بەڵگەدانانی ئەو شەریعەتانە بۆ مسولمانان.

بە بۆچوونی ئێمە بیروڕای جیاواز دەربارەی ئەو سەرچاوەیە بە فیڕۆدانی تەمەن و کات و حوبر و پەڕاوە چونکە مەسەلەکە روون و ئاشکرایە وەکو رووناکی خۆر لە نیوەی رۆژدا دوای ئەوەی قورئانی پیرۆز بۆمان روون دەکاتەوە کەوا شەریعەتی هەر پێغەمبەرێکی پێشوو تایبەتە بە ئوممەتەکەی و ئاین هاوبەشە لە نێوان تەواوی مرۆڤایەتی.

بەجۆرێك کە خودای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرمووێت:

أ- ﴿....لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ....﴾المائدة/٤٨. واتا: هەر یەکێك لە مسولمان و ئوممەتەکانی پێش ئێوە شەریعەت و پرۆگرامی تایبەت بە خۆیانمان بۆ داناون.

ب- دەربارەی گشتییەتی ئاین کە بریتیە لە باوەڕهێنان بە خودا و شتە پەنهانەکان گشت خەڵکی لە گشت کات و شوێنێك هاوبەشن و پێویستە کاری پێ بکەن دەفەرمووێت: ﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ﴾الشوری/١٣. واتا:

ئاینێکم بۆ داناون بەوجۆرەی کە فەرمان کراوە بە نوح و ئەوەی بۆتۆ دابەزیوە و بەو جۆرەی فەرمان کراوە بە ئیبراهیم و موسا و عیسا کەوا رێبازی ئاین بگرنەبەر و لێی لانەدەن، و فەرموویەتی: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾آل عمران/٦٤. واتا: ئەی محمد بڵێ ئەی خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان وەرن بەرەو وشەیەك کە بۆ ئێمە و ئێوە یەکسانە کە بریتیە لە پەرستنی خودای گەورە و هاوبەش بۆ پەیدا نەکردن و هەندێکمان هەندێکی تر نەپەرستین لە جیاتی خودا و ئەگەر لەو بانگەوازە لایاندا بڵێن شاهێدبن ئێمە ملکەچی فەرمانەکانی خودای گەورەین.

دوای ئەو روونکردنەوەیە لە قورئانی پیرۆز دەربارەی جیاکردنەوەی شەریعەتی تایبەت بە هەر پێغەمبەرێك لە ئاینی هاوبەش لە نێوان گشت خەڵکی تاکو ژیان لەسەر هەسارەی زەوی بەردەوام بێت کەواتە جیاوازی بیرورا لەو بارەیەوە لە کتێبەکانی بنەماکانی فیقهی هیچ پێویست ناکات سەرەرای نەگەیشتنیان بە هیچ بەڵگەیەکی باوەرپێکراو، و هۆکاری ئەو جیاکردنەوەیە ئەوەیە کە شەریعەت ژیانی دونیا رێك دەخات و ئاین ژیانی دوارۆژ رێك دەخات، و هەرشتێك سەبارەت بە ئاین لە شەریعتەکانی پێشوو لە قورئانی پیرۆز باسکرا بێت بۆ ئێمە شەریعەتە بەبێ جیاوازی.

## باسی دووەم:
# سەرچاوەکانی دەرخستنی عەقڵی
# المصادر الكاشفة العقلية

گرنگترین سەرچاوە عەقڵییەکان کە سەرچاوەیان عەقڵی مرۆڤە بریتین لە القیاس، و الاستحسان، و المصلحە، سد الذرائع، و المصالح.

### یەکەم: القیاس:

بە بۆچوونی ئێمە پێناسەی راستەقینەی قیاس بریتیە لە گەڕاندنەوەی داهێنراوە لاوەکییەکان بۆ ئەحکامە گشتییەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ ئەوانەی کەوا واتاکەیان مەعقولە (واتا ئەوانەی کەوا عەقڵ هەست بە عیللەت و ئامانج و حوکمەکەیان دەکات).

بەڵام قیاس لە ئەحکامە گشتییەکانی خواپەرستی ناکرێت بۆ نموونە تەرخانکردنی مانگی رەمەزانی پیرۆز بۆ رۆژووگرتن حوکمێکی خواپەرستییە بۆیە ناکرێت رۆژوو لە مانگی رەمەزان بۆ مانگێکی تر بگوازرێتەوە بە رێگەی قیاس.

بەڵام دروستە سوتاندنی سامانی یەتیم قیاس بکەرێتە سەر خواردنی چونکە لە هەر دوو حالەتەکە زیان هەیە و عەقڵی مرۆڤ هەست بە هۆکار و حیکمەتی حەرامکردنی ئەو کارە دەکات کە بریتیە لە پاراستنی مافەکانی یەتیم کە ناتوانێت بە خۆی بەرگری لە سامانەکەی بکات هەروەکو لە فەموودەی خودای گەورە هاتووە ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ

سَعِيرًا﴾النساء/١٠. واتا: بە راستی ئەو کەسانەی سامانی یەتیمان دەخۆن ئەوە تەنها ئاگر دەخەنە ناو سکیان و لە رۆژی دواییدا دەچنە ناو ئاگری دۆزەخ.

زانایانی بنەماکانی فیقهی بەو جۆرە پێناسەی قیاسیان کردووە کە بریتیە لە قیاسکردنی رووداوێك کە دەقی لەسەر نەبێت لەسەر رووداوێك کەوا دەقی لەسەر بێت چونکە هەر دوو رووداوەکە لە عیللەتی حوکمدا هاوبەشن وەکو قیاسکردنی کوشتنی وسیەتکار لەلایەن وەسیەت بۆ کراو، و دیاری بەخش لەلایەن ئەو کەسەی دیاری پێدراوە لەسەر ئەو میراتگرەی میرات لێ گیراوەکەی دەکوژێت بەجۆرێك کە بە هۆی کوشتن یەکەم لە وەسیەتەکە و دووەم لە دیاری و سێیەم لە میرات بێبەش دەبن چونکە عیللەتیان هاوبەشە کە بریتیە لە (هەر کەسێك پەلە لە شتێك بکات پێش ئەوەی پێ بگات ئەوا بە بێبەش بوون لەو شتە سزا دەدرێت) و بەپێی ئەو پێناسەیە کۆڵەگە شەرعییەکانی قیاس چوارن و بریتین لە:

١- قیاس لەسەرکراو: وەکو میراتگری بکوژی میرات لێگیراوەکە.

٢- قیاسکراو: وەکو وەسیەت بۆ کراوی بکوژی وەسیەتکار و دیاری پێدراوی بکوژی دیاری بەخش.

٣- عیللەتی هاوبەش: بریتیە لە پەلەکردن لە بە دەستهێنانی سامان پێش کاتی خۆی.

٤- حوکم: بریتیە لەو بێبەش بوونەی کەوا بە دەقێکی تایبەتی چەسپاوە و گواستنەوەی بۆ قیاسکراو بە رێگەی قیاس.

زانایانی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی لە کتێبەکانیان و توێژینەوەکانیان پانتاییەکانی فراوانیان تەرخانکردووە بۆ خستنەرووی بەڵگەکانی بە بەڵگەدانانی قیاس لەوانەی کەوا قیاس بە بەڵگە دادەنێن وەکو جمهور و ئەوانەی کەوا قیاس رەتدەکەنەوە وەکو شیعەی ئیمامی و زاهیری.

گەورەترین زانای فیقهی کە بریتیە لە (ئیبن قەیمی جوزی - رەحمەتی خودای لەسەر بێت) زیاتر لە ٣٠٠ لاپەڕەی لە کتێبەکەی بە ناوی (اعلام الموقعین)

تەرخانکردووە بۆ خستنەڕووی ئەو بەڵگانە و ئەو هەوڵەی زانایانی فیقهی لەگەڵ ڕێز بۆ پێگەی زانستیان بە بەفیڕۆدانانی تەمەن و کات دادەنرێت کە بۆ هەمیشە قەرەبوو ناکرێنەوە و گشت ئەو باسەش لەسەر بنچینەی ئەوە سەرچاوەی گرتووە کە تێکەڵیان کردووە ئایا قیاس بەڵگەیەکی دەرخستنی حوکمی خودایە یان ئەوەتا بەڵگەیەکی دروستکردنی حوکمە.

چونکە ئەگەر ئێمە قیاس بە بەڵگەیەکی دەرخستنی حوکم دابنێین هیچ پێویست بە بۆچوونی جیاواز دەربارەی بە بەڵگەدانانی ناکات بەڵام ئەگەر بە بەڵگەی دروستکردنی حوکمی دابنێین ئەوا شتێکی روون و ئاشکرایە کە سەرچاوەی ئەحکامە شەرعییەکان بریتیە لە خودای گەورە هەروەکو فەرموویەتی ﴿إن الحكم الا لله﴾ يوسف/٤٠. واتا: داهێنانی حوکم تەنها کاری خودای گەورەیە.

**جۆرەکانی قیاس:-**

قیاس لە رووی بە هێزی و بێ هێزی عیللەتی هاوبەش بریتیە لە قیاسی لە پێشتر و قیاسی یەکسان و قیاسی کەمتر:

١- قیاسی لە پێشتر (القياس الاولى): بریتیە لەو قیاسەی کەوا عیللەتی هاوبەش لە قیاسکراو بە هێزترە لە عیللەتی قیاس لەسەرکراو وەکو قیاسکردنی لێدان لە دایك و باوك لەسەر گوتنی ئۆف بە دایك و باوك کە بەپێی فەرموودەی خودای گەورە قەدەغەکراوە ﴿فَلاَ تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا﴾الإسراء/٢٣. واتا: پێیان مەڵێ ئۆف لە دەستتان و هاواریان بەسەردا مەکە و قسەی جوان و نەرم و نیانیان لەگەڵدا بکە.

عیللەتی هاوبەش لە نێوان قیاسکراو و قیاس لەسەرکراو بریتیە لە ئازاردانی دایك و باوك بە شێوەی ماددی یان مەعنەوی، و ئاشکرایە کەوا ئازاردانی لێدان لە ئازاردانی ئۆف و سەرکۆنەکردن بەهێزترە.

٢- قیاسی یەکسان (القیاس المساوي): بریتیە لەو قیاسەی کەوا عیللەتی هاویەش لە قیاسکراو و قیاس لەسەرکراو یەکسان بێت وەکو قیاسکردنی سوتاندنی سامانی یەتیم لەسەر خواردنی سامانی یەتیم چونکە ئاشکرایە لەهەردوو حالەتەکە زیانەکە لە رووی قەبارە و بڕ یەکسانە.

٣- قیاسی کەمتر (القیاس الادنی): بریتیە لەو قیاسەی کەوا عیللەتی هاویەش لە قیاسکراو بێ هێزتر بێت لە عیللەتی قیاس لەسەرکراو وەکو قیاسی ئەبو حەنیفە (رەحمەتی خودای لێ بێت) سەبارەت بە رێگەدان بەوەی کچی بالیغ و رەشید و ژیر بەبێ مۆڵەتی وەلییەکەی خۆی مارە بکات بە قیاسکردن لەسەر رێگەدان بە دەستکاریکردنی سامانی تایبەتی خۆی وەکو فرۆشتنی ئۆتۆمبێلی تایبەتی خۆی بەبێ مۆڵەتی وەلییەکەی.

ئاشکرایە بابەتی مارەبڕین جیاوازە لەگەڵ بابەتی دەستکاریکردنی سامانی تایبەتی چونکە یەکەمیان پەیوەستە بە ناوبانگی خێزانی کچەکە بەو بەڵگەیەی کە ئیمامی ئەبو حەنیفە (رەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی (بێ ئابروویی دەدرێتە پاڵ) دواتر وەلی مافی پەروەردەکردنی کچەکە و هەر کارێکی لەو جۆرەی هەیە.

## دووەم: بەچاک زانین (الاستحسان):

بریتیە لە جیاکردنەوەی هەندێك جوزئیات لە رێسای گشتی بە مەبەستی رەچاوکردنی بەرژەوەندی یان پێویستی یان داب و نەریتێکی راست و دروست.

چەند نموونەیەکی ئەو سەرچاوەیە:

أ- بەپێی رێسای گشتی یاسای خزمەتی شارستانی یان سەربازی فەرمانبەری حکومی یان کەسی راسپێردراو بە خزمەتێکی گشتی شیاوی پلەی خانەنشینی نییە ئەگەر خزمەتی کرداری کەمتر بێت لە پانزە ساڵ.

بە مەبەستی رەچاوکردنی بەرژەوەندی حالەتێك لەو رێسایە جیاکراوەتەوە کە بریتیە لەوەی ئەگەر کەسێك لە کاتی بەجێ گەیاندنی ئەرکەکەی شەهید ببێت و بۆ

بەرژەوەندی گشتی کار بکات وەکو سوپای میللی سیستەمی پێشووی عیراق و پێشمەرگە لە کوردستانی عیراق.

ب- بەپێی ڕێسای گشتی مارەبڕین ئەگەر کچ تەمەنی هەژدە ساڵی تەواو نەکرد بێت شیاوی مارەبڕین نییە بەڵام لە ڕووی شەرع و یاسا لە سەر بنەمای بە چاکزانین و جیاکردنەوە لە ڕێسای گشتی ئەو کچەی تەمەنی پانزە ساڵی تەواوکردوە ئەگەر توانای جەستەیی تەواو بێت بۆی هەیە بە مۆڵەتی ولیەکەی و دادوەر مارەبڕین ئەنجام بدات هەروەکو لە حالەتی وازهێنانی لە خوێندن و نەبوونی هیچ کەسێك بۆ ئەوەی چاودێری بکات و خەرجی بکێشێت بۆی هەیە ئەو کارە بکات.

### سێیەم: بەرژەوەندی (المصلحة):

بریتیە لە سوودی بەستهێنراو و زیانی دوورخراوە یەکسانە سوودەکە یان زیانەکە گشتی بێت یان تایبەتی ماددی بێت یان مەعنەوی دونیایی بێت یان دواڕۆژی.

ئەو سەرچاوە عەقڵیە بە یەکێك لە گرنگترین ڕێگاکانی دەرخستنی ئەحکامەکانی خودای گەورە دادەنرێت و ئەو ئەحکامانەی لەسەر بەرژەوەندی دادمەزرێن بەپێی گۆڕانی بەرژەوەندی لە گشت کات و شوێنێك دەگۆڕێن.

گرنگی بەرژەوەندی ڕەوا و ڕێگە پێدراو لەوە دەردەکەوێت کەوا قورئانی پیرۆز ئامانجەکانی پەیامی پێغەمبەرﷺ لە هێنانەدی بەرژەوەندییە ڕەواکانی خەڵکی کۆدەکاتەوە جا ئەو بەرژەوەندییانە گشتی بن یان تایبەتی هەروەکو دەفەرمووێت ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾الأنبياء/١٠٧. واتا: ئێمە تۆمان تەنها وەکو ڕەحمەت بۆ خەڵکی ناردووە، ڕەحمەت لەو ئایەتە بریتیە لە بەرژەوەندی مرۆڤایەتی چونکە خودای گەورە پێویستی بە خواپەستی مرۆڤ نییە کەواتە ئەگەر گشت کاتی خۆی لە خواپەرستی و بەندایەتی بەسەر ببات بە قەد میسقالە گەردیلەیەك لە گەورایەتی خودای گەورە زیاد ناکات، و هەروەها ئەگەر مرۆڤ گشت تەمەنی خۆی لە گومڕایی و تاوانکاری و بێ دینی بەسەر ببات بە قەد میسقالە گەردیلەیەك لە

گەورایەتی خودای گەورە کەم ناکاتەوە، و هەر فەرمانێکی خودای گەورە تەنها بۆ سوود و بەرژەوەندی بەندەکانە و قەدەغەکردنی هەر شتێکیش تەنها بۆ دوورخستنەوەی زیانە لە بەندەکان.

**بەشەکانی بەرژەوەندی:**

زانایانی ئیسلام لە چەندین ڕوویەکی جیاواز بەرژەوەندییان کردۆتە چەند بەشێکی جیاجیا بەوجۆرەی خوارەوە:

أ– لە ڕووی دانپێدانان و دانپێدانەنان بریتیە لە بەرژەوەندی دانپێدانراو و بەرژەوەندی دانپێدانەنراو و بەرژەوەندی ڕەها.

١- **بەرژەوەندی دانپێدانراو (المصلحة المعتبرة)**: بریتیە لەو بەرژەوەندییەی کەوا خودای گەورە بە دەق ئاماژەی پێکردووە و پێویستی کردووە لە ئەحکامەکان ڕەچاو بکرێت وەکو بەرژەوەندی پاراستنی گیانەکان لە سەپاندنی قیصاص بە سەر تاوانبار لە فەرموودەی خودای گەورە ﴿وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾البقرة/١٧٩. واتا: پێویستکردنی قیصاص بۆ ئێوە ژیانە ئەی کەسانی خاوەن عەقڵ بە ئومێدی ئەوەی ئێوە پارێزگار بن.

٢– **بەرژەوەندی دانپێدانەنراو (المصلحة غير المعتبرة)**: بریتیە لەو بەرژەوەندییەی کەوا خودای گەورە بە دەق هەڵیوەشاندۆتەوە وەکو بەرژەوەندی کەسی فێڵباز لە بەدەستهێنانی قازانج بە ڕێگەی فێڵ، و پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (هەر کەسێك فێڵ بکات لە ئێمە نییە).

٣– **بەرژەوەندی ئاماژە پێنەکراو یان ڕەها (المصلحة المرسلة)**: بریتیە لەو بەرژەوەندییەی کەوا هیچ دەقێك لەسەر دانپێنانی یان پێدانەنانی نییە وەکو بەرژەوەندی ڕێکخستنی هاتووچۆ لەو سەردەمەی ئێستا بە مەبەستی پاراستنی گیان و سامان، و بەرژەوەندی ڕێکخستنی باجی گومرگی بۆ پاراستنی بەرژەوەندی ئابووری نیشتیمانی.

به بۆچوونی ئێمە دابەشکردن بۆ سێ بەش لە شەریعەتی خودای گەورە نەهاتووە چونکە ئەو جۆرەی کۆتایی ئەگەر لە خزمەتی بەرژەوەندییەکی دانپێدانراو دابێت بە بەرژەوەندی دانپێدانراو دادەنرێت وەکو بەرژەندییە تەواوکەرەکانی بەرەژەوەندی دانپێدانراو، و ئەگەر یارمەتیدەر بێت بۆ هێنانەدی بەرژەوەندییەکی دانپێدانەنراو لە بەرژەوەندی دانپێدانەنراو دەژمێردرێت کەواتە ئەو دابەشکردنە کلاسیکییە کۆنە هیچ پاساوێکی نییە.

کەواتە بەرژەوەندی دووجۆرە یان لە شەریعەتی خوا دانپێدانراوە یان دانپێدانەنراو و سێیەمی نییە.

ب- لە رووی گرنگی زانایان بەرژەوەندی دانپێدانراویان کردۆتە سێ بەش بەرژەوەندی زۆر پێویست و بەرژەوەندی پێویست و بەرژەوەندی جوانکاری:

**بەشی یەکەم: بەرژەوەندییە زۆر پێویستەکان (المصالح الضرورية):** بریتیە لە مەبەستە سەرەکییەکانی شەریعەتی ئیسلام و لەبەرئەوە پێویستن چونکە هەر کۆمەڵگایەك ئەگەر یەکێك لەبەرژەوەندییە زۆر پێویستەکانی تیادا نەبوو زیان بە سیستەمی ئەو کۆمەڵگایە دەگات یەکسانە کۆمەڵگای ئێمەی مسولمان بێت یان کۆمەڵگای نامسولمان.

زانایانی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی و زانایانی تر بەرژەوەندییە زۆر پێویستەکانیان بەسەر پێنج جۆر دابەشکردووە و بریتین لە: پاراستنی ئاین، و پاراستنی گیان و جگە لە گیان، و پاراستنی نەوە و ناموس، و پاراستنی سامان، و پاراستنی عەقڵ.

**یەکەم: پاراستنی ئاین:** پێویستە گشت مرۆڤێك دەست بە ئیسلامەوە بگرێت کە بریتیە لە دوایین ئاینی ئاسمانی و بۆ بەرژەوەندی مرۆڤایەتی دابەزیوە و یەکێك لە پێویستییەکانی ژیانی هەر مرۆڤێك بریتیە لە پابەند بوون بەو ئاینە چونکە هەر کەسێك ئاینی نەبێت پابەندیش نابێت و هەر کەسێك پابەند نەبێت کەسێکی چاکەکار نابێت چونکە ئەندامێکە لە کۆمەڵگاکەی و شیاوی ئەوە نییە هیچ بەرپرسیارییەتییەکی دونیایی لەئەستۆ دابێت.

**دووەم: پاراستنی ژیان:** ژیان و تەندروستی ژیان یەکێك لە پێویستییەکانی مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێت پەیامەکەی بەرامبەر بە پەروەردیگاری و کۆمەڵگاکەی بەجێ بگەیەنێت و ئەو بەجێگەیاندنە بەندە بە بەردەوامی ژیان و سەلامەتی جەستە.

**سێیەم: پاراستنی ناموس:** یەکێکە لە پێویستییەکانی پاراستنی ڕێز و شەرەف و خوڕەوشتی مرۆڤ، و گوتراوە (نەتەوەکان بە خوڕەوشت ماونەتەوە و ئەگەر خوڕەوشتیان نەما ئەوانیش نامێنن).

**چوارەم: پاراستنی سامان:** بریتیە لە پێویستییەکانی بەردەوامی ژیان و یەکێکە لە هۆکار و ئامرازە سەرەکییەکانی ژیان.

**پێنجەم: پاراستنی عەقڵ:** چونکە تاکە جیاکەرەوەیە کەوا مرۆڤ لە ئاژەڵەکان جیا دەکاتەوە و مرۆڤ و ئاژەڵ لە گشت هۆکارەکانی ژیان هاوبەشن تەنها لە عەقڵ نەبێت و بە عەقڵ مرۆڤ پێش دەکەوێت و شارستانییەتی گەشە دەکات و بەختەوەر دەبێت.

**بەشی دووەم: بەرژەوەندییە پێویستەکان (المصالح الحاجية):** لە رووی گرنگی بۆ ژیانی مرۆڤ لە دوای بەرژەوەندییە زۆر پێویستەکان دێن وەکو پێویستییەکانی یارمەتیدەر بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە زۆر پێویستەکان کەواتە هەر زانستێکی تەکنەلۆژی بە بەرژەوەندی پێویست دادەنرێت و گشت ئامرازەکانی گواستنەوەی وشکانی و دەریایی و ئاسمانی و ئامرازەکانی پەیوەندی بە تەل و بێتەل و پەیوەندییەکانی نەتەوەکان و سوود وەرگرتن لە ئاڵگۆڕکردنی لێزانی و شارەزایی و ڕێزگرتن لە سیستەمی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی و هەر شتێکی لەو جۆرە گشتییان بە بەرژەوەندییە پێویستەکان دادەنرێن.

**بەشی سێیەم: بەرژەوەندییە جوانکارییەکان (المصالح التحسينية):** لە رووی گرنگی لە دوای بەرژەوەندییە زۆر پێویستەکان و بەرژەوەندییە پێویستەکان دێن.

نموونەی ئەو بەرژەوەندییانە لە رووی زانستی لەو سەردەمە بریتین لە گەشتکردن بە مەبەستی حەسانەوەی دەروون و سەردانیکردنی نێوان خزمان و هاوڕێیان بە

مەبەستی بەهێزکردنی پەیوەندی، و سەردانیکردنی نەخۆشەکان و پێشکەشکردنی دیاری بە هۆی بۆنەکان و سەلامکردن لە یەکتری لە کاتی بە یەك گەیشتن و بەردەوام بوون لەسەر وەرزشی دەروون و جەستە و پاراستنی خاوێنی و پاراستنی ژینگە لە پیسبوون و هەرشتێکی لەوجۆرە گشتیان بە بەرژوەندی جوانکاری دادەنرێن.

شایەنی باسە لەو سەرچاوانەی ئەو بەشانە لەخۆدەگرن هیچ پێوەرێکی بابەتیمان نەدۆزییەوە کە بە هۆیەوە جیاوازی لە نێوانیاندا بکرێت چونکە چەند بەرژەوەندی پێویست هەن بوونەتە بەرژەوەندی زۆر پێویست بۆ ژیان، و چەند جوانکاری هەن ئەمرۆ بەپێی پێشکەوتنی ژیان بوونەتە بەرژەوەندی زۆر پێویست یان بەرژەوەندی پێویست.

بەپێی ئەو راستییە دانانی بەرژەوەندی بە بەرژەوەندی زۆر پێویست یان پێویست یان جوانکاری بەپێی بارودۆخ و گۆڕانکاری و پێشکەوتنی ژیان لە هەر کات و شوێنێك گۆڕانکارییان بەسەردا دێت.

**لابردنی تێکگیرانی نێوان بەرژەوەندییە تێکگیراوەکان – رفع التعارض بين المصالح المتعارضة:**

ئەگەر دوو بەرژەوەندی تێکگیران بەپێی ئەو پێوەرانەی خوارەوە ئەو تێکگیرانە لادەبردرێت:

١– ئەگەر بەرژەوەندی ئاین لەگەڵ بەرژەوەندی ژیان تێکگیرا یەکەمیان لە پێشترە چونکە ئاین و بیروباوەڕ لە ژیانی مرۆڤدا گرنگە بۆیە جیهاد و تێکۆشان دانراوە بە مەبەستی بەرگریکردن لە ئاین.

٢– ئەگەر بەرژەوەندی ژیان لەگەڵ بەرژەوەندی پاراستنی ئابرو تێکگیرا دووەمیان لە پێشترە چونکە زیانگەیاندن بە ئابرو زیان بە کەرامەت و رێز و شەرەف و بەها و رەوشتی مرۆڤ دەگەیەنێت.

٣– ئەگەر بەرژەوەندی ژیان لەگەڵ بەرژەوەندی پاراستنی سامان تێکگیرا یەکەمیان لە پێشترە چونکە بەرژەوەندی دووەمیان ئەگەر لەناو بچێت قەرەبوو

دەکرێتەوە بەڵام یەکەمیان قەرەبوو ناکرێتەوە بۆیە رەچاوکردنی پاراستنی گیان لە رەچاوکردنی پاراستنی سامان لەپێشترە.

٤- لە کاتی تێکگیرانی بەرژەوەندی زۆر پێویست لەگەڵ بەرژەوەندی پێویست و جوانکاری یەکەمیان لە دووەم و سێیەمیان لە پێشترە و دووەمیان لە سێیەمیان لەپێشترە بەپێی گرنگی.

٥- لە کاتی تێکگیرانی بەرژەوەندی گشتی لەگەڵ بەرژەوەندی تایبەتی یەکەمیان لە پێشترە چونکە بەرژەوەندی تایبەتی لە چوارچێوەی بەرژەوەندی گشتی دەهێتەدی هەرچەندە بە شێوەیەکی لاوەکی بهێتەدی بەپێچەوانەی بەرژەوەندی دووەم چونکە بەرژەوەندی تایبەتی بە زۆری نابێتە مایەی هاتنەدی بەرژەوەندی گشتی.

٦- لە حالەتی تێکگیرانی بەرژەوەندییەکی بەدەست هاتوو لەگەڵ بەرەژەوەندییەکی ئەگەری یەکەمیان لە پێشترە بۆیە بەرژەوەندی ئافرەت لە بریاردان لە سەر مردنی مێردی ونبووی دوای ئەو ماوەیەی کەوا شەریعەت یان یاسا دیاریکردووە لەپێشترە لە بەرژەوەندی مانەوەی مێردەکەی لە ژیاندا، چونکە مانەوەی مێردی ئەو ژنە لە ژیان گومانی تێدایە.

٧- ئەگەر سوودێك و زیانێك لەگەڵ یەکتردا تێکگیران ئەگەر هەردووکیان لە یەك پلە بوو یان ئەگەر زیانەکە لە بەرژەوەندییەکە زیاتر بوو دوورخستنەوەی زیان لە بەدەستهێنانی بەرژەوەندی لەپێشترە، بەڵام ئەگەر بەرژەوەندییەکە لە دوورخستنەوەی زیانەکە گرنگتر بوو بەرژەوەندییەکە لەپێشترە سەرەڕای بوونی زیانەکە وەکو حوکمدان لەسەر تاوانبار بە سزای لێ سەندنەوەی ئازادی - زیندانیکردن.

ئاشکرایە کەوا سزادانی تاوانبار زیانی بۆ تاوانبار و خانەوادەکەی هەیە و هەندێك جار زیانی بۆ کۆمەڵگەش هەیە بۆ نموونە ئەگەر بریار لەسەردراو پزیشك یان

مامۆستای زانکۆ بێت بەڵام بەرژەوەندی ئەو سزادانە گرنگترە و زیاترە لە زیانەکەی لەبەر پاراستنی گیان و سامان و ئاسایش و سەقامگیری.

٨- ئەگەر دوو زیان لەگەڵ یەکتری تێکگیران کەمترین زیان هەڵدەبژێدرێت بە مەبەستی دوورخستنەوەی زیانی زیاتر بۆیە لە رووی شەرع و یاسا دروستە قاچی تووش بوو بە شێرپەنجە ببڕدرێت چونکە زیانی بڵاوبوونەوەی شێرپەنجە لە ناو جەستە زیاتر و مەترسیدارترە.

**گرنگی بەرژەوەندی**: بەرژەوەندی لە هەردوو بواری شەرعی و یاسایی گرنگییەکی زۆری هەیە چونکە یاسا لەسەر بنچینەی رەچاوکردنی بەرژەوەندی دادەنرێت و هەموار دەکرێت و هەڵدەوەشێتەوە چونکە دەکرێت نادیاری دەقە نادیارەکانی شەرع و یاسا بەپێی بەرژەوەندی لابردرێت واتا روون بکرێتەوە.

## چوارەم: کردنەوە و داخستنی رێگاکان - الذرائع فتحها و سدها:

(ذرائع کۆی ذريعة) لە رووی زمانەوانی بریتیە لە ئامراز و لە زاراوەی شەرعی و یاسایی بریتیە لە گەیشتنی رێگا بە ئامانجەکەی لەسەر بنچینەی ئەوەی کە تەنها نیازەکان و مەبەستەکان و دەرەنجامەکان بە هەند وەردەگیرێن.

ئەو رێسا گشتییە لەسەر زمانی پێغەمبەرﷺ هاتووە کە دەفەرمووێت: (کردەوەکان تەنها بە نیازەکانن - انما الاعمال بالنيات) و هەروەکو لە رێسای شەرعی و یاسایی هاتووە: (تەنها مەبەستەکان و واتاکان گرنگن نەک وتەکان و روونکردنەوەکان - العبرة بالمقاصد و المعاني لا بالالفاظ و المباني).

**بەشەکانی رێگاکان:**

لە رووی مەبەستەکان رێگاکان دەکرێنە چوار جۆر:

١- رێگاکە و ئامانجەکە هەردووکیان ڕەوا بن، وەکو پێدانی خەڵات بە قوتابیە یەکەمەکان بە مەبەستی دروست بوونی پێشبڕکێ لە بەرزبوونەوەی زانستی بۆیە

پێویسته لەسەر دەوڵەت ئەو ڕێگایانە بکاتەوە چونکە خزمەت بە بەژەوەندییە گشتی و تایبەتییەکان دەکات.

٢- ڕێگەکە و ئامانجەکە هەردووکیان ناڕەوا بن، وەکو دروستکردنی چەکی کۆمەڵ کوژ بە مەبەستی دەستدرێژی کردنە سەر یەکێکی تر و پێویستە لەسەر تەواوی وڵاتانی جیهان دروستکردنی ئەو چەکە نەهێڵن و ڕێگای دروستکردنی دابخەن.

٣- خودی ڕێگاکە ناڕەوا بێت و ئامانجەکە ڕەوا بێت بۆ نموونە خودی ئامرازی سزادانی تاوانبار ناڕەوایە چونکە هەروەکو باسمانکرد زیانە بەڵام لە ڕووی ئامانجی بەرزی رەوایە کە بریتیە لە پاراستنی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگە وەکو بەرژەوەندی پاراستنی گیان و سامان و نامووس و ئاسایش، بۆیە شەریعەتە ئاسمانییەکان و یاسا دەستکردەکان دانیانناوە بە رەوایەتی ئەو ئامانجە و دانان و پیادەکردنی سزاکان لەلایەن دادوەر و جێبەجێکردنیان لەلایەن دەسەڵاتی جێبەجێکردن.

٤- خودی ئامرازەکە رەوایە بەڵام لە ڕووی ئامانجەکەی ناڕەوایە بۆ نموونە ئەگەر پیاوێك دیارییەك پێشکەشی ئافرەتێك بکات بۆئەوەی پەیوەندی ناڕەوای لەگەڵدا ببەستێت یان بۆئەوەی ئەو پەیوەندییە بەردەوام بێت بۆیە شەریعەت و یاسا بڕیاریانداوە بە پووچەڵ بوونەوەی ئەو دیارییە.

## پێنجەم: بە هاوڕێگرتن یان مانەوە وەکو خۆی - الاستصحاب:

لە ڕووی زمانەوانی: لە (المصاحبة) وەرگیراوە واتا: هاوڕێیەتی و لە زاراوەی زانستی بریتیە لە بەردەوامی حوکمی پێشوو لە سەردەمی دواتر بەوپێیەی نەسەلمێندراوە کەوا ئەو حوکمە لاچوو بێت.

**جۆرەکانی ئیستیصحاب:**

ئیستیصحاب لە رووی بنچینە بەسەر چوار جۆر دابەش دەکرێت:

**١- لە بنەڕەتدا شتە سوود بەخشەکان حەلالن:** پاڵپشت بە زۆر لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لەوانە فەرموودەی خودای گەورە ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾البقرة/٢٩. واتا: خودا ئەو خودایەیە کەوا گشت شتێکی ناو زەوی بۆ ئێوە دروست کردووە. پیتی (لام) لە (لكم) واتای بۆ سوود دەگەیەنێت واتا هۆکار و فەلسەفەی دروستکردنی خێروبێری زەوی بریتیە لە بەرژەوەندی مرۆڤایەتی لە رووی بەدەست هێنانی سوود و کەڵك بەپێی ئەو ئایەتە گشت شتێکی سەر رووی زەوی و ناو زەوی بۆ گشت خەڵکی هاوبەشن لەسەر بنچینەی ئەوەی کەوا شتەکان لە بنەڕەتدا حەلالن نەك لەسەر بنچینەی گشتییەتی شتەکان چونکە حالەتی دووەم تەنها دوای هاتنەدی خاوەندارێتی دەهێتەدی.

**٢- بەردەوامی حوکمی بێتاوانی لەبنەڕەتدا:** واتا گشت کەسێك لە بنەڕەتدا بێتاوانە: ئاشکرایە کاتێك مرۆڤ لەدایك دەبێت بێتاوانە و هیچ ئەرکێکی شارستانی و تاوانی لە ئەستۆدا نییە و پێش لەدایك بوونی شیاوی وجوبی ناتەواوی هەیە واتا(شیاوی ئەوەیە هەندێك مافی هەبێت ئەو مافانەی کەوا پێویستییان بە قەبولکردن و رەزامەندی نییە) و دوای لەدایك بوونی شیاوی وجوبی تەواوی هەیە واتا (شیاوی ئەوەیە هەندێك مافی هەبێت و هەندێك ئەرکیشی لەسەر بێت) بۆ نموونە بژێوی خزمانی هەژاری لەسەرە ئەگەر سامانی هەبێت.

ئەگەر بەوە تۆمەتبار کرا کەوا قەرزداری یەکێکە یان تاوانێکی ئەنجامداوە پێویستە لەسەر دادوەر یان موفتی بەبێ تاوانی دابنێت لەو تاوانە بەپێی بەردەوامی بێتاوانی لە بنەڕەتدا تاکو بەپێچەوانەی ئەوە دەسەلمێندرێت واتا تاکو دەردەکەوێت تاوانبارە.

**٣- بەردەوامی حوکمی سەلمێندراو بەپێی هۆکارێکی شەرعی یان یاسایی تاکو دەسەلمێندرێت ئەو هۆکارە لاچووە:** بۆ نموونە ئەگەر ئافرەتێك لە پیاوێك مارەکرا بێت و دواتر لە دوای ماوەیەك لە بەردەم دادوەر داوا بکات لە پیاوێکی تر مارە بکرێت پێویستە لەسەر ئافرەتەکە بسەلمێنێت کەوا پیاوی یەکەم مردووە یان تەلاقیداوە و عیدەکەشی کۆتایی هاتووە و بەپێچەوانەی ئەوە پێویستە لەسەر دادوەر داواکەی رەت بکاتەوە و داواکارییەکەی جێبەجێ نەکات چونکە پێویستە هۆکاری پێشوو کە بریتیە لە (مارەبڕین) تاکو ئێستا بەردەوام بێت.

هەروەها ئەگەر کەسێك بە رێگایەکی رەوا (شەرعی) ببێتە خاوەنی سامانێك ئەو خاوەندارێتییە بەردەوام دەبێت تاکو بە بەڵگە و شاهێد دەسەلمێندرێت خاوەندارێتی بەسەر ئەو سامانە نەماوە.

**٤- بەردەوامی خەسڵەتی بنەڕەتی:** ئەو جۆرەی کۆتایی بەخۆم دەرم هێناوە و لە هیچ سەرچاوەیەکی بنەماکانی فیقهی بە روونی باس نەکراوە.

ئاشکرایە گشت شتێك چەند خەسڵەتێکی بنەڕەتی و چەند خەسڵەتێکی لاوەکی هەیە و لە بنەڕەتدا خەسڵەتە بنەڕەتییەکان بەردەوامن، و لە بنەڕەتدا خەسڵەتە لاوەکییەکان نین، بەوپێیە مردنی کەسی ونبوو تەنها بە بەڵگە و شاهێد یان بەسەرچوونی ئەو کاتەی لە شەرع یان لە یاسا دیاریکراوە نەبێت ناسەلمێندرێت تاکو بڕیار بدرێت بە مردنی چونکە زیندووبوونی ئەو کەسە خەسڵەتێکی بنەڕەتییە و لە بنەڕەتدا بەردەوامە بەڵام مردن خەسڵەتێکی لاوەکییە و گوماناوییە و لە بنەڕەتدا نییە و بەپێی ئەو دابەشکردنە ئەو ڕێسایە دادەمەزرێت (بێگومانی بە گومان لاناچێت — الیقین لایزول بالشك) و ڕێسای (بەڵگە و شاهێد لەسەر داواکارە و سوێند خواردن ئەو لەسەر نکولی کارە — البینة علی المدعي و الیمین علی من انکر) چونکە یەکەمیان داوای پێچەوانەی بنەڕەتی (أصل) دەکات و دووەمیان لەگەڵ بنەڕەتدایە.

### گرنگی ئیستصحاب

ئیستیصحاب له کردارەکانی دادوەری زۆر گرنگه چونکه دادگا لـه دادبینییـەکانی شارستانی و سزایی و رێکاره دادوەرییەکان له سەرەتایی دەستپێکردنی بینینـی داوا تاکو دەرکردنی حـوکم پشـت بـه بەڵگـەدانانی ئیستیصـحاب دەبەسـتێت بۆیـه داوای بەڵگه و شاهێد له داواکار دەکات چونکه داوالێکراو لـه بنەڕەتـدا بێتاوانـه بـەڵام لـه حالەتی نەبوونی بەڵگـه و شـاهێد سـوێند خـواردنی داوالێکراو بەسـه چـونکه لەگـەڵ بنەڕەتدایه و ئەگەر له کاتی روودانی عەیبێکی شاراوه له بابەتی گرێبەسـتەکه نـاکۆی له نێوان هەردوو لایەنی گرێبەست دروست بـوو پێویسـته لەسـەر دادوەر ئـەو لایەنـه پەسـەند بکـات کـەوا بانگەشـەی بـێ کـەم و کـوڕی فرۆشـراوەکەی کـردووه چـونکه عەیبەکه لەلاراهاتووه و له بنەڕەتدا نەبووه و لەبەرئەوەی عەیبی لەلاراهاتوو دەدرێتـه پاڵ نزیکترین کاتەکان چونکه له بنەڕەتدا نییه.

له کاتی ناکۆکی نێوان قەرزدار و خاوەن قەرز دەربارەی دانەوه و نەدانەوەی قەرز بانگەشەی ئەو لایەنه پەسەند دەکرێت کەوا بانگەشەی نەدانەوەی قەرز دەکات ئەگەر بەڵگەیەکی پێچەوانه نەبێت چونکه لـه بنەڕەتـدا قەرزەکـه تـاکو ئێسـتا لـه ئەسـتۆی قەرزدار دایه.

هەروەها ئیستصحاب له لێکدانەوه و کۆشش – ئیجتهاد – و فەتواکان دەربارەی حەلالکردن و حەڕامکردنی شـته سـوود بەخشـەکان زۆر گرنگـه چـونکه لـه بنەڕەتـدا شتەکان حەلالن مادام دەقێك نەبێت حەڕام و قەدەغەی بکات[1].

---

[1] – بۆ زیارت شارەزابوون لەو سەرچـاوه دەرخسـتانه بگـەڕێوه بـۆ کتێبەکـەمان/ اصـول الفقـه في نسیجه الجدید/ بەشی یەکەم.

# وانەی چوارەم

## الفقه . الفقهاء . الاجتهاد.
## التقليد

لەو بەشە بە کورتی پێناسەی فیقه و زانایانی فیقهی ئیسلامی و ئیجتهاد و تەقلید دەکەین ئەو باسە لە رووی شێوەیی بەسەر سێ باس دابەش دەکەین و لە باسی یەکەم باس لە دروستبوون و گەشەکردنی فیقه دەکەین، و لە دووەمیان پێناسەی پێشەوایانی مەزهەبەکانی فیقهی ئیسلامی دەکەین و لە سێیەمیان پێناسەی ئیجتهاد و تەقلید دەکەین.

# باسی یەکەم:
# دروستبوون و گەشەکردنی زانستی فیقهی
# الفقه نشأته و تطوره

فیقه لە رووی زمانەوانی: واتا/ تێگەیشتن، و لە زاراوەی شەرعی بریتیە لەو ئەحکامە شەرعییە کردارییانەی لە بەڵگە درێژەکان (دیاریکراوەکان) وەرگیراون.

زانستی فیقهی بە خەسڵەتی رەفتارەکانی مرۆڤ دادەنرێت کە بریتین لە: واجب، ندب، و حرمة، کراهیة، اباحة[1]، چونکە حوکمی شەرعی: بریتیە لە مەبەستی پەیامی خودای گەورەی پەیوەست بە رەفتارەکانی مرۆڤی راسپێردراو (المکلف) بە شێوەی پێویستکردن یان سەرپشککردن.

## دروستبوونی زانستی فیقهی:

فیقه لەگەڵ دروستبوونی دەقەکان دروست بووە چونکە گشت حوکمێك کە بە شێوەی راستەوخۆ لە دەقێکدا هاتبێت وەکو لە دەقی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر یان بە شێوەی ناراستەوخۆ وەکو لە سەرچاوەکانی دەرخستنی ئەحکامەکان هات بێت دوای دەرهێنان و خستنەرووی بۆ پیادەکردن و کارپێکردنی پێی دەگوترێت فیقه بەڵام ئەو حوکمەی راستەوخۆ لە قورئان وەرگیراوە پێی دەگوترێت فیقهی قورئان، و ئەو حوکمەی راستەوخۆ لە فەرموودە وەرگیراوە پێی

[1] – لە پێشتر پێناسەمانکردوون.

دەگوترێت فیقهی فەرمووده، و ئەو حوکمەی لە سەرچاوەکانی دەرخستنی ئەحکامەکان وەرگیراوە پێی دەگوترێت فیقهی ئیجتهادی.

**ڕێگای زانایانی یاوەر لە دەرهێنانی ئەحکامەکان - طريقة فقهاء الصحابة في استخراج الاحكام:**

زانای یاوەر کاتێك دەیویست حوکمێك بۆ ڕەفتارێك یان ڕووداوێك وەربگرێت یەکەم جار دەگەڕایەوە بۆ قورئانی پیرۆز کە کانگای یەکەم و ڕەسەنە و ئەگەر حوکمەکەی لە قورئان دەست نەکەوتبایە پەنای بۆ فەرموودەی پێغەمبەرﷺ دەبرد و ئەگەر لەویش نەبووایە یەکێك لە سەرچاوەکانی دەرخستنی ئەحکامەکانی بەکاردەهێنا و لێکدانەوەی دەکرد و لە ڕێگەی ئەو سەرچاوانە بۆچوونی خۆی بەکاردەهێنا بە مەبەستی گەیشتن بە حوکمی خودای گەورە.

**سروشتی گشتی فیقهی یاوەر - الطابع العام لفقه الصحابة:**

١- سەرچاوەکانی فیقهی یاوەران بریتین لە قورئانی پیرۆز و فەرموودە و دواتر ئیجماع و دواتر بیرورا.

٢- فیقهێکی ڕاستەقینە و واقیعی بووە چونکە بەپێی پرۆگرامی سەردەمی خۆیان پەیڕەو دەکرا و تەنها دوای ڕوودانیان بە دوای حوکمی ڕەفتار یان ڕووداو دەگەڕان.

٣- فیقهی یاوەران عیللەت و هۆکاری هەیە و حوکمێکە لە قورئان و فەرموودە وەرگیراوە.

٤- لێکدانەوەی یاوەران دەربارەی ئەو مەسەلەیەی دەقی ڕوونی لەسەر نییە مەجالی فراوانە بە مەبەستی چارەسەرکردنی پێویستییەکان و بەرژەوەندییەکانی خەڵکی.

## هۆكارەكانی بیروڕای جیاوازی زانایانی یاوەر – اسباب اختلاف فقهاء الصحابة:

جیاوای بیروڕای زانایانی یاوەر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو چەند هۆكارەی خوارەوە:

١– جیاوازییـان دەربـارەی متمانـە بـەو فەرموودەیـەی لـە دوای كۆچـی دوایـی پێغەمبەرﷺ لە پێغەمبـەرﷺ گێڕدراوەتـەوە چـونكە هەنـدێكیان كـار بـە فـەرموودەی كەسێك دەكەن لەبەر ئەوەی متمانەیان پێیەتی و هەندێكی تر متمانەیان پێـی نییـە و كار بەو فەرموودەیە ناكەن كەوا گێڕاویەتییەوە.

٢– هەموویان لە یەك ئاستی زانستی نەبوونە.

٣– جیاوازییان دەربارەی بوێری لە لێكدانەوە و وەرگرتنی بۆچوونێك.

٤– كاریگـەری عـورف و داب و نـەریتی ناوچـەیی لەسـەریان دوای ئـەوەی بـەناو ناوچە ئیسلامییەكاندا بڵاوبوونەوە.

## هۆكارەكانی كەمی جیاوازی زانایانی یاوەر – أسباب قلة اختلاف فقهاء الصحابة:

١– لـە سـەرەتای ئیسـلام ئاسـان بـوو بـە یـەكتر بگـەن و لەسـەر یـەك بۆچـوون رێككەون.

٢– بەكارهێنانی سیستەمی راوێژكردن لە حوكمەكانی مەسەلە گرنگەكان.

٣– كـەمی رووداو و كێشـە لەسـەردەمی یـاوەران پـێش فـراوان بـوونی دەوڵـەتی ئیسلامی.

٤– كەمی گێڕانـەوەی ئـەو فەرموودەیـەی دوای یـاوەران بـووە هۆكـاری بـیروڕای جیـاوازی زانایـانی فیقهـی لـە رووی راڤـەكردنی فەرموودەكـە و متمانـە بـەو كەسـەی گێڕاویەتییەوە.

٥- پەلەنەکردن لە وەرگرتنی بۆچوونێك چونکە هەر لێکدانەوەیەکی یاوەران پێشتر تێروانین و ووردەکاری بۆ کراوە و بابەتی حوکمەکە دیراسەکراوە[١].

## گەشەکردنی زانستی فیقهی – تطور الفقه:

فیقه لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ دروست بووە و دواتر گەشەیکردووە تاکو گەیشتۆتە چڵەپۆپە و دواتر بەرەو دابەزین و وشکی چووە هەروەکو لەو روونکردنەوەیەی خوارەوە دیارە:

### یەکەم: فیقهی ئیسلامی لەسەردەمی زێرین:

ماوەی نێوان سەدەی دووەمی کۆچی تاکو ناوەڕاستی سەدەی چوارەمی کۆچی بە باشترین سەردەمی فیقهی ئیسلامی دادەنرێت چونکە لە رووی ووردەکاری و بەها گەیشتۆتە لوتکەی فراوانی و چەند پڕۆگرامی روون و ئاشکرای بۆ هاتۆتەکایە و چەند رێگایەکی دیاریکراوی بۆ کێشراوە.

### تەرازوی زانستی فیقهی لەسەردمی زێرین:

١- گەشەکردنی زانستی فیقهی بە شێوەیەکی بەرچاو بەجۆرێك کە گەیشتە پلەی گەشەکردن و تەواو و هیچ شتێکی پەیوەست بە مرۆڤی نەهێشتەوە کە باسی نەکرد بێت یەکسانە چ لە سەر ئاستی تاك بێت یان لەسەر ئاستی کۆمەڵگە.

٢- دەرکەوتنی بلیمەتی زانایانی فیقهی ئەوانەی کەوا جەماوەر دانیاننا بە گەورەیی و سەرداریيان و دروستبوونی چەند مەزهەبێکی فیقهی کۆمەڵایەتی.

٣- گەشەکردنی نووسینەوەی فیقهی گشت مەزهەبەکان.

٤- فراوانبوونی نووسینەوەی فیقهی پێویست[١] و بە شێوەیەکی تایبەتی لە فیقهی ئەبو حەنیفە (رەحمەتی خودای لێ بێت).

---

[١] – بڕوانە کتێبەکەی ئێمە – اسباب اختلاف الفقهاء في الاحكام الشرعية/ ل١٦ و لاپەڕەکانی دواتر.

٥- دەرکەوتنی دەستەواژە و ڕێسای فیقهی.

٦- فراوان بوونی سنووری بیروڕای جیاواز لە مەسەلە لاوەکییەکان (فەرعی).

**پاڵنەرەکانی بووژانەوەی فیقهی - عوامل النهضة الفقهیة:**

١- گرنگیدانی خەلیفەکانی عەباسی - بەپێچەوانەی ئەمەوییەکان - بە زانستی فیقهی و زانایانی فیقهی.

٢- دەرکەوتنی گەورە موجتەهیدەکان و ئازادییان لە ئەنجامدانی کاری لێکدانەوە و کۆشش (الاجتهاد).

٣- زۆری ڕووداوەکان دوای ئەوەی هەرێمی دەوڵەتی ئیسلامی فراوان بوو.

٤- ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی تر جگە لە عەرەب لە وڵاتە خاوەن شارستانییە کۆنەکان هاتنە ناو ئیسلام وەکو فارس و ڕۆم و ئەو نەتەوانە زانیارییان لەسەر فەلسەفە و مەنتیق و ئاینەکانی پێشوو هەبوو.

٥- ڕۆشنبیری ئەو نەتەوانەی باوەڕییان بە ئیسلام هێنا و کاریگەرییان لەسەر زانایانی فیقهی ئیسلامی هەبوو.

٦- زیادبوونی بزوتنەوەی نووسین و وەرگێرانی تەواوی زانستە جیاجیاکان و دەرکەوتنی ڕێزکردن و بەش بەشکردنی بابەتە فیقهییەکان.

٧- زیادبوونی گفتوگۆ و مشتومڕ و بیروڕا گۆڕینەوە و گشت ئەوەش بووە هۆی فراوان بوونی بازنەی بزوتنەوەی ئیجتیهاد و دروستبوونی بیروڕا فیقهییەکانی پتەو.

**دووەم: هۆکارەکانی لاوازبوون و وشکبوونی فیقهی ئیسلامی - أسباب انتكاسة و جمود الفقه الاسلامي:**

ئەو هۆکارانەی بوونەتە هۆی لاوازبوونی فیقهی ئیسلامی دوای گەشانەوە و بووژانەوەی زۆرن لەوانە:

---

[1] - بریتیە لە ئامادەکردنی حوکم بۆ ئەو ڕووداوەی لە داهاتوو ڕوودەدات.

١- لاوازی دەوڵـەتی عەباسـی لـە رووی رامیـاری و بـووە هـۆی ئـەوەی زانایـانی مسولمان گیانی سەربەخۆییان لاواز بێت لە رووی کارکردن لەسەر شەریعەت.

٢- پابەندبوونی هەر زانایەکی فیقهی بە مەزهەبی پێشەواکەی بەجۆرێك کەوا هـەر قوتابیەکی پێشەواکانی مەزهەبە فیقهییەکان بەرگری لە مەزهەبەکەی خۆی دەکـرد و دەمارگیری بۆ قوتابخانەکەی خۆی هەبوو.

٣- لـە لایـەنی کـرداری مەزهەبـە فیقهییـەکان جێگـەی شـەریعەتی ئیسـلامییان گرتەوە و ئەو حاڵەتەش تاکو ئەو سەردەمەی ئێمە بەردەوام بوو بەجۆرێك کەوا دەقە فیقهییەکان وەکو دەقەکانی خودای گەورەیان لێهات.

٤- پشت بەستن بـە بـیروڕا فیقهییـەکانی نووسـراو بـەجۆرێك کـەوا زانایـانی هـەر قوتابخانەیەکی فیقهـی بـوون بـە مشـەخۆری فیقهـی پێشـەواکانیان و ورد و درشـتی بیروڕاکانیان پەیڕەو دەکردن.

٥- زانایان تەنها کتێبە فیقهییەکانیان راڤە دەکرد و تێبینییان لەسەر دەنووسـین بە ڕێگەی دانانی پەراوێز یان رەخەن.

٦- دەمـارگیری مەزهـەبی و نـەبوونی بـوێری بـۆ وەرگرتنـی ئەحکامـەکان لـە سەرچاوە بنەڕەتییەکان.

## باسی دووەم:
## پێشەواکانی مەزهەبەکانی فیقهی نووسراو
## أئمة المذاهب الفقهية المدونة

لەو باسە بە کورتی باس لە گرنگترین سەرکردەکانی مەزهەبەکانی فیقهی نووسراو دەکەین ئەوانەی کەوا لە جیهانی ئیسلامی کارییان پێ دەکرێت بەپێی ریزبەندی مێژوویی:

١- (**الامام جابر الاباضي**) (٢١-٩٣هـ) بریتیە لە پێشەوا جابری کوڕی زەیدی ئەزدی ئیباضی لە بنەڕەتدا عومانییە و یەکێکە لە گەورە تابعییەکان و لە شاری بەسرە نیشتەجێ بووە و لەلای گەورە زانایانی فیقهی یاوەرانی خوێندوە لەوانە عەبدولای کوڕی مەسعود و ئەنەسی کوڕی مالیك و جگە لەوانە.

(الاباضية) چینێکی هاوسەنگی خەواریجەکانن و لە بیروڕا و بیرکردنەوە جمهوری موعتەدیل دانی پێداناوە و ئەو مەزهەبە بە (الاباضية) ناو دەبرێت چونکە دەدرێتە پاڵ عەبدولای کوڕی ئیباضی تەمیمی وەکو داننان بە رۆڵی ئەو کەسە لە بەرەو پێشبردن و دانانی بنچینەکانی ئەو مەزهەبە.

ئەو مەزهەبە بە هاوسەنگ ناسراوە چونکە وەکو مەزهەبی (الظاهرية) لە بیروکەی فیقهی لەسەر لایەنی دیاری دەقەکان نەوەستاوە، و لە وەرگرتنی بۆچوون فراوان نەبووە وەکو مەزهەبی (حەنەفی).

گرنگترین سەرچاوە فیقهییەکانی ئەو مەزهەبە: بریتین لە قورئان و فەموودە و ئیجماع و دواتر عەقڵ.

٢- (**الامام زيد/ ٨٠-١٢٢هـ**): بریتیه له زید کوڕی علی زین العابدین کوڕی حسین کوڕی علی کوڕی أبی طالب (خوا لێیان رازی بێت) دامەزرێنەری مەزهەبی زەدییە و لە خانەوادەی پێغەمبەرﷺ لە دایك بووە لە خێزانێك کەوا ئاڵای زانستی شەریعە و تەقوا و چاکەکاری بەرزکردۆتەوە و زانستی لە باوکی و براکەی محمدی باقر، و عەبدڵای کوڕی حسین و زۆر لە زانایانی تابیعی وەرگرتووە.

گرنگترین سەرچاوەکانی فیقهی ئەو مەزهەبە: بریتین لە قورئان و فەموودە و قیاس و عەقڵ.

٣- (**الامام جعفر الصادق/ ٨٠-١٤٨هـ**): بریتیه عەبدوڵا جعفری صادق کوڕی محمد باقر کوڕی علی زین العابدین کوڕی حسین کوڕی علی کوڕی أبی طالب (خوا لێیان رازی بێت)، و لەسەردەمی تابیعی تابیعین بە گەورەترین پێشەوای شیعەی دوانزەیی دادەنرێت و یەکێکە لە گەروەکانی خاوەنەوادەی پێغەمبەرﷺ (أهل البیت) و لەبەر راستگۆیی بە راستگۆ ناسراوە.

لە ماڵی شکۆمەندی و زانست پێگەیشتووە و لەسەردەمی زۆر لە زانایانی تابیعین ژیاوە.

**سەرچاوەکانی فیقهی ئەو مەزهەبە**: بریتین لە قورئان و فەموودە و بەلای ئەوانەوە هەر شتێك لە پێغەمبەری معصوم (بێ گوناه) ﷺ و پێشەواکانی مەعصوم دەربارەی شەریعەت وەرگیرا بێت و دواتر ئیجماعی چینێك و دواتر عەقڵ بە سەرچاوە دادەنرێت.

٤- (**الامام أبو حنيفة/٨٠-١٥٠**): بریتیه لە نعمان کوڕی سابت کوڕی زوتی کوڕی جاه، لە بنەڕەتدا فارسە و باپیری خەڵکی کابولە، و بە تابیعی تابعین دادەنرێت، و لە شاری کوفە لە دایك بووە و پیشەی بازرگانی ئاوریشم بووە و دواتر کاری زانستی کردووە و پاشماوەی ژیانی بە فێربوونی زانست بەسەر بردووە و زانایەکی گەورەی فیقهی بووە و دامەزرێنەری مەزهەبی حەنەفییە، و ابو حنیفه (رەحمەتی خودای لێ بێت) خاوەنی کەسایەتییەکی بەهێز و درەوشاوە بووە و پاڵنەرەکانی خودی و دەرەکی

کاریگەرییان هەبووە لەسەر پێکهاتەی کەسایەتی فیقهی ئەو کەسە گرنگترین ئەو پاڵنەرانە بریتین لە:

أ- ئەو خەسڵەتە خودییانەی لەسەری دامەزراوە.

ب- ئەو زانایانەی پێیاگەیشتووە زانستی لێ وەرگرتوون، بەجۆرێك كەوا ئەوان رێگای فیقهییان بۆ دیاری کردووە.

ج- ژیانی کەسایەتی و ئەزموونی لە قۆناغەکانی ژیان و پەیوەندی بەهێزی بەو کۆمەڵگایەی تیایدا ژیاوە.

د- ئەو بناغە فیکرییەی بەهەرەکانی لێ وەرگرتوون، سەرەڕای ئەوە مامۆستا (حماد کوڕی أبی سلیمان) کاریگەری لەسەر هەبووە بەجۆرێك کەوا بۆ ماوەی (١٨) ساڵ لە قوتابخانەی کوفە لەلای ماوەتەوە.

**گرنگترین سەرچاوەکانی فیقهی ئەو مەزهەبە:** بریتین لە قورئان و فەموودە و ئیجماع و قیاس و عرف و استحسان و مصلحە و قولی صحابی.

٥- (**الإمام مالك** / ٩٣- ١٧٩هـ): بریتیە لە مالك کوڕی ئەنەس کوڕی مالك کوڕی عامر ئەصبحی[١] خەڵکی شاری مەدینەی پیرۆزە و قوتابی پێشەوایانی قوتابخانەی فەرموودە بووە[٢].

مامۆستاکانی بریتی بوون لە عبدالرحمن کوڕی هورمز و عبدالرحمن ناسراو بە رەبیعەی رەئی، و لە تەمەنی (١٧) ساڵی کاری وانە وتنەوە و فیقهی لە شاری مەدینەی پیرۆز ئەنجامداوە و لە مزگەوتی پێغەمبەرﷺ دادەنیشت و لە کاتی خوێندنەوەی فەرموودە ئاماژەی بۆ گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەرﷺ دەکرد.

---

[١] - ئەصبەحی هۆزێکی یەمەنییە.

[٢] - بارەگاکەی لە مەدینەی پیرۆزە، هەروەکو بارەگای قوتابخانەی رەئی لە شاری کوفەیە.

سەرچاوەکانی فیقهی ئـەو مەزهەبـە: بـریتین لـە قورئـان و فـەمووده و ئیجمـاع و قیاس و استحسان و مصلحە و ذرائع و عرف و قولی صحابی و کـاری خـەڵکی مەدینـە (ئیجماعی ئەهلی مەدینە).

٦- (الامام الشافعي/ ١٥٠-٢٠٤هـ): بریتیە لـە عبـدالله کـوڕی محمـد کـوڕی ئیـدریس کوڕی عباس کوڕی شافیعی کوڕی عبدالمطلب کوڕی عبدالمناف — کە دەکاتە باپیری چوارەمی پێغەمبەرﷺ و باپیری نۆیەمی ئیمامی شافیعی.

دوای ئەوەی باوکی چووە غەزە لەوەی لە دایك بوو و باوکی لـەوێ کۆچـی دوایـی کردووە و دوای دوو ساڵ دایکی هێنایەوە بۆ زێدی باوباپیرانی لە مەککە.

زانستی فیقهی لە عیراق لە بەغداد لـە محمـد کـوڕی حسـن شـیبانی قوتـابی ابـی حنیفە فێربووە هەروەها زانستی فیقهی لە ئیمامی مالك وەرگرتووە.

سەرچاوەکانی فیقهی ئـەو مەزهەبـە: بـریتین لـە قورئـان و فـەمووده و ئیجمـاع و قیاس و استصحاب و قولی صحابی.

بیرۆکەی فیقهی لە نێوان بیرۆکەی ئەهلی حـەدیس و ئـەهلی رەئـی بـووە چـونکە بۆچوونی ئیمـامی حەنیفـە و بۆچـوونی ئیمـامی مـالیکی یەکخسـتووە، و فیقهـی ئـەو ئیمامە لە عیراق پێـی دەگـوترا قـەولی قـەدیم دواتـر کاتێـك چـووە میسـر و بـە هـۆی کاریگەری ژینگەی میسر لە سەر وتەکانی پێشووی پاشگەزبوویەوە و قوتابخانەیەکی نوێی دامەزراند و فیقهێکی نوێی دانا و پێی گوترا مەزهەی نوێ.

٧- (الامام أحمد بن حنبل/١٦٤ -٢٤١هـ ) بریتیە لە عبدالله کوڕی محمد کوڕی حنبـل کوڕی هلال کوڕی شیبانی مروزی[١] بغدادی[٢] .

لەلای زانایانی بەغداد و کوفە و بەسرە و مەدینەی خوێندووە.

---

[١] - واتا لە بنەڕەتدا مروزیە.

[٢] - واتا لە پێگەیشتن و دروست بوونی.

سەرچاوەکانی فیقهی ئەو مەزهەبە: بریتین لە قورئان و فەموودە و فەتوای یاوەران و قیاس و نکولی لەوە دەکات کەوا گشت زانایانی فیقهی لە یەک کاتدا لە سەر یەک بۆچوون کۆک بن و بوونی شتێکی لەو جۆرە بە شتێکی مەحال دادەنێت.

٨- (الامام داود الظاهري/ ٢٠٢-٢٧٠هـ): بریتیە لە ابو سلیمان داود کوڕی علی کوڕی خلف بەغدادی بە ڕەچەڵەک ئەسفەهانییە.

**دامەزرێنەری مەزهەبی (الظاهرية).**

سەرچاوەکانی فیقهی ئەو مەزهەبە: بریتین لە لایەنی دیاری قورئان و فەموودە و تەنها ئیجماعی یاوەران و جگە لە ئیجماعی زانایانی تر.

## باسی سێیەم:
## لێکدانەوە – هەوڵدان- و لاساییکردنەوە
## الاجتهاد و التقليد

**ئیجتیهاد**: لە زاراوەی زانستی بریتیە لە: هەوڵدان بۆ دەرخستنی حوکمی خودا بۆ ئەو بابەتەی لە حوکمەکە مەبەستە.

ئەگەر حوکمی راستەقینەی خودا دەربخات دەبێتە ئیجتیهادێکی راست ئەگەرنا بە ئیجتیهادی هەڵە دادەنرێت و لە حاڵەتی ئیجتیهادکردنی راست موجتەهید دوو پاداشتی هەیە پاداشتێك لەسەر هەوڵدانی و پاداشتێکیش لەسەر پێکانی ئامانجی ناوبراو، و لە حاڵەتی هەڵەکردن یەك پاداشتی هەیە ئەویش لەسەر هەوڵدان بە نیاز پاکی.

ئەو راستییە لە دەقی فەموودەی پێغەمبەرﷺ هاتووە کە دەفەرمووێت (ئەگەر دادوەر بڕیاریدا [1] و ئیجتیهادی کرد و راستی کرد دوو پاداشتی هەیە و ئەگەر بڕیاریدا و ئیجتیهادی کرد و هەڵەی کرد یەك پاداشتی هەیە).

مەرجە تەقلیدییەکانم پشتگوێ خستووە کە لە گشت باسێك کەوا ئەو بابەتەی تیادا بێت دووبارە بوونەتەوە لەوانە دەبێت موجتەهید پیاو بێت و ئازاد بێت و دادپەروەر بێت و جگە لەوانە چەند مەرجێکی تر کەوا رۆڵیان نەماوە بۆ بوونی شایستەیی بۆ ئیجتیهادکردن، بۆیە ئەو مەرجانەی خوارەوە پێشنیار دەکەم:

---

[1] – واتا ئەگەر ویستی بڕیار بدات چونکە ئیجتیهاد دوای بڕیاردان نییە بەڵکو پێش بڕیاردانە.

١- ئەو کەسەی دەیەوێت ئیجتیهاد بکات شارەزا بێت لە مەبەستەکانی شەریعەتی کە بریتین لە بەرژەوەندی ڕەوا چونکە خودای گەورە پەیامی محمد پێغەمبەری ﷺ تەرخانکردووە بۆ بە دەستهێنانی ئەو بەرژەوەندییانە بۆ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی و هەروەکو روو دەکاتە پێغەمبەر ﷺ و دەفەرموێت ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ[1]﴾ واتا: ئێمە تۆمان تەنها وەکو رەحمەت بۆ جیهانیان ناردووە، و رەحمەت بریتیە لە بەرژەوەندی واتا بە دەستهێنانی سوود یان دوورخستنەوەی زیان چونکە خودای گەورە هیچ پێویستی بە خەڵکی و خواپەرستی و گوێڕایەڵی ئەوان نییە.

٢- دەبێت ئازا و چاونەترس بێت و لە لۆمەی لۆمەکار نەترسێت چونکە ئەرکێك ئەنجام دەدات کە خودای گەروە لە سەری پێویست کردووە لەو حاڵەتەی کەوا شایستەی ئیجتیهاد بێت.

٣- لە کێشەیەکی دیاریکراو سوود و زیانەکە لەگەڵ یەکتری بەرامبەر بکات و یەکەم جار حوکمی کێشەکە دەربخات چونکە هەر شتێك سوودی بۆ تاك یان بۆ کۆمەڵگە یان بۆ هەردووکیان هەبێت خودای گەورە بە دروستی داناوە ئەگەر ئەو سوودە لەسەر حیسابی زیانی کەسێکی تر نەبێت.

هەر شتێك زیانی بۆ تاك یان بۆ کۆمەڵگە یان بۆ هەردووکیان هەبێت لەلای خودای گەورە دروست نییە ئەگەر ئەو زیانە سوودێکی گشتی لە پشتەوە نەبێت.

بۆ نموونە لێ سەندنەوەی موڵکی تایبەتی لە کەسێك لە بەرامبەر پارە هەندێك جار زیان بە خاوەن موڵکەکە دەگەیەنێت بەڵام لێ سەندنەوەی خاوەنداریێتی دروستە لەبەر بەرژەوەندی گشتی.

---

[1] - سورة الانبیاء/١٠٧.

٤- دەبێت بابەتەکە جێگەی ئیجتیهاد بێت چونکە ئەگەر مەسەلەیەك دەقی لەسەر بێت ئیجتیهاد بوونی نییە واتا ئەگەر لە مەسەلەیەك دەقەکە بە شێوەیەکی بنبڕ حوکمی مەسەلەکەی دیاریکرد بێت هەروەکو فەرموودەی خودای گەورە ﴿یُوصِیکُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِکُمْ لِلذَّکَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَیَیْنِ ...﴾النساء/١١. واتا: خودا ئێوەی راسپاردووە کەوا لە منداڵەکانتان هەر کوڕێك بە قەد دوو کچ میرات وەربگرێت و دەفەرمووێت: ﴿وَلَکُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُکُمْ إِن لَّمْ یَکُن لَّهُنَّ وَلَدٌ .....﴾النساء/١٢. واتا ئێوە نیوەی میراتی خێزانەکانتان وەردەگرن ئەگەر خێزانەکانتان منداڵیان نەبێت. جگە لەوە چەند دەقێکی تر جێگەی ئیجتیهاد نیین.

٥- بۆچوونی یەکێکی پێشتر کاریگەری لەسەر نەبێت یان تەقلیدی مەزهەبێك نەکات چونکە پەیوەست بوونی بەو مەزهەبە پێچەوانەی فەرمانی خودای گەورەیە ﴿فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّکْرِ إِن کُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾الأنبیاء/٧. واتا ئەگەر ئێوە نەتان زانی پرسیار لە کەسانی خاوەن زانست بکەن، چونکە ئەو ئایەتە ئاماژەی بە کەسێکی دیاریکراو یان مەزهەبێکی دیاریکراو یان کاتێکی دیاریکراو نەکردووە بەڵکو تەنها بە شێوەیەکی گشتی باسی کەسانی خاوەن زانست دەکات کەواتە تەقلیدکردنی مەزهەبێك و گواستنەوەی ئەو مەزهەبە لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر گەورەترین هەڵەیە کەوا مسولمان لە ژیانی ئاینی ئەنجامی دەدات.

٦- لە دڵەوە باوەڕی وابێت ئەو حوکمەی بە ڕێگەی ئیجتیهاد دەیدۆزێتەوە حوکمێکی دادپەروەرە کەواتە ئەگەر هەستی بە نادادپەوەری ئەو حوکمە کرد کەوا پێشتر ئیجتیهادی کردووە پێویستە لەسەری لە ئیجتیهادی پێشووی پاشگەز بێتەوە و سەر لە نوێ ئیجتیهاد بکاتەوە بە مەبەستی دەرخستنی

حوکمێکی دادپەروەر هەروەکو جێنشینی دووەم عومەری کوڕی خەتاب (خودا لێی رازی بێت) وایکردووە [1].

٧- موجتەهید یان قوتابیانی داوا ناکەن مەزهەبەکەیان ببێتە مەزهەبێکی پیرۆز و موقەددەس چونکە تەنها قورئان و فەرموودە پیرۆز و موقەددەسن، و مەزهەب تەنها بۆچوون و راڤەکردنی دەقەکانە بۆیە هیچ کەسێك بۆی نییە بانگەشەی ئەوە بکات کەوا ئەو راست دەکات ئەوانی تر هەڵەن هەروەکو جێنشینی یەکەم أبو بەکری صدیق (خودا لێی رازی بێت) وایکردووە [2].

---

[1] – پوختەی مەسەلەکە ئەوەیە عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) لە کێشەیەکی میرات ئیجتیهادی کرد کە بریتی بوو لەوەی ئافرەتێك مردبوو پیاو و دایك و دوو برای لە دایك و ژمارەیەك برا و خوشکی دایك و باوکی لە پاش بەجێ مابوون.
بەو جۆرە بڕیاریدا بە: بۆ مێردەکە نیوەی میرات چونکە کوڕ و کچی نەبوون و دایك یەك لەسەر شەش لەبەربوونی ژمارەیەك لە براو خوشك و براکانی لە دایك یەك لەسەر سێ چونکە زیاتر بوون لە یەك و بڕیاریدا بە بێبەشبوونی برا و خوشکی دایك و باوکی چونکە خاوەن فەرزەکان گشت میراتەکەیان برد چونکە مەسەلەکە لە شەشە واتا پێویستە لەسەر داوەر میراتەکەی بکاتە شەش بەش (٣) بۆ مێرد و (١) بۆ دایك و (٢) بۆ براکانی لە دایك (٣+١+٣=٦).
لە ساڵی داهاتوو لەسەردەمی خەلافەتی ناوبراو مەسەلەکە دووبارە بوویەوە و ویستی بڕیار بدات بە ئیجتیهادی پێشووی و یەکێك لە برا خوشکەکان گوتی ئەی گەورەی باوەڕداران دامانێنا باوکمان بەرد بوو ئایا ئێمە لەگەڵ براکانی لە دایك لە یەك دایك هاوبەش نین و یەکێکی تر گوتی ئەو باوکەی منی لە میرات بێبەشکردووە بیخە ناو دەریا بۆیە ئەو مەسەلەیە جارێك بە مەسەلەی بەردینی (الحجرية)و جارێکی تریش بە و فڕێدان (أرمية) دەناسرایەوە دواتر بڕیاریدا بەوەی برا و خوشکەکانی دایك و باوکی لەگەڵ براکانی لە دیك هاوبەش بن لە یەك لەسەر سێ و بڕیاریدا بە دابەشکردنی ئەو یەك لەسەر سێیە بەسەر گشتیان بە یەکسانی بۆیە ئەو مەسەلەیە بە مەسەلەی (المشركة/ هاوبەشی) ناوبرا.

[2] – هەروەکو خەلیفەی یەکەم ابوبکر (ﷺ) کاتێك دەربارەی کەلالە پرسیاری لێکرا لە فەرموودەی خودای گەورە ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَالَةً أَو امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ فَإِن كَانُوا أَكْثَرَ مِن ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاء فِي الثُّلُثِ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ وَصِيَّةً مِّنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ {النساء/١٢}﴾ فەرمووی من بە بۆچوونی خۆم ئیجتیهاد دەکەم ئەگەر
←

## گرنگی ئیجتیهاد:

ئیجتیهاد یەکێکە لە کاروبارە ئاینییەکان و دونیاییەکان لە گشت کات و شوێنێك و یەکێکە لە پێویستییەکانی ژیانی مرۆڤ و گرنگترین ئامرازە بۆ پێشکەوتنی شارستانی لە کاروبارەکانی دونیایی و گەیشتن بە حوکمێکی دادپەروەر کە بەختەوەری مرۆڤایەتی و بەرهەمی دوارۆژ لە کاروبارەکانی ئاینی دەهێنێتەدی، و گەواهیدەری ئەو گرنگییەش، جیهانی رۆژئاوا و جیهانی رۆژ هەڵاتە و سەبارەت بە سەردەمی ئێستا گەیشتوونەتە لوتکەی شارستانی و داهێنانی جۆرەها رەنگ لە بەرهەمەکانی تەکنەلۆژیا بە رێگەی هەوڵدان و ئیجتیهاد بەڵام جیهانی ئیسلامی لە دواوە ماوەتەوە هیچ لە گەورە و بچووکەکانی دروستکراوەکانی رۆژئاوا نازانن بەجۆرێك کەوا نیشتیمان و خێروبێری وڵاتەکانیان داوە بە گەلانی رۆژئاوایی و رۆژهەڵاتی و مسولمامانان بە شێوەیەکی راست و دروست لە ئاینەکەی خۆیان تێنەگەیشتوون و کار بە ئیجتیهاد ناکەن بۆ بەرەو پێش بردنی ژیانی دونیاییان و، گرنگترین فاکتەرەکانی ئەو دواکەوتنە لە جیهانی سێیەم و بە تایبەتی لە جیهانی ئیسلامی بریتیە تەقیلدکردنی کەسانی تر و بە پیرۆزدانانی بۆچوونی کەسانی پێش خۆیان و بە تایبەتی زانایانی ئاینی.

### لاسایکردنەوە و هۆکارەکانی – التقلید و أسبابە:

تەقلید بریتیە لە وەرگرتنی حوکم لە کەسێکی تر بەبێ زانینی بەڵگەی قورئان یان فەرموودەی پێغەمبەرﷺ.

هەروەکو پێشتر باسمانکرد تەقلید بە یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی دواکەوتنی مسولمانان لە تێگەیشتنیان لە ئاین و دونیایان و پەیڕەوکردنی ئەو شتە پڕوپووچ و

---

راستم کرد ئەوە لە خوداوەیە و ئەگەر هەڵە بووم لە من و لە شەیتانەوەیە کەلالە واتا: میرات نەگرتن بە رێگەی باوکایەتی و کوڕایەتی واتا میراتگری لە باوان و نەوەکان نەبێت بەڵکو لەوانەی تر بێت وەکو (برا و خوشەکەکان).

ئیسرائیلیاتانەی هاتوونەتە ناو ئاینی مسولمانان بەجۆرێك كەوا بە شێوەیەكەی راست و دروست كاریگەری لەسەر ڕێڕەوی ژیانیان هەبووە.

## هۆكارەكانی تەقلید و بڵاوبوونەوەی تەقلید:

لە ناوەڕاستی سەدەی چوارەمی كۆچی تەقلید بڵاوبوویەوە و ئیجتیهاد وەستا و گرنگترین هۆكارەكانی بڵاوبوونەوەی تەقلید بریتین لە:

١- بانگەشەی مەزهەبی بەجۆرێك كەوا قوتابیانی پێشەوایانی مەزهەبەكان هەڵساون بە نووسینەوەی بیروڕاكانی پێشەواكانیان و شیكردنەوەیان بۆ كردووە و بەرگرییان لێكردوون بۆیە بۆچوونی هەر مەزهەبێك لە ناوچەیەك بڵاوبوویەوە و گشت و تایبەت دەمارگیری بۆ ئەو مەزهەبە هەبوو تاكو بیروڕاكانی زانایانی فیقهی پیرۆزی دەقە شەرعییەكانیان وەرگرت بەڵكو لە ئاستی دەقە شەرعییەكان تێپەڕین چونكە لە مەسەلەیەك بۆچوونی زانایەكی فیقهی لە قورئان یان فەرمووده باشتربوو ئەگەر لەگەڵ یەكتردا ناكۆك بوونایە بۆ نموونە قورئان هەر سێ تەلاقەكانی پیاوی بەسەر سێ كات دابەشكردووە كە دەفەرمووێت:﴿ الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ...﴾البقرة/٢٢٩. واتا: تەلاقدان دوو جارە یان هێشتنەوەی بە باشی یان ئازادكردنی بە باشی، و (التسریح بالاحسان) بریتیە لە تەلاقدان بۆ جاری سێیەم و صەحیحی موسلیم جەخت لەسەر ئەو دابەشكردنە دەكاتەوە بەو جۆرەی خوارەوە ئیبن عەباس (ر-خ) گێڕاویەتییەوە: تەلاقدان لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ و ئەبو بەكر و دوو ساڵ لە خەلافەتی عومەر تەلاقی سێیەم یەك بوو و عومەری كوڕی خەتتابﷺ فەرموویەتی (خەڵكی پەلەیانكردووە لە شتێك كەوا موڵەتی تیادایە و ئەگەر بەسەریاندا بڕۆینین لەدەستیان دەچێت[1]).

---

[1] - صحیح مسلم/١٠٩٩/٢.

ئەو ئیجتیهادەی ئیمامی عومەرﷺ بە سیاسەتی شەرعی دا‌‌نرێت بەجۆرێك کەوا رێسایەکی دانا (هەر کەسێك پەلە لە شتێك بکات پێش پێگەیشتنی بەبێبەش بوون لەو شتە سزا دەدرێت) و نەگەڕانەوەی ئافرەت بۆ لای پیاوەکەی لەو حالەتەی پیاوەکە هەرسێ تەلاقەکەی لە یەك کاتدا کۆکردۆتەوە سزایەکی تەمبێکردنە بۆ هەر کەسێك واز لە فەرمانی قورئان و روونکردنەوەی صەحیحی موسلیم هێناوە.

لێکدانەوەی تەلاق لە (الطلاق مرتان) بەوەی کەوا مەبەست تەلاقی رەجعییە هەڵەیەکی ئاشکرایە چونکە دابەشکردنی تەلاق بۆ تەلاقی رەجعی و بائین لە سەردەمی نەفامی (پێش ئیسلام) نەبووە هەروەها لە کاتی دابەزینی ئەو ئایەتە پیرۆزەش نەبووە چونکە ئەو دابەشکردنە زانایانی مسولمان دوای دابەزینی ئایەتەکانی پەیوەست بە ئەحکامەکانی تەلاق دایانهێناوە.

٢- فەرمانڕەواکان هاوکاربوونە بۆ بڵاوبوونەوەی مەزهەبە فقهییەکان چونکە کاتێك فەرمانڕەوای وڵاتێك بە مەزهەبێك پابەند دەبێت و پشتگیری دەکات هاوڵاتیانیش شوێنی دەکەون بەپێی ئەو وتەیە (خەڵکی لەسەر ئاینی پادشاکانیانن).

٣- سپاردنی دادگا بە کەسانی ناشیاو و ئەو کەسانە شوێنی یەکێك لە مەزهەبەکان دەکەون و بەپێی ئەو مەزهەبە دادوەری لە نێوان خەڵکی دەکەن بۆیە دەبنین لەسەردەمی عەباسی بڕیارەکانی دادوەرانی جیهانی ئیسلامی پێچەوانەی یەکتر بوون تاکو هارون رەشید ئەبو یوسفی بە دادوەری دادوەران هەڵبژارد وەکو وەزیری دادی ئەمڕۆ بە مەبەستی یەکخستنەوەی بڕیارەکانی دادوەری و تەقلیدکردنی مەزهەبێکی دیاریکراو و ئەبو یوسف مەزهەبی ئەبی حەنیفەی هەڵبژارد بۆ ئەوەی لە دادگاکان پیادە بکرێت.

٤- نووسینەوەی مەزهەبەکان و بیروڕاکانی زانایانی مسولمان و کارکردنیان بە شێوەی کوێرانە بەو مەزهەبە نووسراوانە.

٥- گفتوگۆی زانایـان بـه هـۆی پابەنـد بوونیـان بـه فـەتوا و گفتوگـۆ و بـیروڕای پێچەوانە و بە بۆچوونی راشکاوانەی مەزهەبەکەیان لەو گفتوگۆ و مناقەشـەیە رزگار دەبوون.

٦- لاوازی سیاسـی لـە جیهـانی ئیسـلامی و دابـەش بـوونی دەوڵـەتی ئیسـلامی بەسـەر چـەند دەوڵـەتێکی بچـووك و ئـەوەش بـووە هـۆی لاوازبـوونی گیـانی سەربەخۆیی و ئیجتیهاد لەلایەن زانایان.

٧- گشت موقەلیدێك باوەڕی وایە کەوا مەزهەبەکـەی راسـتە و پێویسـتە پێیـەوە پابەند بێت و جگە لە مەزهەبەکەی ئـەو مەزهەبـەکانی تـر هەڵـەن و پێویسـتە لێیان دوور بێت.

# وانەی پێنجەم

## فەلسەفەی خواپەرستییەکان لە ئیسلامدا

## فلسفة العبادات في الاسلام

فەلسەفەی گشت شتێك بریتیە لە ئامانج و دەرەنجام و بەرهەمی ئەو شتە و ئەو بەرژەوەندییەی لەو شتە دروست دەبێت لە بەدەستهێنانی سوود یان دوورخستنەوەی زیان، و فەلسەفەی خواپەرستییەکان بەو جۆرەی خودای گەورە ویستوویەتی بریتیە لە نەهێشتنی تاوان چونکە ئامرازی خۆپاراستنە لە تاوان و هەر کەسێك بە راست و دروستی خواپەرستییەکان بەجێ بگەیەنێت دەپارێزرێت لە گشت کارێکی ناڕەوا کەوا ببێتە هۆی بەرپرسیارییەتی تاوانی[1] یان بەرپرسیارییەتی شارستانی[2].

---

[1] – بەرپرسیارییەتی تاوانی یان سزایی: بریتە لە زیانگەیاندن بە ئەرکێکی یاسایی کەوا دەقی تاوانی شەریعەت یان یاسا دیاریکردووە، و سزای ئەو بەرپرسیارییەتییە بریتیە لەو سزاییەی لە دەقی شەرعی یان دەسەلاتی یاسادانی سەردەمی دیاری دەکات.

[2] – بەرپرسیارییەتی شارستانی بریتیە لە زیان گەیاندنی کەسێك بە ئەرکێکی شەرعی یان یاسایی گشتی وەکو پابەندکردنی گشت مرۆڤێك لە رووی شەرع یان یاسا بە زیان نەگەیاندن بە کەسێکی تر بەبێ پاساو یان زیان نەگەیاندن بە ئەرکێکی شەرعی یان یاسایی تایبەتی وەکو ←

## خواپەرستی (العبادة):

بریتیە لە کردەوەی مرۆڤی راسپێدراو (المكلف) بەپێچەوانەی ئەو نەفسەی فەرمان بە خراپە دەکات بە مەبەستی بە گەورە دانانی خودای پەرستراو و بە ئومێدی بە دەستهێنانی بەرهەمەکەی کە بریتیە لە بەرژەوەندی دونیایی و پاداشتی دواڕۆژ.

فەلسەفەی گشت جۆرەکانی خواپەرستییەکان بە گشتی ئەگەر بە شێوەیەکی راست و دروست بەجێ بگەیەنرێن بریتیە لە:

١- دەروونی مرۆڤ لە چاڵی ماددی بەرەو جیهانی بەرزی مەعنەوی نموونەی هەر بەرز بەرزدەکاتەوە.

٢- مرۆڤ دووردەخاتەوە لە دیاردەی خۆکردنە قوربانی شتە ماددییەکان و بەهێزی دەکات بە هێزی روحی.

٣- پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ پەروەردیگاری بەهێز دەکات، بەهێزکردنێکی روحی کە بریتیە لە بنچینەی شکۆمەندی مرۆڤ و پاراستنی مرۆڤایەتی مرۆڤ.

٤- مرۆڤ دەپارێزێت لە سەرپێچیکردنی شەریعەت و یاسا و سیستەمی گشتی و ئاکارە گشتییەکان.

٥- دەروون بەهێز دەکات بە هێزی روحی کەوا توانای بەرەنگاربوونەوەی کێشەکان و چارەسەرکردنی کێشەکانی هەیە بە رێگا راست و دروستەکان.

٦- دڵی تاکەکانی کۆمەڵگە بۆ یەکتر رادەکێشێت و گیانی خۆنەویستی و هاوبەرپرسیارییەتی و یەکگرتن و هاوکارییان لە ناودا دروست دەکات.

٧- مرۆڤ قەدەغە دەکات لە زۆرداری هەرێمایەتی و رەگەزی و رەنگ و روخسار.

٨- مرۆڤ پابەند دەکات و هەست بە بەرپرسیارییەتی بەرامبەر بە کەسانی تر دەکات.

---

زیان گەیاندنی یەکێك لەلایەنەکانی گرێبەست بە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی بەرامبە بە لایەنەکەی تر.

٩- بە شێوەیەکی گشتی فەلسەفەی خواپەرستییەکان بریتیە لەوەی کەوا خواپەرستی ئامرازێکی خۆپارێزییە بۆ نەهێشتنی تاوانەکان.

شەریعەتی ئیسلامی بۆ خۆپاراستن زیاتر پشت بە ئامادەکاری خۆپارێزی دەبەستێت پێش ڕوودانی کردەوەی تاوانکاری زیاتر لەوەی کەوا پشت بە ئامرازەکانی چارەسەری (سزاکان) ببەستێت بەپێچەوانەی یاساکانی سزایی دەستکرد[1] کە پشت بە ڕێگاکانی چارەسەری دەبەستن و تەنها دوای ڕوودانی تاوان ڕێگاکانی خۆپارێزی بەکاردەهێنن بەپێچەوانەی ئەو ڕێسا زانستییەی دەڵێت: (خۆپاراستن باشترە لە چارەسەرکردن).

## جۆرەکانی خواپەرستی - أنواع العبادات:

ئەو خواپەرستییانەی لەسەر مرۆڤی بالغ و ژێر پێویست کراون لە ڕووی سروشتی بە سەر سێ جۆر دابەش دەکرێن کە بریتین لە:

١- ئەو خواپەرستییانەی تەنها جەستیین و بەرهەمی ئەو خواپەرستییانە تەنها بۆ ئەو کەسە دەگەڕێتەوە کەوا ئەنجامیان دەدات بۆیە بە هیچ شێوەیەك جێکاری[2] لەو خواپەرستییانە نییە وەکو نوێژ و ڕۆژوو.

٢- ئەو خواپەرستییانەی تەنها داراییین و ئەو خواپەرستییانە بەرهەمیان هەر دەبێت یەکسانە کەسی ڕاسپێردراو ئەنجامیان بدات یان کەسێکی تر چونکە فەلسەفەی ئەو خواپەرستییانە بریتیە لەوەی کەوا بەو کەسە ڕانەسپێدراون کە بەرپرسە

---

[1] - واتا/ کەسێکی تر لە جیاتی کەسی ڕاسپێدراو ئەنجامی بدات.

[2] - بۆ نموونە لە ماددەی ١/١٠٣ لە یاسای سزاکانی عیراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩ هاتووە/ دروست نییە ئەو ئامادەکارییە خۆپارێزیەی کە لە دەقی یاساییدا هاتووە دەرهەق کەسێك بگیردرێتەبەر بەبێ ئەوەی کە ئەنجامدانی کردەوەیەکی ئەوهای لە سەر چەسپا بێت کە یاسا بە تاوانی داناوە و حاڵەتەکەشی بە مەترسی دانابێت بۆ سەر سەلامەتی کۆمەڵگا.

لێیان بۆیە بە عوزر و بەبێ عوزر جێکارییان تیادا هەیە وەکو زەکات و بەخشین لە پێناوی خودا (واتا لە پێناوی بەرژەوەندی گشتی).

٣- جۆرێکی تر تێکەڵاوە واتا لە هەوڵدانی جەستەیی و بەخشینی سامان پێکدێت، و تەنها بە بەشداری کردەوەی جەستەیی و خەرجکردنی سامان نەبێت ئەنجام نادرێت، و ئەگەر عوزرێك هەبێت وەکو نەخۆشی و پیری دەکرێت یەکێك لە جیاتی یەکێکی تر ئەنجامی بدات و بەبێ عوزر جێکاری تیادا نییە، وەکو بەجێگەیاندنی فەریزەی حەج.

باسکردنی فەلسەفەی ئەو جۆرە خواپەرستییانە لە رووی شێوەیی بەسەر سێ باس دابەش دەکرێن:

# باسی یەکەم:
# فەلسەفەی ئەو خواپەرستییانەی تەنها جەستەیین
# فلسفة العبادات البدنية المحضة

لە رووی واجبی و پێویستی بەجێگەیاندن دوو جۆرن نوێژ و رۆژوو.

## یەکەم: فەلسەفەی نوێژ:

نوێژ خواپەرستییەکە کەوا لە چەند کردەوە و وتەی تایبەتی پێک دێت و بە (الله أکبر) دەستپێدەکات و بە سەلامکردن لە گشت ئەوانەی لە تەنیشت نوێژ خوێنن یان لە گشت مرۆڤێك کەوا سەلامەتی و ژیان لە سایەی ئاشتی و دڵنیایی بخوازێت کۆتایی دێت.

نوێژ خواپەرستییەکی کۆنە و لە ئاینەکانی پێشووش هەبووە چونکە لە ژیانی مرۆڤ گرنگە و خودای گەورە دەربارەی پەیامی ئیسماعیل (سەلامی خودای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ﴿وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُ بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِ مَرْضِيًّا﴾مريم/٥٥. واتا: فەرمانی بە قەومەکەی دەکرد کەوا نوێژ بکەن، و دەربارەی موسی (سەلامی خودای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتًا وَاجْعَلُواْ بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ﴾يونس/٨٧. واتا: نیگامان بۆ موسا و براکەی (سەلامی خودایان لەسەر بێت) ناردووە تاکو چەند ماڵێك بۆ قەومەکەیان دروست بکەن و ماڵەکانیان بکەنە رووگە و شوێنی خواپەرستی و نوێژ بکەن و موژدە بە باوەڕداران بدەن و دەربارەی عیسا (سەلامی خودای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ﴿وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا﴾مريم/٣١. واتا: خودا

رایسپاردوم کەوا تاکو لە ژیاندا مابم نوێژ بکەم و زەکات بدەم.

بەڵام سیستەمی بەجێگەیاندنی نوێژ لەگەڵ ئاینەکانی تر جیاوازە.

نوێژ گرنگییەکی زۆری هەیە بۆ ئەو مرۆڤەی دەیەوێت شکۆمەندی و ڕێزی خۆی بپارێزێت و کەسایەتی خۆی بەو جۆرە پێبگەیەنێت کەوا خەڵکی ڕێزی بگرن و لەلای خودای گەورەش بایەخی هەبێت.

دەکرێت ئەو گرنگییە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە پێی دەگوترێت فەلسەفەی نوێژ کەوا لەو چەند خاڵەی خوارەوە بە کورتی ئاماژەی پێ دەکەین:

١- مرۆڤ بە نوێژکردن دەتوانێت بەرگەی نەخۆشییە خراپەکان بگرێت و وزەیەکی ڕوحی تیادا بەرجەستە دەبێت کەوا لە گشت کردارێکی پێچەوانەی مرۆڤایەتی و یاسا و سیستەمی گشتی و ئاکارە گشتییەکان دەیپارێزێت و هەروەکو ئەو ڕاستیە لە دەقی فەرموودەی خودای گەورەدا هاتووە: ﴿.... وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ ....﴾ العنكبوت/٤٥. واتا، نوێژ بکە چونکە بە ڕاستی نوێژ لە کاری خراپە و کردەوەی داوێنپیسی قەدەغەت دەکات، و قورئانی پیرۆز دەستەواژەی (الاقامة - واتا ئەنجامدان)ی بەکارهێناوە کە جیاوازە لەگەڵ بەجێگەیاندن چونکە ئەنجامدانی نوێژ واتا ئەنجامدانی بە ترس و ملکەچی و هەستکردن بەوەی لەگەڵ پەروەردیگاری زانای پەنهان و بینەر و گەواهیدەر قسە دەکات.

بەڵام بەجێگەیاندن نەریتێکە کەوا لە کاتەکان دووبارە دەبێتەوە و هیچ ناوەڕۆك و مانایەکی تیادا نییە و نزیکە هیچ جیاوازییەك لە نێوان ئەو بەجێگەیاندنە و نەریتی جگەرەکێشان نەبێت.

بۆیە زۆر لە نوێژ خوێنان نوێژ دوورییان ناخاتەوە لە نقووم بوون لەلایەنی ماددی و بەکارهێنانی فێڵ و درۆ و فێڵبازی لە مامەڵە داراییەکان لەگەڵ کەسێکی تر لە پێناو بەدەست هێنانی چەند دینارێکی کەم و بێ نرخ لەسەر حیسابی کەسانی تر و ئاین و بەها و ڕەوشتی کەسانی تر.

٢- نوێژ کاتەکانی مرۆڤ ڕێك دەخات تاکو پارێزگاری لە کات بکات کەوا بە نرخترین شتی تەمەنی مرۆڤە چونکە گشت شتێك قەرەبوو دەکرێتەوە تەنها تەمەن و کات نەبێت.

بۆیە نوێژ فەرمان بە نوێژ خوێن دەکات و پێی دەڵێت: (زوو بخەوە و زوو هەڵسە) بۆ ئەوەی نوێژی بەیانی لەدەست نەدەی و دواتر ئەو کارانە ئەنجام بدە کەوا دوای بەجێگەیاندنی نوێژ پێویستن و نان بخۆ چونکە نوستنی ئەو کاتە سەرچاوەی زۆر لە نەخۆشییەکانە و هۆکارێکی کاریگەرە بۆ راهاتن لەسەر تەمبەڵی و لەدەستدانی چالاکی.

٣- نوێژ قوتابخانەیەك مرۆڤ فێری پاك و خاوێنی دەکات: خاوێنی دڵ، خاوێنی جەستە و خاوێنی جل و بەرگ، خاوێنی شوێن، چونکە گشت ئەو خاوێنیان لە نوێژدا پێویستن.

٤- نوێژ وەرزشێکی جەستەییە و چالاکی مرۆڤ بەهێز دەکات و مرۆڤ دەژێنێتەوە و بەپێچەوانەوە مرۆڤ تووشی نەخۆشی تەمبەڵی دەبێت.

٥- نوێژ ئامرازێکە بۆ بەدەستهێنانی هەستکردن بە کەسایەتی و ڕێز و شکۆمەندی و سەربەخۆیی و نەترسان لە هیچ دروستکراوێك جگە لە خودای گەورە و نوێژ خوێن لە کاتی دووبارەکردنەوەی دەستەواژەی ﴿إیاك نعبد﴾ واتا تەنها تۆ دەپەرستین، ئەو هەستەی لەلا دروست دەبێت چونکە پێش خستنی ئەو وشەیەی پێویستە دوابخرێت لە زانستی بەلاغە واتای (الحصر/ تەنها ئەو) دەگەیەنێت[1].

---

[1] - (نعبد) فعل مضارع و فاعلە ضمیر مستتر فیە و و مفعولە ( إیاك) لە جێگەی مفعول بە سروشتی کەوا لە دوای فعل و فاعل دێت و ئەگەر پێش فعل و فاعل کەوت لە زانستی بەلاغە واتای الحصر دەگەیەنێت واتا لەو ئایەتە پیرۆزە واتای تەنها تۆ دەپەرستین دەگەنێت.

٦- نوێژ ئامرازێکه بۆ پارێزگاریکردن له شکۆمەندی نەفس - عزة النفس - و نەجولان وەکو داوەمووی بەر با و دلواکردنی خواردن جگە لە خودای گەورە و ئامرازێکە بۆ بەردەوام بوون لەسەر یەك بنەما و پرەنسیپ چونکە گرنگترین خەسڵەتە کەوا پارێزگاری لە کەسایەتی مرۆڤ دەکات و نوێژخوێن لە گشت رەکعەتێك لە کاتی دووبارەکردنەوەی دەستەواژەی ﴿إياك نستعين﴾واتا: تەنها داوای یارمەتی لەتۆ دەکەین، ئەو خەسڵەتە بەدەست دەهێنێت چونکە هەست بەوە دەکات کەوا بەجێهێنەری پێویستییەکان تەنها خودای گەورەیە نەك ئەو بەندەیەی بە مەبەستی بەدەستهێنانی پۆستێك یان کورسیەك یان چەند دینارێکی بێ نرخ خۆی بۆ ملکەچ و رەزیل دەکات.

٧- نوێژی بە کۆمەڵ بۆ ئەو کەسەی بتوانێت لە مزگەوت ئەنجامی بدات ئامازێکە بۆ ئاگاداربوون لە کێشەکانی هاوڕێیانی مزگەوت تاکو بەپێی توانا بەشدار بێت لە چارەسەرکردنی کێشەکانیان چونکە لە ئیسلامدا پێویستە دانیشتوانی هەر گوندێك یان هەر گەڕەکێك یەك خێزان بن و پێویستە لەسەر هەر تاکێکی ئەو خێزانە هاوکاری ئەوانی تر بکات و یەکگرتوو بن و هاوبەرپرسیاری یەکتر بن.

٨- نوێژی هەینی وانەیەکی هەفتانەیە کەوا وتار بێژی مزگەوت باس لە چارەسەری یەکێك لە کێشەکانی ئەو کاتی گەڕەکەکەی یان شارەکەی یان هەرێمەکەی یان جیهان دەکات، و پێویستە لە سەر وتار بێژ دوور بێت لە هەر شتێکی بڕوپووچ و خورافیات و هەر قسەیەك کەوا لە شەریعەتی ئیسلامی و عەقڵی تەواو جێگەی قەبولکردن نەبێت.

پێویستە لەسەر وتار بێژ لە رێگەی ئامرازەکانی سەردەم لەو هەفتەیەدا رۆژانە ئاگاداری هەواڵەکانی جیهان بێت و ئەگەر لەو هەفتەیە گوێ بیستی کێشەیەك بوو هەوڵ بدات لە رێگەی ئامۆژگاری و رێنمایی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە بەشدار بێت لە چارەسەرکردنی کێشەکە.

پێویسته لەسەر وتاربێژ لەگەڵ عەقڵییەتی کات و سەردەمی خۆی بژێیت چونکە ئەحکامەکانی خودای گەورە لەسەر بەرژەوەندییە رەواکان دامەزراون و بەپێی گۆڕانی ئەو بەرژوەندییان لە هەر کات و شوێنێك دەگۆڕێن، و هەشیار بێت لە گواستنەوەی ئەو فەرموودانەی کەوا لەلایەن پیلاگێڕەکان بە ناوی پێغەمبەرﷺ دروستکراون، و بەشێوەیەکی تەواو لە ژیان تێ بگات و رووداوەکان شی بکاتەوە و لە رێگەی شەریعەت و عەقڵی تەواو چارەسەری بۆ رووداوەکان بدۆزێتەوە.

٩- نوێژ تەنها لە کاروبارەکانی دونیایی گرنگ نییە بەڵکو ئەگەر بە شێوەیەکی راست و دروست ئەنجام بدرێت هەروەکو باسمانکرد نوێژخوێنەکە پاداشتێکی گەورەی دەست دەکەوێت.

## دووەم: فەلسەفەی رۆژوو:

رۆژوو وەکو نوێژ خواپەرستییەکی کۆنە و هەروەکو خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿..... كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾البقرة/١٨٣. واتا: رۆژوو لەسەر ئێوە پێویستکراوە چۆن لەسەر نەتەوەکانی پێش ئێوەش پێویستکرا بوو، و لە پەیامەکانی پێغەمبەرانی پێشوو هەبووە.

بریتیە لە دووربوون لە گشت ئەو شتانەی خودای گەورە بە شێوەیەکی گشتی لە مرۆڤی قەدەغەکردوون وەکو فێڵکردن لە مامەڵەکان و باسکردنی کەسێکی تر بە خراپە و جگە لەوانە هەر شتێکی تر کەوا شیاوی ئەوە نەبێت مرۆڤ ئەنجامی بدات، و هەروەها بریتیە لە دووربوون لە هەر شتێك کەوا لە مانگی رەمەزانی پیرۆز لە مرۆڤ قەدەغەکراوە وەکو خواردن و خواردنەوە و جگەرەکێشان و جووتبوون لە نێوان ژن و مێرد لەو ماوەیەی کەوا شەریعەت دیاری کردووە.

### حیکمەتی واجیب بوونی رۆژوو (یان فەلسەفەی رۆژوو):

ئەو حیکمەتە لە دەقی قورئانی پیرۆز هاتووە کە دەفەرموویت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾البقرة/١٨٣. واتا: ئەی باوەڕداران رۆژوو لەسەر ئێوە پێویستکراوە چۆن لەسەر نەتەوەکانی پێش ئێوەش پێویستکرا بوو بە ئومێدی ئەوەی دووربن لە تاوان و تەقوادار بن. واتا لە رێگەی رۆژووەکانتان خەسڵەتی تەقوا بەدەستدێنن، و تەقوا بریتیە لە وزەیەکی روحی کەوا مرۆڤ لەو رۆژووە راستەقینەیە دەستی دەکەوێت بەو جۆرەی کە خودای گەورە لە مرۆڤی بالیغ و عاقیلی دەوێت ئەنجامی بدات و دەیپارێت لە لادان و فێڵبازی و لارولەوێری و جگەلەوە لە هەر رەفتارێکی تاوانکاری دەیپارێزێت کەوا زیان بە تاك و کۆمەڵگە یان زیان بە هەردووکیان بگەیەنێت.

کەواتە هەروەکو هەندێك لە مسولمانان گومانیان وایە رۆژوو تەنها بریتی نییە لە قەدەغەبوون لە خواردن و خواردنەوە و جووت بوونی ژن و مێرد بەڵکو پێویستە رۆژوو بەو سێ پلەیەدا تێبپەرێت:

١- پلەی یەکەم: قەدەغەبوون لە خواردن و خواردنەوە و کرداری جووت بوون.

٢- پلەی دووەم: بە رۆژووبوونی ئەندامانی ژیان لە جەستەی مرۆڤ و بەکارنەهێنانیان لە هەر شتێکی پێچەوانەی فەرمانەکانی خودای گەورە.

بە رۆژوو بوونی دەست واتا قەدەغەکردنی لە دەستدرێژیکردنە سەر و زیادەرەوی کردنە سەر مافی کەسانی تر.

بە رۆژوو بوونی قاچ واتا قەدەغەکردنی لە رۆیشتنی بەبێ عوزری مەشروع بەرەو هەر شتێك کەوا زیانی بۆ مرۆڤ هەبێت.

بە رۆژوو بوونی زمان واتا قەدەغەبوونی لە هەر قسەیەك کەوا زیان بە مرۆڤ بگەیەنێت و دڵیان ئازار بدات و دەستدرێژی بێت بۆ سەر ئابروویان.

بە رۆژوو بوونی چاوەکان واتا نووقاندنی لە تەك سەیرکردنە عەورەتی خەڵکی.

به رۆژوو بوونی گوێیەکان واتا گوێنەگرتن لە قسەی بڕپووچ و زیان بەخش بۆ کەسانی تر چونکە گوێگرتن لەو قسانە بەشداریکردنە لە تاوانێك کەوا قسەکەر لەبەردەم ئەو ئەنجامی دەدات.

ڕێسایەکی شەرعی گشتی هەیە دەڵێت: (بێدەنگ بوون لە کاتی پێویست رازی بوونە) واتا رازی بوونی بەوەی روودەدات چونکە دەیبینێت یان دەیبیستێت و بێدەنگ دەبێت لە ئاستی، و ڕێسایەکی شەرعی گشتی هەیە دەڵێت: (ئەو کەسەی لە ئاست حەق و رەوا بێدەنگە شەیتانێکی لاڵە).

٣- پلەی سێیەم: بە رۆژووبوونی ئارەزووە شاراوەکان کەوا سەرچاوەی گشت رەفتارێکی خراپن ئەگەر لە جۆری ئەو ئارەزووانە بن کەوا بە سروشتی شەڕانگێزن و لە پێش هەموویان ئەو نەفسەی فەرمان بە خاپە دەکات و بە رۆژووبوونی ئەو ئارەزووانە گوزارشت لە زاڵبوونی تەواو بەسەر ئەو ئارەزووانە دەکات، و ئەگەر ئەو هەرسێ پلانە هاتنەدی گیانی وزەی روحی مەبەست لە رۆژوو دەهێنەتەدی و لە گشت کارێکی خراپ و پێچەوانەی فەرمانەکانی خودای گەورە و هەر زیادەڕەوییەك بۆ سەر مافی کەسانی تر دەپارێزرێت.

## باسی دووەم:
## فەلسەفەی ئەو خواپەرستییانەی تەنها دارایین (زەکات)

## فلسفة العبادات المالية المحضة (الزكاة)

### زەکات

ڕێژەیەکی سەدییە کەوا خودای گەورە لەسەر سامانداران پێویستی کردووە لە چەند سامانێکی دیاریکراو بە چەند مەرجێکی تایبەتی بە مەبەستی دابینکردنی پێویستییەکانی کەسانی پێویست، و دانانی ئاستێك بۆ جیاوازی چینایەتی، و ئیسلام دان بە هەژاری و پێویستی و دەرۆزەکردن و تەمبەڵی دانانێت بەڵکو داوای کارکردن و هەوڵدان بۆ بە دەستهێنانی ڕۆزی لە هەر کەسێك دەکات کەوا توانای کارکردنی هەیە بە مەبەستی دابینکردنی ژیانی و ژیانی ئەو کەسانەی بژێوی و خەرجیان لەسەر ئەو پێویستە.

کەواتە ئیسلام ئاینی کارکردنە بە بەڵگەی دووبارەبوونەوەی وشەی (العمل) وشەکانی وەرگیراو لەو وشەیە (٣٥٦) جار لە قورئانی پیرۆز.

سەرەڕای ئەوە لەو کاتەی خەڵکی لەسەر هەسارەی زەوی ژیاون خەڵکی هەژار و دەوڵەمەند هەر هەبووە.

شەریعەتی ئیسلامی هات و زەکاتی بە یەکێك لە کۆڵەگەکانی ئیسلام دانا وەکو نوێژ و ڕۆژوو بە مەبەستی نەهێشتنی هەژاری بە پێی توانا، سەرەڕای ئەوە ئەو کەسەی پێویستە زەکات لە سامانی بدات ئازادە لەوەی بە خۆی زەکات بەسەر کەسانی پێویست دابەش بکات بەڵام دەسەڵاتی سەردەم بۆی هەیە زۆری لێ بکات

لەسەر زەکات دان ئەگەر زەکات نەدات بە بەڵگەی ئەوەی جێنشینی یەکەم ئەبو بکری صدیق (رضي الله عنه) دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) جیهادی راگەیاند لە دژی ئەو کەسانەی زەکات نادەن و بە شێوەیەکی کرداری جەنگی لەگەڵ کردن تاکو ملکەچ بوون بۆ زەکات دان بەو جۆرەی داواکراوە.

هەروەها پێویستە لەسەر دەسەڵاتی سەردەم ناوەندێکی گشتی لە ئاستی وەزارەتەکان دابمەزرێنێت بۆ کۆکردنەوەی زەکات و دابەشکردنی بەسەر کەسانی پێویست بە رێژییەکی گونجاو بۆ ئەوەی سەرمایەکە لە دەستی هەژار بێت تاکو کاری وەبەرهێنان ئەنجام بدات بە مەبەستی رزگاربوونی لە هەژاری بۆئەوەی گشت ساڵێك پێویستی بە زەکات نەبێت.

لە هەر وڵاتێکی ئیسلامی دەوڵەت بەرپرسە لە ئەنجامدانی ئەو ئەرکە گرنگە چونکە گرنگی ناوەندی زەکات لە گرنگی ناوەندی ئەوقاف کەمتر نییە.

زەکات باج نییە تاکو لە جیاتی باج بدرێت و لەو چەند رووەی خوارەوە جیاوازە لەگەڵ باج:

١- باج تەنها لە حالەتی بێتوانایی بودجەی گشتی دەوڵەت و کەمی داهاتەکانی دەوڵەت رێگە پێدراوە بە پێچەوانەی زەکات.

٢- زەکات لە چەند سامانێکی دیاریکراو و بە چەند مەرجێکی دیاریکراو پێویستە بە پێچەوانەی باج.

٣- رێژەی باج بەرزدەبێتەوە لە کاتێکا رێژەی زەکات جێگیرە و بەپێی بڕ و چەندی سامان ناگۆڕێت.

٤- باج دەخرێتە سەر بودجەی گشتی دەوڵەت بەڵام زەکات بەسەر کەسانی پێویست دابەش دەکرێت.

## ئەو چینە کەسانەی شیاوی زەکات پێدانن:

بەپێی دەقی قورئانی پیرۆز هەشت چینە کەس شیاوی زەکات پێدانن ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾التوبة/٦٠. واتا: زەکات بۆ هەژاران و نەداران و کارمەندانی سەر زەکات و ئەو کەسانەیە کە ئیستا مسولمان بوونە بە مەبەستی راکێشانی دڵیان بۆلای ئیسلام و بەندەکان و قەرزدارەکان و ئەو کەسانەیە کەوا لە پێناوی خودا کاردەکەن بۆ سەرخستن و بڵاوکردنەوەی ئاینی خودا و کەسانی رێبوار و ئەو زەکاتە لەلایەن خودا پێویستکراوە و خودای گەورە زانا و دانایە.

١- **هەژار (الفقیر):** بریتیە لەو کەسەی کەوا هیچ داهاتێکی نییە ژیانی پێ دابین بکات.

٢- **نەدار (المسكین):** بریتیە لەو کەسەی کەوا ئەو داهاتەی هەیەتی بەشی دابینکردنی ژیانی و ژیانی ئەو کەسانە ناکات کەوا خەرجییان لە سەر ئەو پێویستە.

٣- کرێکار (العامل): بریتیە لەو فەرمانبەرەی هەڵدەستێك بە کاری وەرگرتن و کۆکردنەوەی زەکات و دابەشکردنی بە سەر کەسانی پێویست و لە بەرامبەر کارەکەی رێژەیەك لە زەکاتی پێ دەدرێت.

٤- **ئەو کەسانەی پێویستە دڵیان بدرێتەوە (المؤلفة قلوبهم[1]):** بریتین لەو کەسیانەی بە هۆی دادپەروەری ئیسلام زیان بە بەرژەوەندییە ئابوورییەکانییان کەوتووە و هەندێك لە سەرچاوەکانی بەدەستهێنانی سامانییان هەڵوەشاونەتەوە وەکو قازانجەکانی سوو (ریبا) و بازرگانیکردن بە بەندە و هەر کارێکی لەو جۆرە،

[1] - بریتین لەو کەسانەی ئیسلامی دڵیانی دایەوە و و هەندێکیان لە مسولمانان نەبوون و هەندێکی تر تازە هاتبوونە ناو ئیسلام.

بەڵام لە سەردەمی خەلیفەکانی راشیدین زەکاتدان بەو کەسانە راگیرا چونکە پێویستییان پێی نەبوو چونکە ئیسلام پێویستی بە دڵدانەوەی ئەوان نەبوو.

٥- **کۆیلەکان (الرقاب):** ئیسلام چەندین رێگای داناوە بۆ کۆتایی هێنان بە سیستەمی کۆیلایەتی قێزەون لەوانە تەرخانکردنی پارەی زەکات بۆ ئەو کۆیلەیەی بەڵێنی ئازادکردن بە پارەی پێدراو (واتا بەندە یان کەنیزە بە پارە خۆی لە خاوەنەکەی دەکڕێتەوە) و ئەو پارەیەش لە داهاتی زەکات خەرج دەکرێت.

٦- **قەرزدارەکان (الغارمین):** بریتین لەو کەسانەی کەوا بە مەبەستی ئەنجامدانی پرۆژەیەکی گشتی بۆ بەرژەوەندی گشتی وەکو دروستکردنی پردەکان قەرزیان وەرگرتووە و ئەو قەرزانەش لە ئەستۆیاندا ماونەتەوە چونکە نەیانتوانیوە بیان دانەوە بۆیە ئەو قەرزانە لە رێگەی زەکات دەدرێنەوە.

٧- **رێبوار (ابن السبیل):** بریتیە لەو کەسەی لە شارەکەی دابڕاوە یان دوورە لە ماڵەکەی و ئەو چینە ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کەوا بە مەبەستی چارەسەری پزیشکی سەفەر دەکەن بۆ دەرەوەی وڵاتەکەیان و توانای داراییان لاوازە.

٨- **لە پێناوی خودا (فی سبیل الله):** واتا لە پێناو بەرژەوەندی گشتی وەکو کڕینی زەوی بە مەبەستی دروستکردنی دەزگایەکی گشتی بۆ خزمەتی بەرژەوەندی گشتی وەکو دروستکردنی نەخۆشخانە یان قوتابخانە یان هەر شتێکی لەو جۆرە.

## ئەو سامانانەی زەکات لێدانیان پێویستە:

١- داهاتە کشتوکاڵییەکان: ئەگەر بە ئاوی بارانەکان یان رووبارەکان یان کانییەکان ئاو بدرێت ١٠٪ی زەکاتە و ئەگەر بە ئامرازەکانی تر ئاو بدرێت ٥٪ی زەکاتە.

٢- پارەکانی کانزایی و پەراوی کەوا لە جیهان ئاڵوێریان پێ دەکرێت کەوا جێگەی زێڕ و زیوییان گرتۆتەوە و ٢.٥٪ی زەکاتە.

٣- خشڵی زیاتر لە داب و نەریت و قاپ و قاچاغ و پارچە ڕێز و زیو و هەر ئامرازێکی جوانکاری دروستکراو لە زێڕ و زیو، و سەرمایەی بازرگانی و بەشەکانی کۆمپانیاکان و ٢.٥٪ی زەکاتە.

٤- سەرمایەی کارگە و کۆمپانیاکان و قازانجەکانیان لە کۆتایی هەر ساڵێك و ٢.٥٪ی زەکاتە.

٥- ئەو ئۆتۆمبێل و ئامرازانەی بۆ مەبەستی قازانج و بازرگانی و وەبەرهێنان بەکار دەهێنرێن لەسەر بنچینەی بڕی ئەو قازانجە لە ماوەی ساڵێك و ٢.٥٪ی زەکاتە.

٦- بە کرێدانی خانووبەرە و شوێنەکانی نیشتەجێبوون و هوتێلەکان و جگە لەوانە لە داهاتیان ٢.٥٪ی زەکاتە.

٧- ئاژەڵەکان (بزن و مەڕ و جێڵ و وشتر) و ڕێژی ئەوانە لە کتێبە فیقهییەکان بە درێژی دیاریکراوە.

## فەلسەفەی واجب بوونی زەکات:

زەکات لە چەندین ڕووێکەوە گرنگییەکی ئابووری زۆری هەیە لە ژیانی کرداری لەوانە:

١- نەهێشتنی تاوان: بەپێی یاسا سزاییەکان دەرکەوتووە کەوا گرنگترین هۆکارەکانی ئەنجامدانی تاوان - بە تایبەتی تاوانە ئابوورییەکان - بریتین لە هەژاری و پێویستی، و دابینکردنی پێویستی کەسانی پێویست لە رووی ماددی دەبێتە مایەی نەمانی دیاردەی لادان بەرەوە رەفتاری تاوانکاری، شایەنی باسە خەلیفەکانی راشیدین (ﷺ) لە ساڵی برسییێتی پیادەکردنی سزای دزی (دەست برینیان) راگرت و گوتیان: (دەست برین بۆ پاراستنی سامانە، و وازهێنان لە دەست برین بۆ پاراستنی گیانە و پاراستنی گیان لە پاراستنی سامان لە پێشترە).

٢- هێنانـەدی هاوسـەنگی و خۆشەویسـتی لـە نێـوان هـەژار و دەوڵەمەنـدەکان و ئاشکرایە ئیرەیی کەوا یەکێکە لە خووەکانی مرۆڤایەتی ئەگەر بە پاککردنـەوەی دەروون و رەوشت پاك نەکرێتەوە و بە تایبـەتی ئیرەیـی هـەژاران بەرامبـەر بـە دەوڵەمەندەکان دەبێتە هۆی تاوان چونکە کاتێك هـەژار دراوسـێی دەوڵەمەنـدی دەبینێت کەوا لەو پەڕی خۆشگوزەرانی دەژیێت و ئەویش لـە ژیـانێکی تەنگانـە دایە لەو کاتە ئیرەیی پاڵی پێوە دەنێت تاکو دەستدرێژی بکاتە سەر کەسایەتی یان سامانی دەوڵەمەند.

زەکات گرنگترین ئامرازە بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە چونکە ئەگەر هەژار لە هەر ساڵێك رێژەیەکی دیاریکراو لە سامانی دەوڵەمەندی دەستکەوت هاوسـەنگی و خۆشەویستی لە نێوانیـان جێگـەی ئیرەیـی و رق و قینـە دەگرێتـەوە چـونکە خۆی بە هاوبەشی سامانی دەوڵەمەند دادەنێت و لـە جیـاتی ئـەوەی داوا بکـات ئەو بەهرەیەی لە دەست بچێت داوا دەکات داهاتی زۆر بێت تاکو بەشی ئـەویش زۆر بێت.

٣- پاککردنـەوەی دەروونـی سـامانداران لـە زێـدەڕەوی هـەروەکو لـە دەقـی فەرموودەی خودای گەورە هاتووە: ﴿خذ من اموالـه صـدقة تطهـرهم و تـزكيهم بها﴾ التوبة/١٠٣. واتا: زەکات لە سامانیان وەربگرە و بەو زەکاتـە دەروونیـان و سامانیان پاك بکەوە.

زیادەڕەوی و ستەم یەکێکە لە خەسڵەتە ناشـیرینەکانی دیـاردەی دەوڵەمەنـدی هـەروەکو خـودای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿كَلَّـا إِنَّ الْإِنسَـانَ لَيَطْغَـى، أَن رَّآهُ اسْتَغْنَى﴾العلق/٦و٧. واتا: مرۆڤ کاتێك دەبنێت دەوڵەمەندە ستەم و زیادەڕەوی دەکات.

٤- زەکات بەهرەی زەکاتدەر زیاتر دەکـات چـونکە بریتیـە لـە سوپاسـی بـەهرە و سوپاسـی زیـاتر دەبێتـە هـۆی زیـادبوونی بـەهرە هـەروەکو خـودای گـەورە فەرموویەتی: ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ﴾إبراهيم/٧.

واتا: ئەگەر سوپاس بکەن بەهەرکانتان بۆ زیاد دەکەم و ئەگەر سوپاس نەکەن بەڕاستی سزایی من زۆر توندە.

٥- زەکات بیمەیەکی کۆمەڵایەتییە و ئیسلام بە یەکەم یاسا دادەنرێت لە جیهان کەوا سیستەمی زەکاتی داهێنا لەو کاتەی یاساکانی مرۆڤایەتی ئەو سیستەمەیان نەدەناسی تەنها لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم نەبێت[1].

٦- پاککردنەوەی دەروون لە نەخۆشی ڕەزیلی و ڕاهێنانی مسولمانی زەکاتدەر لەسەر بەخشین و سەخاوەت و هاوکاری کردن لە رووی هاوبەرپرسیارییەتی ئابووری.

٧- پاراستنی سامانی ئەو کەسەی زەکات لە سامانەکەی دەدات چونکە زەکات سامانی دەوڵەمەندی زەکاتدەر لە چاوی خەڵکی و دەستدرێژی تاوانباران دەپارێزێت هەروەکو پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((حَصِّنُوا أمْوَالَكُمْ بِالزَّكَاةِ وَدَاوُوا مَرْضَاكُمْ بِالصَّدَقَةِ وَأَعِدُّوا لِلْبَلَاءِ الدُّعَاءَ)) واتا: سامانتان بە زەکات بپارێزن و نەخۆشەکانتان بە بەخشین چارەسەر بکەن و پاڕانەوە بۆ بەڵا ئامادە بکەن[2].

---

[1] - د.يوسف القرضاوي، مشكلة الفقر و كيف عالجها الاسلام ل١٠٧.

[2] . الطبراني في معجمه الكبير ١٢٨/١٠ ژمارەی حەدیس ١٠١٩٦.

# باسی سێیەم:
# فەلسەفەی خواپەرستییەکانی تێکەڵاو
# (حەج)

## فلسفة العبادات المختلطة ( الحج )

حەج لە رووی زمانەوانی بریتیە لە مەبەست و لە زاراوەی شەرعی بریتیە لە سەردانیکردنی شوێنێکی تایبەت (ماڵی خودا) لە کاتێکی تایبەت (مانگی حەج) ئەنجامدانی چەند کارێکی تایبەت (تەواف و رۆیشتن لە نێوان سەفا و مەروا و وەستان لە کێوی عەرەفە بە جلی ئیحرام ......).

بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ئیسلام فەرمانی بە سێ جۆرە کۆبوونەوە کردووە: کۆبوونەوەی رۆژانە و هەفتانە و ساڵانە.

١- کۆبونەوەی رۆژانە: پێویستە لەسەر دانیشتوانی هەر گوندێك یان هەر گەڕەکێك ئەوەی دەتوانێت ئامادەبی بەجێگەیاندنی نوێژی بە کۆمەڵ لە مزگەوت بێت هەرچەندە رۆژانە یەك جاریش بێت ئەگەر هیچ عوزرێکی نەبێت بە مەبەستی ئاگاداربوون لە کێشەی کەسانی تری دانیشتوانی گەڕەکەکە یان گوندەکە و بەپێی توانا بەشداری بکات لە چارەسەرکردنی ئەو کێشانە بە مەبەستی جێبەجێکردنی فەرمانی خودا ﴿..... وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى .....﴾المائدة/٢. واتا: لە چاکە و خواناسی و پارێزگاری هاوکاری یەکتر بکەن.

نوێژی بە کۆمەڵ سونەتێکە و جەختی لەسەرکراوەتەوە و فەلسەفەی نوێژی بە کۆمەڵ بریتیە لە هاوکاری و یەکگرتن و هاوبەرپرسیارییەتی لە نێوان نوێژخوێنان

کەواتە ئەگەر ئەو فەلسەفەیە نەبێت هیچ جیاوازی لە نێوان نوێژی ماڵەوە و نوێژی مزگەوت نییە.

٢- کۆبوونەوەی هەفتانە: پێویستە لەسەر دانیشتوانی شار لە ڕۆژی هەینی لە مزگەوتێکی گەورە کۆببنەوە کەوا جێگەی ژمارەیەکی زۆر خەڵکی ببێتەوە لەبەر هەمان فەلسەفەی ناوبراو.

٣- کۆبوونەوەی ساڵانە بۆ گشت نوێنەرانی دەوڵەتان و گەلانی مسولمان و ئەو کۆبوونەوەیە بریتیە لە گەورەترین کۆنگرەی ئیسلامی کەوا دەوڵەت و گەلانی مسولمان لە گشت جیهان بەشداری تیادا دەکەن بە مەبەستی گفتوگۆکردن دەربارەی کێشە سیاسی و کارگێری و ئابووری و تەندروستی و بەرگرییەکان و جگە لەوە هەر پێداویستییەکی ژیان لە هەر کات و شوێنێك.

ئاشکرایە سروشتی ئەو کۆنگرەیە لەگەڵ سروشتی گشت کۆنگرەکانی تر جیاوازە کەوا ساڵانە دەیان جار لە وڵاتانی جیهان لەسەر هەردوو ئاستی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی دەبەسترێن و ئەو کۆنگرانە تەنها سروشتێکی ماددیان هەیە بەڵام کۆنگرەی حەج لە یەك کاتدا خاوەنی سروشتێکی ماددی و مەعنەوییە و گشت ئەو دیاردە ماددییانەی یارمەتیدەرن بۆ پەرتەوازەبوون و لێکترازانی گەلانی ئیسلامی لەناو ئەو وزە روحیە دەتوێنەوە کەوا زیارەتکارانی حەج بە دەستی دەهێنن.

أ- حەجکردن بە ئیحرام دەست پێ دەکات کەوا بە هەنگاوی یەکەم دادەنرێت بە مەبەستی رووتبوون لە هەر جیاوازییەکی لاوەکی چونکە جلێکی یەك جۆرە لە شێوەی ئەو جلەیە کەوا مرۆڤ لە کاتی کۆچکردنی بەرەو ماڵی کۆتایی و دوای بەجێهێشتنی ژیانی دونیا لەبەری دەکات و بەو جلە هیچ جیاوازی لە نێوان سەرکردە و هاوڵاتیانی ئاسایی، و هەژار و دەوڵەمەند، خاوەن پێگە سیاسییەکان و کۆمەڵایەتییەکان و کەسانی تر نامێنێت.

ب- دواتر (تەلبیە/ لبیك اللهم) کەوا لە جیهانی ماددی دای دەبڕێنێت و لە لایەنی روحی بەو زاتەی دەبەستێتەوەی کەوا هیچ دەسەڵاتێك لە سەرووی دەسەڵاتی ئەو نییە کە بریتیە لە خودای گەورە.

ج- دواتر تەواف کە بریتیە سووڕانەوەی دڵ بە دەوری بنکەی یەکبوونی مسولمانان (ماڵی پیرۆزی خودا).

د- دواتر هاتووچۆکردن لە نێوان سەفا و مەروا و دووڵی لە نێوان ترسان و تکاکردن ترسان لە سزادان لەسەر تاوانەکان و تکاکردنی لێخۆشبوون لە تاوانەکان.

هـ- دواتر وەستان لە کێوی عەرەفە و یەکێکە لە دیاردەکانی یەکسانی و نەبوونی گەورایەتی لە نێوان نەوەکانی ئادەم و حەوا تەنها بە کردەوەی چاك و تەقوا و سوودی مرۆڤایەتی نەبێت هەروەکو خودای گەورە فەرموویەتی ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾الحجرات/١٣. واتا: بە تەقواترین کەستان بەرێز ترین کەستانە لەلای خودا واتا، نزکترینتان لە خودای گەورە و سوودبەخشترین کەستانە بۆ خەڵکی.

و- دواتر بەرد بارانکردنی شەیتان بریتیە لە بەڵێندان لەبەردەم خودا کەوا لە داهاتووە جارێکی تر ملکەچی ئەو نەفسە نەبێت کەوا فەرمان بە خراپە دەکات چونکە شەیتان لەوێ نییە تاکو حەجاجەکان بەرد بارانی بکەن بەڵکو بەردەکان ئاراستەی شەیتانی هەر مرۆڤێك دەکرێن کەوا بۆ ساتێك لێی جیانابێتەوە و پەیوەستە بە مرۆڤ و ئەوەی حەجاجەکان بەرد بارانی دەکەن ئەو نەفسەیە کەوا فەرمان بە خراپە دەکات (النفس الامارة بالسؤ) کەوا بریتیە لە فیکرەیەکی شەڕانگێز و بەردەوام پاڵی پێوە دەنێت بۆ رەفتاری تاوانکاری.

کەواتە ئەگەر بەرد بارانکردن بە دڵێکی ساف و تێگەیشتنێکی راست و دروست بێت بریتیە لە خاڵی جیابوونەوەی ئەو کەسە لە گشت شتێکی خراپ.

بەو گیانە پاکە و لەو کەشە مەعنەوییە و لەبەردەم ماڵی پیرۆزی خودا کەوا هێمای یەکبوونی مسولمانانە مسولمانان بەڵێن دەدەنە یەکتری کەوا یەك بگرن و هاوکاری

یەکتر بکەن لە چارەسەرکردنی کێشەی هەر وڵاتێك یەکسانە سەرچاوەی کێشەکە ناکۆکی ناوخۆیی بێت یان دەستدرێژی دەرەکی.

**بەرهەمەکان - الاستنتاج:**

لە ناوەڕۆکی ئەو بەشە بۆمان دەردەکەوێت کەوا فەلسەفەی ئەو خواپەرستییانەی خودای گەورە لەسەر مرۆڤی پێویستکردوون بریتیە لە چەند ئامرازێکی خۆپارێزی بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ و دەستەبەرکردنی مافەکانی و بۆ مەبەستی سەرکەوتنی بیری چاکە بەسەر بیری خراپە لە مرۆڤدا و پاراستنی ئەو بەرژەوەندییانەی لە پەیامی پێغەمبەرﷺ هاتوون هەروەکو خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾الأنبياء/١٠٧. واتا: ئێمە تۆمان تەنها بە رەحمەت ناردووە بۆ خەڵکی جیهان، رەحمەت بریتیە لە بەرژەوەندی ماددی و مەعنەوی و دونیایی و دواڕۆژی مرۆڤایەتی.

ئاشکرایە کەوا خودای گەورە پێویستی بە خواپەرستی بەندەکانی نییە بۆیە ئەگەر گشت بەندەکان ژیانیان لە خواپەرستی بەسەر بەرن بە ئەندازەی دەنکە گەردیلەیەك لە گەورایەتی خودا زیاد ناکات و هەروەها ئەگەر گشت تەمەنی خۆیان لە تاوان و لاڕێی بەسەر بەرن بە قەد دەنکە گەردیلەیەك لە گەورایەتی خودا کەم ناکاتەوە.

بەوپێیە ئامانجی سەرەکی لە راسپاردنی مرۆڤ بەو خواپەرستانەی باسمانکردن بریتیە لە زاڵکردنی فیکرەی چاکە بەسەر فیکرەی خراپە لە مرۆڤدا تاکو چێژ لە ژیانی وەربگرێت و پشتگری لەو پەیامە بکات کەوا خودای گەورە لە پێناویدا دروستی کردووە.

شایەنی باسە فەیلەسوفەکان لە مێژە بیروڕای جیاوازییان هەیە دەربارەی مرۆڤ کە ئایا لە سروشتدا باشە یان خراپ؟

هەندێکان[1] دەڵێن: لە سروشتدا باشە و لادانی مرۆڤ شتێکی سروشتی نییە بەڵکو بە هۆی پاڵنەرەکانی دەرەکی ژینگەیی و کۆمەلآیەتی و ئابووری و هتد .. روودەدات.

هەندێکی تر لەگەڵ بۆچوونی دووەمدان و دەڵێن: مرۆڤ لە سروشتدا خراپە و بە شێوەیەکی سروشتی رێگەی چاکە ناگرێت بەڵکو بە هۆی پاڵنەرەکانی فێرکردن و رێنموونیکردن و هۆشیاری ئەو رێگایە دەگرێتەبەر.

بەلآم قورئان لە نێوان ئەو دوو بۆچوونە دایە و بۆمان روون دەکاتەوە کەوا مرۆڤ لە سروشتدا نە چاکە و نەخراپە بەڵکو لە یەك کاتدا هەردوو فیکرەکەی هەیە هەروەکو خودای گەورە فەرموویەتی ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا، فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا، قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا، وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا﴾الشمس/٧و٨و٩و١٠. واتا: سوێند بە دەروون و بەو زاتەی کەوا دەروونی دروستکردووە و توانای چاکە و خراپەی هەیە، بە راستی ئەو کەسەی دەروونی خۆی پاککردەوە سەرکەوت، و ئەو کەسەی دەروونی خۆی پیس کرد بەدبەخت بوو.

(الفجور) خراپە بریتیە لە فیرەیەکی شەرانگێزی و (التقوی) پارێزگاری بریتیە لە فیکرەیەکی چاکەکاری، و بە مەبەستی سەرکەوتنی فیکرەی چاکە بەسەر فیکرەی خراپە خودای گەورە چەند رێگایەکی خۆپارێزی لەسەر مرۆڤ پێویستکردووە بۆ ئەوەی خۆی لە فیکرەی خراپەکاری بپارێزێت و فیکرەی چاکەکاری بە سەر ئەو فیکرەیە سەربیخێت و ئەو ئامراز و رێگایانەش بریتین لەو خواپەرستییانەی لەسەر مرۆڤ پێویستکراون لەبەر یەك حیکمەت ئەویش بەرژەوەندی مرۆڤە.

[1] – بۆ زیاتر درێژە بروانە کتێبەکەی ئێمە/ منهاج الاسلام لمكافحة الاجرام.

# وانەی شەشەم

# مامەڵە داراییەکان

## المعاملات المالية

ئەو بەشە بە کورتی پێناسەی سامان و جۆرەکانی سامان و پێناسەی گرێبەست و جۆرەکانی گرێبەست و شوێنەوارەکانی گرێبەست لەخۆدەگرێت و باسکردنی ئەو سێ خاڵە بەسەر چوار باس دابەش دەکەین باسی یەکەم بۆ سامان و جۆرەکانی تەرخان دەکەین و دووەمیان بۆ گرێبەست و رەگەزەکانی و جۆرەکانی و سێیەمیان بۆ شوێنەوارەکانی گرێبەست و چوارەمیان بۆ شایستەیی پابەند بوون و بەرەبەستەکانی شایستەیی تەرخان دەکەین.

# باسی یەکەم:
# سامان و جۆرەکانی
# المال و أنواعە

زانایانی شەریعەت بەو جۆرە پێناسەی سامان دەکەن، بریتیە لەو شتانەی کەوا سروشتی مرۆڤ مەیلیان بۆلای دەکات و بکرێت هەڵبگیرێت بۆ کاتی پێویست سامانی گوێزەرەوە بێت یان نەگوێزەرەوە[1].

تێبینی لە سەر ئەو پێناسەیە هەندێك سامان سروشتی مرۆڤ مەیلیان بۆلای ناکات وەکو هەندێك دەرمان، و هەندێکیان بە خێرایی لەناو دەچن و ناگونجێن بۆ هەلگرتن وەکو هەندێك خواردەمەنی، بۆیە پێشنیار دەکەم کەوا پێناسەی سامان بەو جۆرە بێت: (هەر شتێك نرخێکی ماددی هەبێت و بە دەست بێت).

## جۆرەکانی سامان:

سامان لە چەندین رووێکەوە دەکرێتە چەندین جۆر بەوجۆرەی خوارەوە:

**أ- لە رووی گونجانی بۆ گواستنەوە بریتیە لە سامانی گوێزەرەوە و نەگوێزەوە:**

**١- گوێزەرەوە (المنقول):** بریتیە لەو شتەی دەکرێت لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر بگوازرێتەوە بەبێ ئەوەی کاریگەری لەسەر خودی شتەکە یان شێوەی شتەکە هەبێت وەکو کاڵا و کەل و پەل و ئاژەل و ئۆتۆمبێل و هەر شتێکی لەو جۆرە.

---

[1] – گۆڤاری الاحکام العدلیة ماددەی ١٢٦ و ئەو پێناسەیە لە فیقهی حەنەفی وەرگیراوە.

٢- نەگوێزەرەوە یان خانوبەرە (غیر منقول او العقار)؛ بریتیە لەو شتەی ناکرێت بە ڕێگەی سروشتی لە جێگایەك بۆ جێگایەکی تر بگوازرێتەوە[1] بەبێ ئەوەی شێوەی تێك بچێت وەکو زەوی و زار و باڵەخانە و درەختەکان پێش بڕینەوەیان و ئەو شتانەی لە سەر زەوی دانراون پێش دەرهێنانیان لە زەوی و هەر شتێکی لەو جۆرە.

**بەرهەمی دابەشکردن:**

١- هاوتەنیشتی (الشفعة) تەنها لە سامانی نەگوێزەرەوە هەیە چونکە فەلسەفەی شوفعە لە سامانی گوێزەرەوە ناهێتەدی و بریتیە لە چاوەڕوانکردنی زیان گەیاندن بە هاوبەشی نوێ.

٢- بە زۆری وەقف لە نەگوێزەرەوە[2] دەکرێت چونکە بەردەوامە و جێگیرە.

٣- مافەکانی پیادا تێپەڕین[3] تەنها لە نەگوێزەرەوە هەن.

٤- پێسپێر دەستکاری سامانی نەگوێزەرەوەی ناکام ناکات تەنها لەبەر هۆکارێکی شەرعی پێویست نەبێت بە پێچەوانەی گوێزەرەوە.

٥- دروستە دەستکاری نەگوێزەرەوە بکرێت پێش وەرگرتن بە پێچەوانەی گوێزەرەوە چونکە یەکەم جێگیرە و لە کاتی وەرگرتنی نابێتە سەرچاوەی زیان بۆ کڕیار.

---

[1] - ئەو مەرجە بۆ ئەوە دانراو چونکە هەندێك خانوبەرە دەکرێت بگوزرێنەوە وەکو ئەو باڵەخانەیەی دەکرێت لە جێگایەك بۆ جێگایەکی تر بگوازرێتەوە بە ڕێگەی ئامێر و ئامرازەکانی سەردەم بەبێ ئەوەی کاریگەری لەسەر خودی یان شێوەی باڵەخانەکە هەبێت وەکو گواستنەوەی ئەو باڵەخانەیەی شیاوی گواستنەوەیە لە هەندێك دەوڵەتی پێشکەوتوو لە ڕووی پیشەسازی وەکو یابان.

[2] - ئەو مەرجە بۆ ئەوە دانراو چونکە کتێبەکان وەقف دەکرێن هەرچەندە گوێزەرەوەن.

[3] - وەکو مافی پیادا تێپەڕین و ئاوەڕۆ و مافی جگە و مافی بەرزبوونەوە و چوونە خوارەوە لە شوقە و باڵەخانەکانی نیشتەجێبوون و مافی ئاو خواردنەوە.

٦- له هەندێك له یاساكان[1] نەگوێزەرەوە بە هیچ شێوەیەك نافرۆشرێت تاكو لە فەرمانگەی تایبەتمەند تۆمار نەكرێت و ئەو شێوەیەی تیادا نەبێت كەوا لە دەقی یاسادا هاتووە بەپێچەوانەی فرۆشتنی گوێزەرەوە و هیچ شێوەیەكی تیادا نییە ئەگەر سامانێكی گرانبەها نەبێت وەكو كەشتی و فڕۆكە و ئۆتۆمبێلەكان.

**ب- لە ڕووی هاوشێوەیی تاكەكان و بەشەكان بریتیە لەو سامانەی هاوشێوەی هەیە و ئەو سامانەی هاوشێوەی نییە:**

**١- ئەو سامانەی هاوشێوەی هەیە - سامانی هاوشێوەیی - (المثلي):** بریتیە لەو سامانەی تاكەكانی هیچ جیاوازییەكی ئەو تۆیان نییە و هەندێكیان جێگای هەندێكیان دەگرنەوە و هاوشێوەیان لە بازاڕەكان هەیە وەكو ژمێردراوەكان و كێشراوەكان و پێوراوەكان و قیاسكراوەكان[2].

پێم وایە ئەو پێناسە پارە و دراوەكانی ئاڵوگۆرپێكراو لە مامەڵەكان ناگرێتەوە چونكە هاوشێوەی ئەوانە بریتیە لەوەی كەوا شێوە و واتا (لە نرخ یان لە هێزی كڕین) لەگەڵیان یەكسان بێت.

دراو لە ژمێردراوەكانە و سەرەڕای ئەوە لە هەندێك سەردەم بە هۆی چەند بارودۆخێكی جیاواز خەسڵەتی هاوشێوەیی لە دەست دەدات و نرخی لە ڕووی بەرزبوونەوە و دابەزین جیاوازی تیا دەكەوێت بۆ نموونە دیناری عیراقی لە كۆتایی سەدەی بیستەم هاوشێوەی دیناری عیراقی سەرەتای سەدەی بیست و یەك نییە.

بۆ نموونە ئەگەر كەسێك ئافرەتێكی پێش پەنجا ساڵ مارە كرد بێت لە سەر مارەیی پاشكی (١٠٠) دیناری عیراقی ساڵی ١٩٥٠ دواتر لە ساڵی ٢٠٠٢ لە یەكتری جابوونەوە پێویستە مارەیەكە بە زێڕی كاتی مارەبڕین هەڵبسەنگێدرێت چونكە دینار

---

[1] - وەكو یاسای شارستانی عیراقی ژمارە ٤٠ی ساڵی ١٩٥١ و ماددەی ٥٠٨ و یاسای تۆماركردنی خانوبەرەی عیراقی ئێستا ماددەی ٣.

[2] - گۆڤاری الاحكام العدلیة ماددەی ١٤٥.

هاوشێوەیی لەدەستداوە و لە کاتی جیابوونەوە بووەتە شتێکی نرخدار چونکە هێزی کڕین و فرۆشتنی زیاتر لە سەد ئەوەندە دابەزیوە.

گشت قەرزەکانی پاشەکی لە ئەستۆی قەرزدار قیاس دەکرێنە سەر مارەیی.

٢- **ئەو شتانەی هاوشێوەیان نییە - سامانی نرخدار (القیمی)**: بریتیە لەو شتانەی کەوا لەگەڵ یەکتری جیاوازن بەجۆرێك کە هاوشێوەیان لە بازاڕەکان نییە یان نرخەکەی لە ڕووی بەرزبوونەوە و دابەزین گۆڕاوە وەکو دراو.

بۆ نموونە ئەو سامانەی هاوشێوەی نییە وەکو زەوی و زار و باڵەخانە و ئاژەڵ و هەر شتێکی لەو جۆرە.

**بەرهەمی دابەشکردن:**

١- سامانی هاوشێوەیی وەکو قەرز لە ئەستۆی قەرزدار دەمێنێتەوە ئەگەر خەسڵەتەکانی دیار بێت بەپێچەوانەی سامانی نرخدار.

٢- سامانی هاوشێوەیی ئەگەر کەسێك لەناوی برد پێویستە لەسەری هاوشێوەی بداتەوە نەك نرخەکەی بە پێچەوانەی سامانی نرخدار پێویستە نرخەکەی بداتەوە.

٣- ئەگەر سامانی هاوشێوەیی لەناوچوو بابەتی پابەندبوون هەڵناوەشێتەوە بەڵکو هاوشێوەی جێگەی دەگرێتەوە بەپێچەوانەی سامانی نرخدار ئەگەر پێش وەرگرتن لە ناوچوو گرێبەستەکە بە شێوەیی سروشتی (واتا بە بڕیاری یاسا) هەڵدەوشێتەوە و بەوجۆرە پابەندبوونیش هەڵدەوەشێتەوە.

٤- خاوەندارێتی سامانی هاوشێوەیی بە گرێبەست ناگوازرێتەوە ئەگەر جۆر یان چینی دیاریکراو بێت بەڵکو تەنها بە جیاکردنەوە واتا وەرگرتن دەگوازرێتەوە بەڵام لە سامانی نرخدار خاوەندارێتی تەنها بە گرێبەست دەگوازرێتەوە بەڵام بابەتی گرێبەستەکە پێش وەرگرتن لە ئەستۆی فرۆشیار دەمێنێتەوە.

**ج- له رووی شیاوی بۆ مامەڵە پێکردن بریتیە لە سامانی بایەخدار و بێ بایەخ:**

١- بایەخدار (المتقوم): بریتیە لە هەر شتێك کەوا بە راستی و لە نەریتی شەرعی لە هەردوو حالەتی بێنیازی و سەرپشکی (ئیختیاری) بۆ سوود لێوەرگرتن بگونجێت.

٢- بێ بایەخ (غیر المتقوم): بریتیە لەو سامانەی کەوا موڵکی کەس نییە وەکو ماسی ناو ئاو و باڵندە لە ئاسمان و مامز لە دارستان یان موڵکی کەسێکە بەڵام لە رووی شەرعی سوودی لێوەرناگیرێت تەنها لە حالەتەکانی پێویست نەبێت وەکو جۆرەکانی ماددە هۆشبەرەکان، و سرەکەرەکان و ئاژەڵە مرداربووەکان.

**بەرهەمی دابەشکردن:**

١- سامانی بایەخدار دەکرێت مامەڵەی پێ بکرێت بەپێچەوانەی سامانی بێ بایەخ.

٢- هەر کەسێك بەبێ پاساو سامانی بایەخدار لەناو ببات بەرتوڵە دەبێت بە پێچەوانەی سامانی بێ بایەخ[1].

**د- لە رووی سنوری سوود لێوەرگرتن بریتیە لە سامانی گشتی و تایبەتی:**

١- سامانی گشتی: بریتیە لەو سامانەی بۆ بەرژەوەندی گشتی تەرخانکراوە وەکو دەزگا حکومییەکان.

٢- سامانی تایبەتی: بریتیە لەو سامانەی کەوا تەنها خاوەنەکەی بۆی هەیە سوودی لێوەربگرێت یان بە مۆڵەتی خاوەنەکەی سوودی لێوەربگیرێت.

**بەرهەمی دابەشکردن:**

١- سامانی گشتی بۆ گشت کەسێك حەلاڵە لە سنووری رێگەپێدانی سوودی لێوەربگرێت بەبێ ئەوەی پێویست بە مۆڵەتی دەوڵەت کە خاوەنی سامانەکەیە بکات

[1] - تەنها سەبارەت بە کەسانی نامسولمان لەو شتانەی کەوا سوود لێوەرگرتنیان رەوا بێت.

به پێچەوانەی سامانی تایبەتی تەنها خاوەنەکەی بۆی هەیە سوودی لێوەربگرێت یان بە مۆڵەتی خاوەنەکەی سوودی لێوەردەگیرێت.

٢- سامانی گشتی نابێت لە بەرامبەر شتێك و بەبێ بەرامبەر وەکو دیاری سوودی لێوەربگیرێت تەنها لە حالەتەکانی پێویست نەبێت بەپێچەوانەی سامانی تایبەتی کەوا خاوەنەکەی بۆی هەیە بەرامبەر و بەبێ بەرامبەر سوودی لێوەربگرێت.

**خاوەنداریتی (الملكية):**

بریتیە لە تایبەتمەندییەك کەوا رێگەی دەستکاریکردن و بەکارهێنان و وەبەرهێنان و هەڵگرتن بە خاوەنەکەی دەدات، واتا بریتیە لە پەیوەندی شەرعی لە نێوان مرۆڤ و سامان و تایبەتە بە ئەو و کەسی تر بۆی نییە دەستکاری بکات، و بۆی هەیە سوودی لێوەربگرێت و دەستکاری بکات بە رێگەی فرۆشتن یان دیاری یان جگە لەوە، و بۆی هەیە بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاری بهێنێت، و بۆی هەیە بە کاری بهێنێت بۆ وەبەرهێنان یان بە کرێدان یان هەر دەستکاری کردنێکی تر بە مەبەستی قازانجکردن لێی، و هەروەها بۆی هەیە هەڵی بگرێت و دەسەڵاتێکی راستەقینەی بەسەردا هەیە.

**جۆرەکانی خاوەندارێتی:**

خاوەندارێتی لە چەند رووێکەوە بەسەر چەندین جۆر دابەش دەکرێت بەو جۆرەی خوارەوە:

**أ- لە رووی دەسەڵات بەسەردا هەبوون بریتیە لە خاوەندارێتی تەواو و ناتەواو:**

١- خاوەندارێتی تەواو: بریتیە لە دەسەڵاتی تەواو بەسەر ئەستۆی و سوودی سامانەکە بە یەکەوە وەکو ئەو کەسەی لە خانویەك دابنیشێت کەوا مولکی خۆی بێت.

٢- خاوەندارێتی ناتەواو: بریتیە لە خاوەندارێتی بەسەر سامانەکە بە تەنها یان خاوەندارێتی سوودی سامانەکە بە تەنها، بۆ نموونە ئەو خانوەی کە بۆ ماوەیەکی

دیاریکراو به کرێ گیراوه (خاوەنی خانوەکە) تەنها خاوەنی خودی سامانەکەیە، و بە کرێگر لە ماوەی بە کرێگرتن تەنها خاوەنی سوودی سامانەکەیە.

هەروەها ئەو کەسەی سوودی زەوی و زارەکەی دوای مردنی بۆ یەکێك لە خزمانی وەسیەت کردووە لەو حالەتە وەسیەت بۆ کراو بە تەنها دەبێتە خاوەنی سوودی سامانەکە تاکو دەمرێت و دوای مردنی سوودەکە دەگەڕێتەوە بۆ میراتگران.

**بەرهەمی دابەشکردن:**

١- لە خاوەندارێتی تەواو خاوەنەکە ئەو چوار دەسەڵاتەی هەیە (دەستکاریکردن و بەکارهێنان و وەبەرهێنان و هەڵگرتن).

بەڵام لە خاوەندارێتی ناتەواو خاوەن مافی سوود وەرگرتن لە موڵکەکەی نییە بە ڕێگەی بەکارهێنان یان وەبەرهێنان یان هەڵگرتن.

٢- فرۆشتنی خودی موڵکەکە لەلایەن خاوەنەکەی بە بۆچوونی زۆربەی زانایان بەستراوەتەوە بە مۆڵەتی بەکرێگر (خاوەنی سوودەکە) کەواتە ئەگەر مۆڵەتی نەدا فرۆشتنەکە پووچەڵە بەڵام لە یاسادا گرێبەستەکە دروستە بەبێ مۆڵەتی بەکرێگر.

**ب- لە رووی گشتگیری، بریتیە لە خاوەندارێتی گشتی و دابەشکراو:**

١- خاوەندارێتی گشتی: بریتیە لەوەی کەوا دوو کەس یان زیاتر خاوەنی سامانێك بن کەوا بەشی هەریەکەیان دیار نەبێت بەڵکو هاوبەش بن لە گشت سامانەکە وەکو خاوەندارێتی میراتگران پێش دابەشکردنی میراتەکە بەسەریاندا.

٢- خاوەندارێتی دابەشکراو بریتیە لەوەی کەوا هەر یەکەیان بەشی خۆی دیار بێت دوای دابەشکردن و وەکو خاوەندارێتی هەر میراتگرێك بەسەر بەشەکەی خۆی.

**بەرهەمی دابەشکردن:**

١- هەر هاوبەشێکی بێگانە لە بەشی هاوبەشەکەی بۆی نییە بە هیچ جۆرێك دەستکاری بەشەکە بکات تەنها بە ڕەزامەندی هاوبەشەکەی نەبێت.

٢- هاوبەش بۆی نییە دەستکاری بەشێکی دیاریکراو لە سامانی گشتی بکات تەنها بە ڕەزامەندی تەواوی هاوبەشەکان نەبێت.

٣- گشت هاوبەشەکان سامانی گشتی بەڕێوە دەبەن ئەگەر بەپێچەوانەی ئەوە ڕێك نەوکەت بن و لێرەدا چەند بەشی تر هەن کەوا بواری باسکردنیان نییە[1].

**قەرز و عەین – الدين و العين**

١- قەرز (الدين): لە فیقهی ئیسلامی بریتیە لە هەر شتێك کەوا لە ئەستۆی مرۆڤ دابێت لە سامانی بە بڕیار[2] یان کار بەرامبەر مافی کەسی لە فیقهی رۆژئاوا.

٢- عەین: بریتیە لە هەر مافێکی پەیوەست بە سامانێکی دیاریکراو واتا دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی کەسێکی دیاریکراو لەسەر شتێکی دیاریکراو.

خوا لێخۆشبوو (السنهوری)[3] پێی وایە عەین لە فیقهی رۆژئاوا لە مافی عەینی لە فیقهی ئیسلامی فراوانترە و قەرز لە مافی کەسی تەسك ترە چونکە گومانی وایە ئەگەر قەرز پەیوەست بێت بە میرات خەسڵەتی قەرز لە دەست دەدات و دەبێتە عەین، و هەروەها لە حالەتی دەسەلات بەندی (حیجر) و بێپارەبوون – هەرەسهێنان – (الافلاس) ئەو خەسڵەتە لەدەست دەدات چونکە قەرز پەیوەستە بە سامانی ئەو کەسەی دەسەڵاتی بەندکراوە و بە کەسی – بێپارەبوو – موفلیس و بۆیە دەبێتە عەین.

پێم وایە ئەو بۆچوونە پێچەوانەی ڕاستەقینەی فیقهی ئیسلامییە چونکە قەرز هەر وەکو قەرز دەمێنێتەوە هەرچەندە پەیوەست بێت بە سامانی قەرزدار و قەرز و مافی کەسی یەکسانن وەکو یەکسانی عەین و مافی عەینی.

---

[1] – لەوانە دابەشکردن بۆ خاوەنداریتی ماددی وەکو خاوەنداریتی ئۆتۆمبێل یان خانوو و خاوەنداریتی مەعنەوی وەکو خاوەنداریتی دانەری فیکرەیەکی زانستی و داهێنان.

[2] – واتا: بە بڕیار کەوتۆتە ئەستۆی.

[3] – لە کتێبەکەی (مصادر الحق) ١/٢٤ و لاپەڕەکانی دواتر.

**بەرهەمی دابەشکردن:**

١- بۆ وەرگرتنەوەی قـەرز پێویست بە نێوانکاری قـەرزدار دەکات لـە کاتێکـا پابەندبوون بە عەین پەیوەستە بە خودی شتەکە.

٢- قەرز ماوەی تەواو دەبێت بەپێچەوانەی عەین.

٣- قەرز بە بەریەکتر دەکەوێت بە پێچەوانەی عەین.

٤- لێخۆشبوون و پاکانەی ئەستۆ لە قەرز دروستە بە پێچەوانەی عەین.

## باسی دووەم:
# گرێبەست و ڕەگەزەکانی و جۆرەکانی

## العقد و عناصره و أنواعه

گرێبەست بەو جۆرەی لە ماددەی (٢٦٢) لە (مرشد الحيران[1]) و لە مـاددەی (٧٣) لە یاسای شارستانی عیراقی ئێستا پێناسـەکراوە بریتیـە لـە (بەستنەوەی داواکـردن لەلایەن یەکێك لەلایەنەکانی گرێبەست بە قـەبولکردن لەلایەنەکـەی تـر بـە شـێوەیەك کەوا شوێنەوارەکەی لەو شتە دەردەکەوێت کەوا گرێبەستی لەسەر دەکرێت). پێمـان وایـە ئـەو پێناسـەیە کـەم و کـوڕە و پێویسـتە (العاقـد)ی بـۆ زیـاد بکرێـت چـونکە شوێنەوارەکانی گرێبەست بریتین لە چەند ماف و ئەرکێك و مافەکان پەیوەسـتن بـەو شتەی گرێبەستی لەسەر کراوە لە هەردوو شتەکان، بۆ نموونە لە گرێبەسـتی کـڕین و فرۆشتن مافی خاوەندارێتی شتی فرۆشراو بۆ کڕیار دەگوازرێتەوە و مـافی پارەکـەش بۆ فرۆشیار دەگوازرێتەوە.

ئەرکەکانیش پەیوەستن بە گرێبەستی فرۆشتن و بریتیە لە پابەنـدبوونی فرۆشـیار بـە تەسـلیم کردنـی شـتی فرۆشـراو و پابەنـدبوونی کڕیـار بـە دانـی پارەکـە کەواتـە پێناسەی ڕاست و دروستی گرێبەست بـەو جۆرەیـە (بەسـتنەوەی داواکـردن لەلایـەن یەکێك لەلایەنـەکانی گرێبەسـت بـە قـەبولکردن لەلایەنەکـەی تـر بـە شـێوەیەك کـەوا شوێنەوارەکەی لەلایەنەکانی گرێبەستەکە و لەو شتە دەردەکـەوێت کـەوا گرێبەسـتی لەسـەر دەکرێـت) و باسـکردنی ڕەگـەزەکان و جۆرەکـان بەسـەر دوو بـەش دابـەش دەکەین.

---

[1] – لقدری پاشا – مرشـد الحيران الى معرفـة أحـوال الانسـان – و ئـەو دانـراوە گوزارشـت لـە بـە باسکردنی ئەحکامەکانی فیقهی ئیسلامی لە مەزهەبی حەنەفی دەکات.

# بەشی یەکەم:
# رەگەزەکانی گرێبەست
# عناصر العقد

رەگەزەكانی هەر شتێك بریتین لەو شتانەی شتەكەی پێیەوە بەندە و ئەگەر رەگەز بەشێك بێت لە شتەكە پێی دەگوترێت كۆڵەگە و ئەگەرنا پێی دەگوترێت مەرج.

## كۆڵەگەكانی گرێبەست:

بە كورتی كۆڵەكانی گرێبەست سێ كۆڵەگەن و بریتین لە: (دەستەواژە، و لایەنەكانی گرێبەست و بابەتی گرێبەستەكە — الصیغة و العاقد و المعقود علیە) و بە درێژی شەشن چونكە دەستەواژەی گرێبەست داواكردن و قەبولكردن دەگرێتەوە، و عاقد بریتیە لە لایەنەكانی گرێبەست و بابەتی گرێبەست بریتیە لە شتی فرۆشراو و پارەی گرێبەستەكە.

## مەرجەكانی گرێبەست:

مەرجەكانی گرێبەست حەوتن و بریتین لە:

١- هاوتابوونی داواكردن و قەبولكردن لە كاروبارە سەرەكییەكان.

٢- لە راستیدا دانیشتنی داواكردن و قەبولكردن یەك بێت وەكو گرێبەست لە نێوان ئامادەبووان یان بە شێوەی بڕیار یەك بێت وەكو گرێبەست لە رێگەی ئامرازەكانی پەیوەندی سەردەم.

٣- بە شێوەیەكی راستەقینە یان بە بڕیار لایەنەكان چەند كەسێك بن بۆ نموونە ئەگەر بریكار سامانی بریكار دەری بۆ خۆی بكڕێت لەو حالەتە لە راستدا لایەنەكان

یەك کەسە بەڵام بە بڕیار دوو کەسن[1].

٤- لە گرێبەستەکانی بە بەرامبەر[2] دەبێت لایەنی گرێبەست مومەیەز بێت و لە گرێبەستەکانی بەخشین بالیغ بێت[3] واتا مەرجە کەوا ئەو کەسەی دەبەخشێت گەیشت بێتە تەمەنی بیرکردنەوە (سن الرشد).

٥- دەبێت بابەتی گرێبەستەکە بە بینین یان بە ئیشارەت یان بە خەسڵەتەکان دیاریکراو بێت یان شیاوی دیاریکردن بێت وەکو فرۆشتنی سامانی هاوشێوەیی نادیار چونکە ئەو سامانە بە بەشەکانی دیاری دەکرێت.

٦- دەبێت بابەتی گرێبەست شیاوی مامەڵەپێکردن بێت (بایەخدار بێت) کەواتە فرۆشتنی ماددە هۆشبەرەکان دروست نییە چونکە ڕەوا نییە، و فرۆشتنی ماسی لە ناو ڕووبار و باڵندە لە ئاسمان دروست نییە چونکە لە دەست کەس نین.

٧- دەبێت بابەتەکە شیاوی دابەشکردن بێت ئەگەر کڕیار بیەوێت شتێك بە دەست بهێنێت سەربەخۆ و جیاواز بێت لەگەڵ هاوبەشەکەی کەواتە فرۆشتنی سامانێك کەوا شیاوی دابەشکردن نەبێت دروست نییە یان شیاوی دابەشکردن بێت بەڵام زیان بە یەکێك لەلایەنەکانی گرێبەست یان بە هەردووکیان بگات وەکو فرۆشتنی نیوەی ژووری هاوبەش لە خانوویەکی هاوبەش.

کەواتە ئەگەر یەکێك لە کۆڵەگەکانی گرێبەست یان یەکێك لە مەرجەکانی گرێبەست نەهاتەدی گرێبەستەکە پووچەڵە.

---

[1] – سەبارەت بە خۆی لایەنی بنەڕەتییە و لە جیاتی فرۆشیار لایەنەکەی ترە.

[2] – گرێبەستی بە بەرامبەر (عقد المعاوضة) دەبەسترێت لەو حالەتەی یەکێك لە لایەنەکانی گرێبەست مومەیەز بێت و بالیغ نەبێت و دوای مۆڵەتدانی وەلی شوێنەوارەکانی لێ دەکەوێتەوە کەواتە ئەگەر مۆڵەتی پێدا شوێنەوارەکانی دەگەڕێتەوە بۆ کاتی بەستنی گرێبەست و ئەگەر مۆڵەتی نەدا بە نەبوو دادەنرێت.

[3] – بەخشینەکان (التبرعات) بریتیە لە گرێبەستی بێ بەرامبەر و بە تەواوی زیانە و بەوجۆرە ئەو گرێبەستەی کەسی نابالیغ پووچەڵە.

## مەرجەکانی دروست بوونی گرێبەست:

١- مەرجی تەمییز[١] یان ژیری پێوستی بە خەسڵەتی تەواو هەیە کە بریتیە لە نەبوونی زۆرلێکردن چونکە گرێبەستی زۆرلێکراو پووچەڵە.

٢- دیاریکراوی بابەتی گرێبەست یان شایستەی دیاریکردن بێت پێویستی بە خەسڵەتی تەواوکەر هەیە کە بریتیە لە نەبوونی نادیاری کەواتە ئەگەر لە دیاریکردنی نادیاری هەبێت پووچەڵە بۆ نموونە ئەگەر فرۆشیار بڵێت ئەو شتەت پێدەفرۆشم بە نەخت بە ئەوەندە و بە قیست بە ئەوەندە، و بەوپێیە پێویستە یەکەم جار لە سەر بڕی یەکێکیان رێککەون بۆ ئەوەی دوودڵ نەبێت لە نێوان نەخت و قیست.

٣- نابێت گرێبەستەکە سوو (ربا)ی تیادا بێت وەکو گرێبەستی قەرز بە سوود وەکو ئەو بازرگانەی بڕێك پارە بە یەکێك دەدات لە بەرامبەر سوودێك لەو حالەتە گرێبەستی قەرز پووچەڵە.

بەڵام ئەو کەسەی بڕێك پارە بۆ خانوو یان بۆ چارەسەری نەخۆشی یان هەر شتێکی تری پێویست لە بانکێك وەردەگرێت گرێبەستەکە سەبارەت بە ئەو تەواوە لەبەر فەرموودەی خودای گەورە ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾البقرة/١٧٣. واتا: هەر کەسێك پێویست بێت بەبێ ئەوەی زیاتر لە پێویست بەکاری بهێنێت تاوانبار نییە.

٤- نابێت گرێبەستەکە مەرجێکی پووچەڵی لەگەڵدا بێت بۆ نموونە ئەو کەسەی خانووەکەی دەفرۆشێت و بە مەرج دادەنێت لەسەر کڕیار کەوا تاکو ماوەی ساڵێك بەبێ کرێ تیایدا بمێنێتەوە و کڕیار ناچارە ئەو مەرجە قەبول بکات لەبەر چەند هۆکارێکی پەیوەست بە خۆی وەکو نزیکی خانووەکە لە بارەگای کارەکەی.

٥- بابەتی گرێبەستەکە شیاوی تەسلیمکردن بێت ئەو مەرجە پێویستی بە خەسڵەتی تەواوکەر هەیە و بریتیە لە نەبوونی زیان لە کاتی تەسلیم کردن، کەواتە هەر گرێبەستێك تەسلیم کردنی بابەتەکەی زیانی هەبێت پووچەڵە بۆ نموونە

---

[١] - جیاکردنەوەی باش و خراپ - گەیشتنە تەمەنی تەمییز.

راسپاردنی کڕیار بە گواستنەوەی بڕێکی گران لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر.

## گرنگی جیاوازیکردن لە نێوان (باطل و فاسد):

١- گرێبەستی (پووچەڵ - باطل) بە لابردنی هۆکاری پووچەڵ بوون نابێتە گرێبەستێکی تەواو بەڵکو پێویستە دووبارە بەبێ هۆکاری پووچەڵی ببەسترێت بە پێچەوانەی گرێبەستی فاسید چونکە ئەگەر هۆکاری فاسید بوونی لابردرێت بە شێوەیەکی سروشتی دەبێتە گرێبەستێکی تەواو وەکو دەستهەڵگرتنی خاوەن قەرز لە سوودی قەرزەکە لە گرێبەستی قەرز و وەکو مۆڵەتدانی زۆرلێکراو دوای نەمانی شوێنەوارەکانی زۆرلێکردن بە بەستنی ئەو گرێبەستەی لە ژێر فشاری زۆرلێکردن بەستوویەتی.

٢- مارەبڕینی فاسید بە پێچەوانەی گرێبەستی پووچەڵ ئەگەر گوازرابێتەوە ئەو شوێنەوارە شەرعییانەی خوارەوەی لێ دەکەوێتەوە چونکە گومان هەیە:

أ- ئەگەر لە ئەنجامی جووتبوون منداڵێك دروست بووبێت رەچەڵەکی شەرعییە و چەند مافێکی هەیە و چەند ئەرکێکی شەرعی لە سەرە.

ب- ئەگەر ژن و مێردەکە لە یەکتری جیابوونەوە پێویستە لەسەر ئافرەتەکە عیدەی تەواو بێت و پێویستە لەسەر پیاوەکە مارەیی هاوشێوەی (مهر المثل)ی پێ بدات وەکو قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانە ئەدەبیەی لە ئەنجامی جووت بوون بە ئافرەتەکە کەوتووە.

ج- سزای زینا لەسەر هەر یەك لە پیاو و ئافرەتەکە پێویست نییە.

د- بە هۆی ئەو جووت بوونە خزمایەتی ژنوژنخوازی دروست دەبێت کەواتە بنەچە و نەوەکانی هەردووکیان لە یەکتری حەرام دەبن[1].

---

[1] - بۆ زیاتر درێژی جیاوازی نێوان (باطل و فاسد): بگەڕێوە بۆ ئەو سەرچاوەی حەنەفی: بدائع الصنائع للكاساني ٧/٣٠٨٠ و لاپەرەکانی دواتر و تبين الحقائق شرح كنز الدقائق للزيلعي ٤/٤٣ دواتر، فتح القدير لابن الهمام ٦/٤٠٠.

## بەشی دووەم:
## جۆرەکانی گرێبەست
## أنواع العقد

گرێبەست لە چەندین رووێکەوە بەسەر چەندین جۆر دابەش دەکرێت بەو جۆرەی خوارەوە:

**یەکەم: لە رووی چۆنیەتی شەرعی و یاسایی گرێبەست:**

دەکرێتە سێ بەشکردن دابەشکردنی سیانی و دابەشکردنی چوارینە و دابەشکردنی پێنجینە.

أ- دابەشکردنی سیانی واتا دابەشکردن بۆ سێ بەش: بریتیە لە گرێبەستی پووچەڵ بە شێوەیەکی گشتی و گرێبەستی پووچەڵی رێژەیی کە شیاوی پووچەڵکردنەوەیە و گرێبەستی تەواو:

١- **ئەو گرێبەستەی بە شێوەیەکی گشتی پووچەڵە:** بریتیە لەو گرێبەستەی یەکێك لە کۆڵەگەکانی یان یەکێك لە مەرجەکانی تیادا نییە و بوون و نەبوونی یەکسانە و وەکو گرێبەستی تەواو هیچ شوێنەوارێکی شەرعی و یاسایی بنەڕەتی لێ ناکەوێتەوە.

٢- **ئەو گرێبەستەی شیاوی پووچەڵکردنەوەیە (پووچەڵی رێژەیی):** بریتیە لەو گرێبەستەی کۆڵەگە و مەرجەکانی تیادایە بەڵام رەزامەندی یان ویستی لانەیەکان عەیبدارە وەکو زۆرلێکردن و فریودان و بە هەڵەدابردن بۆیە ئەگەر ئەو کەسەی شیاوی پووچەڵکردنەوە بۆ بەرژەوەندی ئەو بڕیاردراوە مۆڵەتی دا

گرێبەستەکە تەواوە و شیاوی پووڵەکردنەوە نییە، و هەروەها ئەگەر یەکێك لە لایەنەکان شایستەیی ناتەواو بێت گرێبەستەکە شیاوی پووچەڵکردنەوەیە.

٣- **گرێبەستی راست و دروست و تەواو:** بریتیە لەو گرێبەستەی کەوا کۆڵەگە و مەرجەکانی تیادا هاتۆتەدی.

ئەو دابەشکردنە سیانییە بریتیە لە دابەشکردنی یاسا و فیقهی رۆژئاوا و کاریگەری لەسەر هەندێك لە یاساکانی شارستانی عەرەبی هەبووە وەکو یاسای شارستانی میسری و شارستانی سوری ئێستا.

بە بۆچوونی ئێمە ئەو دابەشکردنە لەو چەند رووەی خوارەوە هەڵەیە و پێچەوانەی مەنتیقی یاساییە:

أ- دانانی ئەو گرێبەستەی شیاوی پووچەڵکردنەوەیە بە گرێبەستی ناتەواو چونکە بە بەشێك لەگەڵ گرێبەستی تەواوی داناوە و بەشی هەر شتێك پێچەوانەی بەشەکەی ترە و سەرەڕای ئەوە یاوەرێکی ئەو دابەشکردنە دەڵێت: ئەو گرێبەستەی شیاوی پووچەڵکردنەوەیە گشت شوێنەوارەکانی لێدەکەوێتەوە و ئەوەش هەڵەیە و پێچەوانەی ناتەواوی گرێبەستەکە و شوێنەرە یاساییەکانی ئەو گرێبەستەیە.

ب- دانانی گرێبەستی خۆتێهەڵقورتاندن[1] بەو گرێبەستەی شیاوی پووچەڵکردنەوەیە لەگەڵ ئەوەی هیچ شوێنەوارێکی لێ ناکەوێتەوە تەنها دوای مۆڵەتدانی روون ئاشکرا و راشکاوانە نەبێت.

ج- دانانی گرێبەستی کارپێکراوی نەسەپێندراو بە گرێبەستی ناتەواو چونکە پێی دەڵێن ئەو گرێبەستەی شیاوی پووچەڵکردنەوەیە.

---

[1] – بریتیە لەوەی کەوا کەسێك سامانی یەکێك بفرۆشێت یان سامانێکی بۆ بکرێت بەبێ جێگرایەتی و ئەگەر لایەن ئەو کەسەی گرێبەستەکە بۆ بەرژەوەندی ئەو کراوە مۆڵەتی پێدرا شوێنەوارەکانی لێدەکەوێتەوە و ئەگەرنا بە پووچەڵ دادەنرێت.

د- دانانی گرێبەستی راگیراو بە گرێبەستی ناتەواو چونکە بە یەکێك لە نموونەکانی ئەو گرێبەستە دادەنرێن کەوا شیاوی پووچەڵکردنەوەیە لەگەڵ ئەوەی گرێبەستێکی تەواوە بەڵام شوێنەوارەکانی ماف و ئەرکەکانی لێ ناکەوێتەوە تەنها دوای مۆڵەت پێدان نەبێت.

بەداخەوە دەبینین زۆربەی یاساکانی شارستانی عەرەبی کار بەو دابەشکردنە سیانییە دەکەن و فیقهی ئیسلامی دوور دەخەنەوە کەوا بە وردترین فیقهـ لە جیهان دادەنرێت سەبارەت بە دابەشکردنەکانی گرێبەست لە رووی چۆنیەتی شەرعی و یاسایی.

ب- دابەشکردنی چوارینە: بریتیە لە دابەشکردنی کۆمەڵی زانایانی شەریعەتی ئیسلامی و گرێبەستیان بەسەر گرێبەستی تەواو و پووچەڵ دابەش دەکەن و دواتر گرێبەستی تەواو بەسەر سێ جۆر دابەش دەکەن:

١- **گرێبەستی تەواوی راگیراو**: بریتیە لەو گرێبەستەی تەواوە بەڵام شوێنەواری لێ ناکەوێتەوە تەنها دوای مۆڵەت پێدانی ئەو کەسە نەبێت کەوا مافی مۆڵەتدانی هەیە وەکو فرۆشتنی ئەو کەسەی شایستەیی ناتەواوە چونکە ئەو گرێبەستە راگیراوە و دوای مۆڵەتدانی وەلییەکەی شوێنەوارەکانی لێ دەکەوێتەوە.

٢- **گرێبەستی کارپێکراوی نەسەپێندراو**: بریتیە لەو گرێبەستەی لە ژێر کاریگەری فێڵبازی ئەنجام دەدرێت و بریتیە لە بەکارهێنانی رێگاکانی فێلبازی لەلایەن یەکێك لە لایەنەکان یان لەلایەن کەسی سێیەم کەوا لەگەڵ ئەو لایەنە رێککەوت بێت بە مەبەستی بە هەڵەدابردنی لایەنەکەی تر و پاڵپێوەنانی بۆ بەستنی گرێبەست.

٣- **گرێبەستی تەواوی کارپێکراوی سەپێندراو**: بریتیە لەو گرێبەستەی کەوا مەرجەکانی کارپێکرانی و سەپێندراوی تیادایە.

ج- **دابەشکردنی پێنجینە – التقسیم الخماسي**: بریتیە لەوەی کەوا زانایانی حەنەفی بڕیاریان داوە و بریتیە لە هەرچوار بەشەکەی ناوبراوی جمهوری زانایان لەگەڵ زیادکردنی بەشی پێنجەم کە بریتیە لە گرێبەستی فاسید.

پێشتر بە درێژی باسی دروست بوونی گرێبەستی فاسید و گرنگی جیاوازیکردن لە نێوان فاسید و پووچەڵمان کرد، و گوتوویانە: گرێبەستی پووچەڵ: بریتیە لەو گرێبەستەی لە بنەڕەتدا و لە خەسڵەتدا ناڕەوایە، و گرێبەستی فاسید: لە بنەڕەتدا ڕەوایە و لە خەسڵەتدا ناڕەوایە.

شایەنی باسە یاسادانەری عیراقی لە یاسای باری کەسی[1] کار بە دابەشکردن بۆ پێنج بەش دەکات و لە تەواوی یاساکانی عیراقی کار بە دابەشکردن بۆ چوار بەش دەکات.

**دووەم: لە رووی ڕێکخستن بریتیە لە گرێبەستی ناوبراو و گرێبەستی ناونەبراو:**

١- گرێبەستی ناوبراو: بریتیە لەو گرێبەستەی کەوا شەرع یان یاسا ناوێکی دیاریکراوی بۆ داناوە و ڕەگەزەکانی و ئەحکامەکانی ڕێکخستووە وەکو گرێبەستی فرۆشتن و بە کرێگرتن و بەڵێندەرایەتی و جگە لەوانە.

٢- گرێبەستی ناونەبراو: بریتیە لەو گرێبەستەی کەوا شەرع یان یاسا ناوێکی دیاریکراوی بۆ دانەناوە و ڕێکی نەخستووە بەڵکو بۆ ڕێسا گشتییەکانی بەجێهێشتووە.

**سێیەم: لە رووی ڕەگەز بریتیە لە گرێبەستی ڕەزامەندی و شێوەیی و عەینی:**

١- گرێبەستی ڕەزامەندی: بریتیە لەو گرێبەستەی کەوا ڕەزامەندی هەردوو لایەنەکە بەسە بۆ بەستنی گرێبەستەکە و ڕوودانی شوێنەوارەکانی.

شایەنی باسە زۆربەی گرێبەستەکان لە یاساکانی شارستانی عەرەبی بریتین لە گرێبەستەکانی ڕەزامەندی.

---

[1] — ژمارە ١٨٨ی ساڵی ١٩٥٩ ماددەی شەشەم و ماددەی هەشتەم و بیستەم.

٢- گرێبەستی شێوەیی: بریتیە لەو گرێبەستەی کەوا رەزامەندی بەس نییە بەڵکو پێویستە بەو شێوەیە بێت کەوا لە یاسادا ئاماژەی پێکراوە وەکو فرۆشتنی خانوبەرە چونکە ئەگەر لە فەرمانگەی تایبەتمەند تۆمار نەکرا بێت نافرۆشرێت[١].

٣- گرێبەستی عەینی: بریتیە لەو گرێبەستەی شوێنەوارەکانی تەواو نابن تەنها دوای وەرگرتن نەبێت وەکو گرێبەستی دیاری گوازراوە و قەرزی بێ سوود و رەهنی ژێر دەستە و سپاردە و قەرز و لەو پێنج جۆرە شتە گرێبەست دەبەسترێت بەڵام شوێنەوارەکەی لێ ناکەوێتەوە تەنها دوای وەرگرتن نەبێت واتا ئەرکەکانی دروست دەبن بەڵام مافەکان نا بە پێچەوانەی راڤەکارانی یاسا کە دەڵێن: گرێبەست لە هەر یەکێك لەو جۆرانە تەنها بە وەرگرتن نەبێت نابەسترێت و رەخنە لە فیقهی ئیسلامی دەگرن و بەوە تۆمەتباری دەکەن کەوا لە گرێبەستە عەینییەکان رۆچووە لە کاتێکا ئیسلام گرێبەستی عەینی لە نێوان گرێبەستی رەزامەندی و گرێبەستی شێوەیی دادەنێت بەجۆرێك کەوا پێش وەگرتنی ئەرکی لێ دەکەوێتەوە بەڵام مافی لێ ناکەوێتەوە تەنها دوای وەرگرتن نەبێت.

**چوارەم: لە رووی رەگەزی کات بریتیە لە گرێبەستی دەماودەم و بەردەوام:**

١- گرێبەستی دەماودەم: بریتیە لەو گرێبەستەی کەوا کات رەگەزێکی سەرەکی نییە لە دیاریکردنی بابەتی گرێبەست.

٢- ئەو گرێبەستەی جێبەجێکردنی بەردەوامە (یان گرێبەستی ماوە): بریتیە لەو گرێبەستەی کەوا کات رەگەزێکی سەرەکییە لە دیاریکردنی بابەتی گرێبەست وەکو گرێبەستی بەکرێگرتن.

---

[١] - ماددەی ٥٠٨ لە یاسای شارستانی عیراقی و ماددەی ٣ لە یاسای تۆمارکردنی خانووبەرەی ئێستا.

**پێنجەم: لە رووی دیاریکردنی بابەتی پابەندبوون بریتیە لە گرێبەستی دیاریکراو و گرێبەستی ئەگەری – ئیحتمالی:**

١- **گرێبەستی دیاریکراو:** بریتیە لەو گرێبەستەی کەوا هەریەك لە لایەنەکانی گرێبەست پێشتر بڕی ئەو شتە دەزانێت کەوا بە لایەنەکەی تری دەدات و ئەوەی لێی وەردەگرێت وەکو گرێبەستی فرۆشتن.

٢- **گرێبەستی ئەگەری – ئیحتیمالی:** بریتیە لەو گرێبەستەی کەوا هەر یەك لەلایەنەکانی گرێبەست پێشتر بڕی ئەو شتە نازانێت کەوا بە لایەنەکەی تری دەدات و ئەوەی لێی وەردەگرێت وەکو گرێبەستی فرۆشتن کەوا پارەکەی بە درێژایی ژیان بەردەوامە و وەکو گرێبەستی بیمەی کۆمەڵایەتی – دڵنیاکردنی ژیان – لە بەرامبەر ئەوەی ئەو کەسە قیستی مانگانە بدات.

**شەشەم: لە رووی سروشتی بریتیە لە گرێبەستی شارستانی و بازرگانی و کارگێری:**

١- گرێبەستی شارستانی (العقد المدني): بریتیە لەو گرێبەستەی کەوا مەبەست لێی قازانجکردن نییە و ملکەچی یاسای شارستانی دەبێت.

٢- گرێبەستی بازرگانی (العقد التجاري): بریتیە لەو گرێبەستەی کەوا مەبەست لێی دەستکەوتنی قازانجە و ملکەچی یاسای بازرگانی دەبێت.

٣- گرێبەستی کارگێری (العقد الاداري): بریتیە لەو گرێبەستەی کەوا یەکێك لە لایەنەکان کەسایەتییەکی مەعنەوییە و ملکەچی یاسای کارگێری دەبێت.

**حەوتەم: لە رووی رێککەوتن و گفتوگۆ:**

١- گرێبەستی ملکەچ بوون (العقد الاذعان): بریتیە لەو گرێبەستەی کەوا یەکێك لەلایەنەکان ملکەچی ئەوەی تر دەبێت و ملکەچی ئەو مەرجانە دەبێت کەوا بەسەری دەسەپێنێت بەبێ ئەوەی مافی گفتوگۆ و رێککەوتن و سازشی هەبێت وەکو گرێبەستی کارەبا و گرێبەستی ئاو و گرێبەستی تەلەفۆن و هەر گرێبەستێکی لەو

جۆره.

٢- گرێبەستی رێککەوتن و سازشکردن (العقد المساومة): بریتیه لەو گرێبەستەی کەوا شیاوی رێککەوتن و گفتوگۆ لەسەرکردنه وەکو گرێبەستی به کرێگرتن.

**هەشتەم: له رووی سروشتی بابەتی گرێبەستەکه بریتیه له گرێبەستی دەستکەوت و گرێبەستی بەرچاو و گرێبەستی کار:**

١- گرێبەستی دەستکەوت به سوود (العقد المنفعة): بریتیه لەو گرێبەستەی کەوا بابەتەکەی بریتیه له دەستکەوت لەبەرامبەر شتێك وەکو گرێبەستی بە کرێگرتن و گرێبەستی بەبێ بەرامبەر وەکو گرێبەستی قەرزی بێ سوود.

٢- گرێبەستی شتێکی بەرچاو (العقد عيني): بریتیە لەوەی کەوا بابەتەکەی شتێکی دیاریکراوه وەکو فرۆشتنی ئۆتۆمبێل.

٣- گرێبەستی کار (العقد العمل): بریتیە لەو گرێبەستەی لەسەر کارێك دەبەسترێت وەکو گرێبەستی بەڵێندەرایەتی.

**نۆیەم: له رووی رەسەنایەتی بریتیه له گرێبەستی بنەرەتی و پاشکۆیی:**

١- گرێبەستی بنەڕەتی (**العقد الاصلي**): بریتیه له گرێبەستی سەربەخۆ و سەر به هیچ گرێبەسێکی ترەوه نییه وەکو ئەو گرێبەستانەی ناویان دیاریکراوه.

٢- گرێبەستی پاشکۆیی (**العقد التبعي**): بریتیه لەو گرێبەستەی کەوا لە رووی بوون و نەبوونی سەر به گرێبەستێکی ترە وەکو گرێبەستی دەستەبەری، چونکە ئەگەر پابەندبوونی کەسی رەسەن هەڵوەشایەوە و پابەندبوونی کەفیلیش هەڵدەوەشێتەوە.

**دەیەم: له رووی چۆنیەتی بریتیه له گرێبەستی ساده و لێکدراو:**

١- گرێبەستی ساده (العقد البسيط): بریتیه لەوەی کەوا تەنها له یەك گرێبەست پێکهاتووە وەکو گرێبەستی به کرێگرتن.

٢- گرێبەستی لێکدراو (العقد المرکب): بریتیە لەو گرێبەستەی کەوا لە زیاتر لە یەك گرێبەست پێك دێت وەکو گرێبەستی هۆتێل چونکە سەبارەت بە نیشتەجێبوون گرێبەستی بە کرێگرتنە و سەبارەت بە خواردن گرێبەستی فرۆشتنە و سەبارەت بە خزمەتکار گرێبەستی کارە و سەبارەت بە کەل و پەلەکان گرێبەستی سپاردنە[1].

**پانزەهەم: لە رووی وەرگرتنی شتێک لەجیاتی شتێک بریتیە لە:**

١- گرێبەستی بە بەرامبەر (العقد المعاوضة) بریتیە لەو گرێبەستەی کەوا هەریەك لە لایەنەکان لە بەرامبەر ئەوەی داویەتی شتێك وەردەگرێت وەکو گۆڕینەوە و گرێبەستی بە کرێگرتن.

٢- گرێبەستی بەخشین (العقد التبرع) بریتیە لەوەی کەوا یەکێك لەلایەنەکان هیچ شتێك لە بەرامبەر ئەوەی داویەتی وەرناگرێت وەکو گرێبەستی دیاری و قەرزی بێسوود (العاریة).

---

[1] - بۆ زیاتر درێژە بڕوانە (نظریة الالتزام برد غیر المستحق) ل١٢٢ و دواتر.

# باسی سێیەم:
# شوێنەوارەکانی گرێبەست
## آثار العقد

هەر گرێبەستێکی راست و دروست چەند شوێنەوارێکی شەرعی و یاسایی بنەڕەتی لێ دەکەوێتەوە و پێیان دەگوترێت ماف و ئەرکەکان، و ئەو شوێنەوارانە هەندێك جار شوێنەواری ئاڵوگۆڕین وەکو شوێنەوارەکانی گرێبەستی فرۆشتن چونکە فرۆشیار مافی وەرگرتنی پارەی هەیە و پێویستە لە سەری کاڵای فرۆشراو رادەستی کڕیار بکات و کڕیار مافی وەرگرتنی کاڵای فرۆشراوی هەیە و پێویستە لەسەری پارەی کاڵاکە بدات بە فرۆشیار کەواتە هەردووکیان خاوەن قەرز و قەرزداری یەکترن.

هەندێك جار شوێنەوارەکان بەسەر هەردوو لایەنەکە دابەشکراون بەجۆرێك کەوا یەکێکیان تەنها مافی هەیە و ئەوەی تریش تەنها ئەرکی لەسەرە وەکو گرێبەستی دیاری چونکە پێویستە لەسەر دیاری بەخش دیارییەکە پێشکەشی ئەوەی تر بکات کەواتە دیاری بەخش قەرزدارە و خاوەن قەرز نییە، و لایەنەکەی تر مافی ئەوەی هەیە داوا بکات دیاری تەسلیم بکرێت، کەواتە خاوەن قەرزە و قەرزدار نییە، و بابەتەکە بەسەر دوو بەش دابەش دەکەین یەکەمیان بۆ پێناسەی مافی دارایی تەرخان دەکەین و دووەمیان بۆ ئەرکی دارایی تەرخان دەکەین.

# بەشی یەکەم:
# پێناسەی مافی دارایی
# التعريف بالحق المالي

ماف (الحق): زانایان بە چەندین پێناسەی جیاجیا لە رووی دەربڕین یان لە رووی واتا پێناسەی مافیان کردووە و ئەو پێناسانە بێ کەم و کوڕی یان زیادە یان عەیب نیین بۆیە پێشنیار دەکەین ماف بەو جۆرە پێناسە بکرێت: (ناوەندێکی شەرعی یان یاساییە لەسەر شتێك کەوا خاوەنەکەی یان یەکێکی تر سوودی لێ وەردەگرێت).

ئەو پێناسەیە مافە داراییەکان و جگە لە مافە دارییەکان دەگرێتەوە وەکو مافەکانی رامیاری و خێزانی و ماددی و مەعنەوی.

## بەشەکانی ماف:

مافەکان لە چەندین رووێکەوە دەکرێنە چەند بەشێك بەڵام ئەوەی لەو باسە گرنگی پێدەین بریتین لە مافە داراییەکان کە بریتیە لە مافەکانی عەینی یان کەسی:

١- مافی عەینی (الحق العيني): بریتیە لە دەسەڵاتی راستەوخۆی کەسێکی دیاریکراو لەسەر شتێکی دیاریکراو بۆ نموونە وەکو مافی خاوەندارێتی و مافی سوود وەرگرتن.

٢- مافی کەسی (الحق الشخصي): یاسا و زانایانی یاسا بەوجۆرە پێناسەی دەکەن کەوا بریتیە لە پەیوەندییەکی یاسایی نێوان دوو کەس و بەپێی ئەو پەیوەندییە یەکێکیان کە بریتیە لە قەرزدار پابەند دەکرێت بە ئەنجامدانی کارێك یان قەدەغەکردن لە ئەنجام دانی کارێك یان بە دانی شتێك.

لە سەردەمی رۆمان هەولێك هەبووە بۆ نەهێشتنی ئەو دابەشکردنە لە رێگەی نزیککردنەوەی مافی عەینی لە مافی کەسی بە دانانی گشت مافەکان بە مافی کەسی لەسەر بنەمای ئەوەی کەوا مافەکان دەگەڕێنەوە بۆ پەیوەندی نێوان کەسەکان[1].

لێرەدا بۆچوونێکی تر هەیە هەوڵدەدات بۆ ئەوەی مافی کەسی بچێتە چوارچێوەی مافی عەینی[2]. لەسەر ئەو بنەمایەی کەوا گشت مافەکان بریتین لە نرخێکی دارایی و بەشێکن لە ئەستۆی دارایی و بە هەمان شێوەی مافی عەینی دەستکاری دەکرێت و بە هەمان شێوەی مافی عەینی دەکرێتە بارمتە و دەکرێتە دیاری و هەر کارێکی لەو جۆرە.

بەڵام ئەو بۆچوونەی کەوا پێویستە کاری پێ بکرێت بریتیە لە جیاوازیکردن لە نێوانیان، شایەنی باسە مافی کەسی لە یاسا یەکسانە بە قەرز لە فیقهی ئیسلامی هەروەها مافی عەینی لە یاسا هاواتایە لەگەڵ عەین لە فیقهی ئیسلامی، و پێشتر باسی ئەوەمان کرد، و لە رووی سروشتی ماف بەسەر مافی ماددی و وەکو مافی خاوەندارێتی بەسەر خانوو یان ئۆتۆمبێل یان هەر مافێکی لەوجۆرە و مافی مەعنەوی وەکو مافی دانەر بەسەر بیروبۆچوون و بیروراکانی و زانیارییەکانی تری دابەش دەکرێت بەڵام مافی دانەر بەسەر کتێبەکە بریتیە لە مافێکی ماددی.

دواتر ئەگەر ماف بۆ سوودی گشتی تەرخانکرا بێت پێی دەگوترێت مافی گشتی وەکو مافی هاوڵاتی لە سوود وەرگرتن لە شوێنە گشتییەکانی دەوڵەت وەکو نەخۆشخانە و قوتابخانە و هەر جێگایەکی لەو جۆرە و ئەگەر بۆ بەرژەوەندی گشتی تەرخان نەکرابێت پێی دەگوترێت مافی تایبەتی.

---

[1] – ئەوە بۆچوونی فیقهی فەرەنسی (بلانیول)یە.

[2] – لە سەرووی یاوەرانی ئەو بۆچوونە فیقهی ئەلمانی (فون جیرك) و فیقهی فەرەنسی (ئەمبیر).

## بەشی دووەم:
## پابەند بوونی دارایی
## الالتزام المالي

### پابەند بوون (الالتزام):

یاسادانەری عیراقی لە ماددەی ٦٩ لە یاسای شارستانی پابەند بوون لە بەرامبەر مافی کەسی دادەنێت لەسەر ئەو بنەمایەی کەوا هەردووکیان وەکو یەك دراوی دووڕوون و سەبارەت بە خاوەن قەرز بریتیە لە مافی کەسی و سەبارەت بە قەرزدار بریتیە لە ئەرك.

لە بڕگەی یەکەم هاتووە (مافی کەسی بریتیە لە پەیوەندییەکی یاسایی لە نێوان دوو کەس خاوەن قەرز و قەرزدار و بەپێی ئەو پەیوەندییە خاوەن قەرز داوا لە قەرزدار دەکات کەوا مافی عەینی بگوازێتەوە یان کارێك ئەنجام بدات یان قەدەغەی دەکات لە ئەنجامدانی کارێك).

لە بڕگەی دووەم هاتووە (پابەند بوون بە گواستنەوەی خاوەندارێتی جا هەر شتێك بێت پارە بێت یان شتێکی وێنەدار یان نرخدار بە مافێکی کەسی دادەنرێت.
هەروەها پابەند بوونْ بە تەسلیم کردنی شتێکی دیاریکراو بە مافێکی کەسی دادەنرێت).

تێبینی لەسەر ئەو بڕگەیە خاوەندارێتی لە شتە گوازراوە دیاریکراوەکان بە بینینە یان بە ئیشارەتە و تەنها بە ئەنجامدانی گرێبەست دەگوازرێتەوە نەك بە پابەندبوون بە ئامادەکردنی شتەکە، هەروەك لە شتە وێنەدارەکان پێویست نییە پارە بە جیا باس بکرێت.

له بڕگەی سێیەم هـاتووە (دەربڕینـی بـە وشـەی پابەنـدبوون و بـە وشـەی قـەرز هەمان واتای دەربڕین بە وشەی مافی کەسی دەگەیەنێت)، واتـا ئـەو هەرسـێ وشـانە هاواتان.

تێبینی دەکرێت کەوا قەرز بابەتی پابەنـد بوونـە و هاوواتـای پابەنـدبوون نییـە، و مافی کەسی خەسڵەتی خاوەن قەرزە و پابەندبوون خەسڵەتی قەرزدارە مادام خاوەن خەسڵەتەکان جیاواز بن و خەسڵەتەکانیشیان جیاوازن کەواتە چۆن دەبنە هاوواتا؟

دواتر زانایانی یاسا دەڵێن: ئەستۆی دارایی لـە دوو بـەش پێك دێت یـەکێکیان ئیجابییە کە بریتیە لە مافی کەسی، و دووەمیـان سـلبییە کـە بریتیـە لـە پابەنـدبوون کەواتە ئەگەر وایە چـۆن دەگونجـێ بگوترێـت هاوواتـان دواتـر لـە زانسـتی فەلسـەفە پەیوەندی یاسایی بریتیە لە خەسڵەتێکی هاوبەش لە نێوان دوو شت ۆ سـەبارەت بـە هەردووکیان وەکو یەکتر سەیر دەکرێت وەکو باوکایەتی و برایەتی.

پابەندبوون لـە رووی کاریگـەری خەسـڵەتێکی تایبەتـە بـە قـەرزدار کەواتـە چـۆن دەکرێت پێناسەی خەسڵەتێکی تایبەتی بە خەسڵەتێکی هاوبەش بکرێت لەگەڵ ئەوە پێویستە پێناسەکار و پێناسەکراو یەك بن تاکو بکرێت یەکێکیان بخرێتە سەر ئەوەی تر، و بە ئیعتیبار جیاواز بن تاکو پێویسـت نـەبێت شـتێك بخرێتـە سـەر خـۆی وەکـو پێناسەکردنی تاوان بەوەی کـەوا کـارێکی قـەدەغکراوە و سزای لەسـەرە و شـایەنی باسە ئەوەی لە ماددەی ٦٩ هاتووە بریتیە لە بۆچـوونی زانایـانی یاسـا و لـە ناویانـدا پرۆفیسۆر سنهوری بەجۆرێك کەوا پابەنـدبوون بـەوە پێناسـە دەکـات کـە بریتیـە لـە (حالەتێکی یاسایی[1]).

دەستەواژەی (حالەتێکی یاسایی) هەمان دەستەواژەی (پەیوەندی یاساییە) بۆیە بە هەمان شێوەی رەتدانـەوەی پێناسـەی یاسـای شارسـتانی رەتـی ئـەو پێناسـەیە دەدەینەوە.

---

[1] – الوسيط/١٢٥/١/بند/١٤.

بەوپێیە پێشنیاز دەکەم کەوا پابەندبوون بەو جۆرە پێناسە بکرێت (بریتیە لە بەجێگەیاندنی ئەرکێك بە خۆشی [١] یان بە زۆری [٢] و دەبێتە مایەی سەرقاڵکردنی ئەستۆ بە مافی کەسێك تاکو هەڵدەوەشێتەوە [٣]).

## رەگەزەکانی پابەندبوون – عناصر الالتزام:

زۆربەی زانایانی یاسا پێیان وایە کەوا رەگەزەکانی پابەندبوون سێ رەگەزن و بریتین لە: بابەت و رەزامەندی و هۆکار و بریتین لە هەمان رەگەزەکانی گرێبەست و ئەوەش لە مەنتیقی یاسایی رەتدەکرێتەوە چونکە رەگەزی هەر شتێك بریتیە لەو رەگەزەی کەوا ئەو شتەی پێیەوە بەندە بەوپێیە رەگەزەکانی پابەندبوون شەشەن:

١– پابەندکردن: چونکە پابەندبوون کردەوەیە و پابەندبوون گوێراڵیکردنە و دەگوترێت پابەندی کرد و پابەند بوو.

٢– پابەندکراو: و بریتیە لە قەرزدار.

٣– پابەند بۆ کراو: و بریتیە لە خاوەن قەرز.

٣– پابەندبوون تیاکراو: و بریتیە لە بابەتی پابەند بوون.

٥– پابەندبوون پێیەوە: و بریتیە لە شوێنی پابەندبوون.

٦– هۆکاری پابەندبوون.

بۆ نموونە گرێبەستی فرۆشتن هۆکارە بۆ پابەندبوون و یاسا سەرچاوەی پابەندکردنە و فرۆشیار پابەندە بە تەسلیمکردنی ئۆتۆمبێل و پێویستە پارەی تەسلیم بکرێت هەروەکو کڕیار پابەندە بە دانی پارە و پێویستە شتە فرۆشراوەکەی تەسلیم بکرێت و تەسلیم کردنیش بریتیە لە بەجێگەیاندن بابەتی پابەند بوون.

---

[١] – وەکو ئەو پابەندبوونەی لە گرێبەستی فرۆشتن دەکەوێتەوە

[٢] – وەکو پابەندبوون بە دانی باج.

[٣] – بە هۆی یەکێك لە هۆکارەکانی وەکو دانەوە و جیابوونەوە.

زۆر لە یاساکان[1] و زانایانی یاسا بابەتی پابەند بوون کە بریتیە لە بابەتی گرێبەست لەگەڵ بابەتی پابەند بوون کە بریتیە لە بەجێگەیاندن وەکو تەسلیمکردن و دانەوە و گەڕاندنەوە هەر کارێکی لەو جۆرە تێکەڵ دەکەن، و ئەوەش هەڵەیە چونکە پابەندبوون یەکێکە لە ئەحکامە تەکلیفییەکان و تەنها پەیوەستە بە کردەوەکان نەك شتە بەرچاوەکان.

## سەرچاوەکانی پابەند بوون - مصادر الالتزام:

ئەو یاسا عەرەبییانەی بە یاساکانی رۆژئاوا کاریگەر بوونە بڕیاریانداوە کەوا سەرچاوەکانی پابەندبوون پێنجن و بریتین لە گرێبەست و ویستی یەکلایەنە و کردەوەی ناڕەوای زیانبەخش و دەوڵەمەندبوونی بەبێ هۆ (بەدەست هێنان بەبێ هۆ) و یاسا و ئەوە تێکەڵکردنی هۆکار و سەرچاوەکانە چونکە لە مەنتیقی یاسایی جگە لە یاسا ئەوانی تر هۆکاری پابەندبوونن و سەرچاوەی پابەندبوون تەنها بریتیە لە شەرع یان یاسا لەبەر ئەو چەند هۆکارەی خوارەوە:

١- بەپێی بۆچوونی گشت زانایانی شەریعە و یاسا پابەندبوون حوکمێکی سەپێندراوە و حوکمی راسپێردراو تەنها لە خودای گەورە یان یاسادانەر دەردەچێت[2].

---

[1] - وەکو یاسای عیراقی ئێستا ١٢٩/١ کە تیایدا هاتووە (دروستە بابەتی پابەندبوون لە کاتی بەستنی گرێبەست نەبێت ئەگەر بکرێت لە داهاتوو دەست بکەوێت و بەو جۆرە دیاری بکرێت کەوا هیچ نادیاری و خەڵەتاندێکی تیادا نەبێت)، و راستەکەی یەوە کەوا بگوترێت دروستە (بابەتی پابەندبوون) یان (شوێنی پابەندبوون) چونکە بەردەوام شوێنی پابەندبوون بریتیە لە کردەوە نەك شتێکی دیاریکراو.

[2] - شارع/ بۆ زاتی خودا بەکار دێت، و مشرع بۆ دەسەڵاتی یاسادانانی سەردەم بەکار دێت چونکە دەستەواژەی دووەم واتای بارگرانی و راسپاردن دەگەیەنێت و ئەوەش لە خودای گەورە ناوەشێتەوە.

٢- زانایانی یاسا کۆکن لە سەر ئـەوەی کـەوا سەرچـاوی ئـەو پابەندبوونانـەی لـە ڕووداوە سروشتییەکان دێنە کایەوە بریتیە لە یاسا و جیاوازی نێوان ئـەو ڕووداوانـە و چوار هۆکارە ناوبراوەکان تەنها بریتیە لەوەی کـەوا لـەو هۆکارانـە ویست هەیـە و لـە ڕووداوەکـان نییـە و ئـەوەش نابێتـە هـۆی پێویسـتی دانـانی هـەمان هۆکارەکـان بـە سەرچاوەی یەکێکیان و سەرچاوەی ئەوەی تریش یاسا بێت.

٣- کۆدەنگی زانایان لەسەر ئەوەیە کەوا سەرچاوەی کێشە تاوانییەکان بریتیە لە یاسا و هیچ جیاوازی لە نێوان کاروبارە تاوانییەکان و کاروبـارە شارسـتانییەکان نییـە تـەنها بـە پێـی سروشـتی ئـەو هەڵەیـە نـەبێت کـەوا یەکێکـە لـە ڕەگـەزەکانی بەرپرسـارییەتی و ئـەوەش پاسـاوێك نییـە بـۆ جیـاوازیکردن لـە نێوانیـان لـە ڕووی سەرچاوە.

٤- جیاوازی نییە لەسەر ئەوەی کەوا گرێبەست و ویستی یەکلایەنـە یەکێکـە لـە هۆکارەکانی بە دەستهێنانی مافەکان و هیچ جیاوازی لە نێوان ماف و ئەرکەکان نییـە لەو ڕووەی کەوا هەردووکیان شوێنەواری گرێبەستن ئەی کەواتـە بـۆ لـە مافـەکان بـە هۆکار دادەنرێت، و سەبارەت بە ئەرکەکان بە سەرچاوە دادەنرێت لەگەڵ ئەوەی کەوا سروشتی هەردووکیان یەکە کە بریتیە لە شوێنەوار.

٥- ئەگەر مرۆڤ لە جێبەجێنەکردنی ئەرك یان زیانگەیاندن بە ئەرکەکان لـە سـزای شەرع یان یاسا نەترسێت زۆر لـە خـەڵکی ئـەرکی خـۆی ئـەنجام نـادات چـونکە ئـەو هێزەی جێبەجێکردنی ئەرك پێویست دەکات بریتیە لە یاسا و بۆیە تاکە سەرچـاوەی پابەندبوون و ئەرك بریتیە لە یاسا.

٦- پێش دروست بوونی یاسا و دەوڵەت سەرچـاوەی پابەنـدبوون بـریتی بـوو لـە داب و نەریتە باوەکان و دواتر یاسـا هـاتوو و جێگـەی ئـەو داب و نەریتانـەی گرتـەوە چونکە لە ڕووی سەرچاوە هیچ جیاوازی لە نێوان (البدل و المبدل منه) نییە[1].

---

[1] - بۆ زیاتر درێژە بگەڕێوە بۆ کتێبەکەمان (نظرية الالتزام بالرد غير مستحق) ل٣ و دواتر.

## جۆرەکانی پابەند بوون:

پابەندبوون لە چەند رووێکەوە دەکرێتە چەند بەشێك بەو جۆرەی خوارەوە:

**یەکەم: لە رووی پاراستنی یاسایی بریتیە لە پابەندبوونی شارستانی و سروشتی:**

١- پابەندبوونی شارستانی (الالتزام المدني): بریتیە لە پابەندبوونی یاسایی تەواو و یاسا پاسەوانی لێ دەکات و گوێ لە داوای یاسایی داواکاری جێبەجێکردن دەگرێت و پێویستە لەسەر دادوەر بڕیار بدات بە جێبەجێکردنی بە تەواوەتی کەواتە ئەگەر جێبەجێکردنی ناتەواو بوو یان پابەندکراو بەبێ پاساوی یاسایی جێبەجێی نەکرد بڕیار دەدات بە سزا کە بریتیە لە قەرەبووکردنەوە یان فرۆشتنی سامانەکەی بە زۆر بە مەبەستی جێبەجێکردنی بە ناچاری.

٢- پابەندبوونی شارستانی (الإلتزام الطبيعي): بریتیە لەو پابەندبوونەی کەوا پاسەوانی یاسایی و خەسڵەتی جێبەجێکردنی بە زۆر و بەرپرسیارییەتی لەدەستداوە بەهۆی بەسەرچوونی ماوە واتا بەسەرچوونی ماوەی داواکردن، و ماوەی بەسەرچوون لە یاسا بەپێی سروشتی ماف و ئەرکەکان دەگۆڕێت و عادەتەن لە نێوان ساڵێك[1] و پانزە ساڵ دایە.

پابەندبوونی شارستانی بە بوونی رەگەزی بەرپرسیارییەتی لە پابەندبوونی سروشتی جیادەکرێتەوە واتا پێویستە لەسەر قەرزدار ئەرك و پابەندبوونی خۆی بە ویستی خۆی جێبەجێ بکات ئەگەرنا ناچار دەکرێت لەسەر جێبەجێکردن، و شایەنی باسە بەسەرچوونی ماوە دەبێتە هۆی گوێنەگرتن لە داوا واتا داواکەی لەدەست دەچێت بەڵام مافی دەمێنێت، کەواتە مافەکە لە ئەستۆی قەرزدار دەمێنێتەوە بەڵام

---

[1] - وەکو گرێبەستی فریودان و ئیستغلالکردن چونکە ئەو کەسەی لەو گرێبەستە ئیستغلالکراوە دوای بەسەرچوونی یەك ساڵ بۆی نییە داوای لابردنی ئەو زیانە بکات کەوا لە کاتی بەستنی گرێبەستی بەری کەوتووە، ماددەی ١٢٥ لە یاسای شارستانی عیراقی بەکار.

ناچار ناكرێت لەسەر جێبەجێكردنی بەڵكو جێبەجێكردنی بەدەستی ویستی قەرزدارە و ئەگەر بە ویستی خۆی جێبەجێی كرد بۆی نییە پاشگەزبێتەوە لە جێبەجێكردن بە بیانووی ئەوەی پابەندبوونی سروشتییە.

**دووەم: لە رووی شێوازی بابەتەكەی[1] بریتییە لە پابەندبوون بە دانی شتێك یان ئەنجامدانی كارێك یان قەدەغەكردن لە كارێك:**

١- پابەندبوون بە دانی شتێك (الالتزام بعطاء): بریتییە لە پابەندكردن بە گواستنەوەی شتێك وەكو خاوەندارێتی بۆ نموونە پابەندكردنی فرۆشیار بە جیاكردنەوەی شتی فرۆشراو ئەگەر سامانێكی نوێنەداری دیاریكراو بێت لە رووی جۆر یان دروستكردنی مافێكی عەینی وەكو پابەندكردنی دراوسێ بە دروستكردنی مافی هاوتەنیشتی بۆ خانوو یان زەوی دراوسێیەكەی وەكو شوێنی هاتووچۆ یان ئاوەڕۆ و هەر مافێكی تری هاوتەنیشتی و وەكو پابەندبوونی فرۆشیار بە گواستنەوەی خاوەندارێتی فرۆشراو بە تۆماركردنی لە فەرمانگەی تۆماركردنی خانووبەرە لە یاسای میسری چونكە فرۆشتنی خانووبەرە لە دەرەوەی فەرمانگەی تایبەتمەند دەبێتە هۆی پابەندبوون بە تۆماركردن بەڵام تاكو دوای تۆماركردن ماف دروست نابێت بەپێچەوانەی یاسای عیراقی (م ٥٠٨) لە یاسای شارستانی عیراقی و (م٣) لە یاسای تۆماركردنی خانووبەرەی بەركار بەجۆرێك كەوا لەو یاسایە گرێبەستەكە پووچەڵە و هیچ پابەندبوون و مافێكی لێ ناكەوێتەوە، و شەریعەتی ئیسلامی نەیاری ئەو شێوەیە نییە مادام پاراستنی مافی خەڵكی تیادایە.

---

[1] - لە راڤەكانی یاسا (لە رووی شێوازی جێگە - محل) هەروەكو لە (مصادر الالتزام عبدالمنعم البدراوی)، ل١٥ هاتووە و ئەوە هەڵەیە هەر وەكو چەندین جار باسمان كردووە چونكە محل بریتییە لە بەجێگەیاندنی ئەرك لە گشت پابەندبوونەكان و محل بابەتی پابەندبوون و بابەتی گرێبەستە.

٢- پابەندبوون بە ئەنجامدانی کارێك (الالتزام بعمل): یەکسانە کارێکی ماددی بێت وەکو پابەندبوونی بەڵێندەر بە ئەنجامدانی پرۆژەیەك دوای تەواوبوونی گرێبەستی بەڵێندەرایەتی یان کارێکی مەعنەوییە (کارێکی یاسایی) وەکو جێگرایەتی بریکار لە جیاتی کەسی رەسەن لە ئەنجامدانی رەفتارێکی یاسایی، و یەکسانە کارەکە شیاوی جێگرایەتی نەبێت بەجۆرێك کەوا هیچ کەس بۆی نەبێت بەجێی بگەیەنێت وەکو پابەندکردنی هونەرمەند بە کێشانی تابلۆیەکی دیاریکراو یان پزیشکی تایبەتمەند بە ئەنجامدانی نەشتەرگەری یان ئەو کارە شیاوی جێگرایەتی بێت وەکو جێگری بەلێندەر لە دروستکردنی ئەو پرۆژەیەی بۆ جێگرایەتی دەگونجێت.

٣- پابەندکردن بە قەدەغەکردن لە ئەنجامدانی کارێك (الالتزام بالامتناع عن العمل): یەکسانە چ قەدەغەکردن بێت لە ئەنجامدانی کارێکی ماددی وەکو پابەندکردنی کەسێك بە رکابەرایەتی نەکردنی یەکێکی تر لە چالاکییەکی بازرگانی دیاریکراو لە ناوچەیەکی دیاریکراو یان پابەندکردن بە ئەنجام نەدانی کارێکی یاسایی وەکو پابەندکردنی فرۆشیار بە دەستکاری نەکردنی فرۆشراو دوای وەرگرتنی لەلایەن کڕیار.

**سێیەم: لە رووی دەرئەنجام بریتیە لە پابەندکردن بە گرنگی پێدان و پابەندکردن بە هێنانەدی ئامانجێك:**

١- پابەندکردن بە گرنگی پێدان و ئەو پەڕی هەوڵدان (الالتزام ببذل العناية): وەکو پابەندکردنی نەشەرگەر - برین پێچ - بە ئەو پەڕی گرنگی پێدان و رەچاوکردنی بنەما و رێسا پزیشکییەکان و ئیحتیات وەرگرتن و هۆشیار بوون دەربارەی ئەنجامدانی کارێکی نەشتەرگەری کەواتە ئەگەر پزیشکی نەشتەگەری تایبەتمەند سەرەڕای ئەوپەڕی گرنگی دان بە کارەکەی لە نەشتەگەرییەکە سەرکەوتوو نەبوو نەخۆش یان میراتگرانی نەخۆش بۆیان نییە داوای لە دژی تۆمار بکەن.

٢– پابەندکردن بە هێنانەدی ئامانجێك (الالتزام بتحقيق الغاية): بریتیە لەو کەسەی کەوا پابەندکراوە بە هێنانەدی ئامانجێکی پەیوەست بە ویستی ئەو کەسە وەکو پابەندکردنی قوتابی بە سەرکەوتنی لە تاقیکردنەوە و دەربازبوونی لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر.

**چوارەم: لە رووی وادە (کات) بریتیە لە پابەندبوونی دەستبەجێ و پابەندبوونی دواخراو:**

١– **پابەندبوونی دەستبەجێ (الالتزام الحال)**: بریتیە لەو پابەندبوونەی کەوا لایەنەکان رێك ناکەون لەسەر جێبەجێکردنی پابەندبوونەکە دوای کاتێکی دیاریکراو، و پابەندبوونی هەر گرێبەستێك پابەندبوونی دەستبەجێیە و پێویستە دەستبەجێ جێبەبکرێت ئەگەر بەپێچەوانەی ئەوە رێك نەکەوتبن.

٢- **پابەندبوونی دواخراو (الالتزام المؤجل)**: بریتیە لە رێککەوتن لەسەر وادەیەکی دیاریکراو لە داهاتوو بۆ جێبەجێکردنی پابەندبوونەکە وەکو فرۆشتنی بە قیست و پابەندبوونەکانی گرێبەستی دڵنیاکردن – بیمەکردن.

**پێنجەم: لە رووی بابەت بریتیە لە پابەندبوونی عەینی و پابەندبوونی کەسی:**

١- **پابەندبوونی عینی (الالتزام العينی)**: بریتیە لە پابەندبوون بە بەجێگەیاندنی شتێکی دیاریکراو، و بە دەربڕینێکی تر بریتیە لەو پابەندبوونەی کەوا بابەتەکەی بریتیە لە شتێکی دیاریکراو وەکو پابەندبوون بە تەسلیم کردنی شتی فرۆشراو کە بریتیە لە بابەتی پابەندبوون و ئەرکەکە بریتیە لە تەسلیمکردن.

٢- **پابەندبوونی کەسی (الالتزام الشخصی)**: بریتیە لەو پابەندبوونەی کەوا بابەتەکەی بریتیە لە مافێکی کەسی وەکو ئەو قەرزەی لە ئەستۆی قەرزدارە.

هەندێك پێیان وایە کەوا فیکرەی پابەندبوونی عەینی لە یاسا دەستکردەکان نادیارە لەوانە یەکێك پێی وایە کەوا بریتیە لە پابەندبوونێکی کەسی ئاسایی و هەندێکی تر دەڵێن: بریتیە لە پابەندبوونێکی سەربەخۆ و لە نێوان مافی عەینی و

مافی کەسی دایە، و تیمێکی تر لەناویاندا پرۆفیسۆر سنهوری پێی وایە پابەندبوونی عەینی درێژە پێدەری مافی کەسییە و پابەندبوونێکی سەربەخۆ نییە[1].

پێمان وایە کەوا ئەو بیرورا جیاوازانە لە ئەنجامی نەبوونی پێناسەیەکی پڕ بەپێست بۆ هەریەك لەو دوو جۆرە دروست بوونە هەر وەکو پێشتر باسمانکرد.

**شەشەم: لە رووی چوارچێوە – سنوور – بریتیە لە پابەندبوونی گشتی و تایبەتی:**

١- **پابەندبوونی گشتی (الالتزام العام)**: بریتیە لە پابەندبوونی گشت کەسێك بە زیان نەگەیاندن بە کەسێکی تر بەبێ پاساو و بە ناڕەوا لە پەیوەندییە داراییەکان وەکو فێڵ نەکردن یان فریوندان یان ئیستیغلال نەکردن یان ئەنجام نەدانی هەر کارێکی دژ بە مرۆڤ و هەر یەکێك لەو کارانەی دەبێتە مایەی بەرپرسیارییەتی کەمتەرخەمی.

٢- **پابەندبوونی تایبەتی (الالتزام الخاص)**: بریتیە لە پابەندبوونی یەکێك لە لایەنەکانی گرێبەست بەرامبەر بەوەی تر و زیانگەیاندنی بە لایەنی بەرامبەر کە دەبێتە مایەی بەرپرسیارییەتی گرێبەستی.

**حەوتەم: لە رووی دروستبوون بریتیە لە پابەندبوونی بنەڕەتی و پاشکۆیی:**

١- **پابەندبوونی بنەڕەتی (الالتزام الاصلی)**: بریتیە لە پابەندبوونی سەربەخۆ و سەر بە هیچ پابەندبوونێکی تر نییە وەکو پابەندبوونی لایەنەکانی گرێبەست لە گرێبەستی فرۆشتن یان گرێبەستی بەکرێگرتن یان هەر گرێبەستێکی لەو جۆرە و ئەو جۆرە پابەندبوونە تەنها بە هۆی هۆکارەکانی هەڵوەشانەوەی گشت پابەندبوونەکان نەبێت هەڵناوەشێتەوە.

٢- **پابەندبوونی پاشکۆیی (الالتزام التبعی)**: بریتیە لە پابەندبوونی ناسەربەخۆ واتا سەربە پابەندبوونێکی تری بنەڕەتییە کەوا بە مانەوەی پابەندبوونی

---

[1] – بڕوانە د.عبدالعزیز عبدالقادر، الالتزام العینی بین الشریعة و القانون، ل٥.

بنەڕەتی دەمێنێتەوە و بە هەڵوەشانەوەی پابەندبوونی بنەڕەتی هەڵدەوەشێتەوە وەکو پابەندبوونی کەفیل بە دانەوەی قەرز ئەگەر قەرزداری بنەڕەتی نەیدایەوە کەواتە تاکو پابەندبوونی قەرزداری بنەڕەتی بەردەوام بێت پابەندبوونی ئەویش بەردەوام دەبێت و ئەگەر بە هۆی یەکێك لە ڕێگاکانی هەڵوەشانەوە وەکو دانەوەی قەرز یان بەریەکخستن و یەکبوونی ئەستۆ[1] و هەر هۆکارێکی لەو جۆرە هەڵوەشایەوە پابەندبوونی کەفیلیش بە شێوەیەکی سروشتی هەڵدەوەشێتەوە.

**هەشتەم: لە رووی سروشتی بریتیە لە پابەندبوونی شارستانی و تاوانی:**

١- **پابەندبوونی شارستانی (الالتزام المدنی):** بریتیە لەو پابەندبوونەی کەوا زیان پێگەیاندنی دەبێتە مایەی بەرپرسیارییەتی گرێبەستی وەکو زیانگەیاندنی فرۆشیار بە تەسلیمکردنی فرۆشراو لە کات و شوێنی دیاریکراو، و زیانگەیاندنی کڕیار بە تەسلیمکردنی پارە لە وادەی دیاریکراو.

٢- **پابەندبوونی تاوانی (الالتزام الجنائی):** بریتیە لەو پابەندبوونەی کەوا زیان پێگەیاندنی تاوانە وەکو پابەندکردنی مرۆڤ بە دەستدرێژی نەکردنە سەر ژیانی کەسێکی بێتاوان و وەکو پابەندبوون بە دەستپاکی.

**نۆیەم: لە رووی سروشتی بەجێگەیاندن بریتیە لە پابەندبوونی بەجێگەیاندن و پابەندبوونی قەدەغەکردن:**

١- **پابەندبوونی بەجێگەیاندن (الالتزام ذو الاداء الایجابي):** بریتیە لە پابەندکردنی کەسێك بە دانی شتێك بە یەکێکی تر وەکو پابەندبوونی دیاری بەخش بە تەسلیمکردنی دیاری بە کەسی بەرامبەر.

٢- **پابەندبوونی قەدەغەکردن (الالتزام ذو الاداء السلبي):** بریتیە لەو پابەندبوونەی کەوا بەپێی ڕێککەوتن قەرزدار قەدەغە دەکات لە ئەنجامدانی هەر کارێك کەوا دروست

---

[1] – یەکبوونی ئەستۆ بۆ نموونە ئەگەر خاوەن قەرز بمرێت و میراتگری تەنها قەرزدار بێت.

بێت ئـەنجامی بـدات ئەگـەر ئـەو پابەندبوونـە نەبایـە وەكـو پابەنـدبوونی كڕیـار بـە ركابەرایەتی نەكردنی فرۆشیار لە فرۆشتنی شتێكی هاوشێوەی ئەو شتەی لە شـوێنی بازرگانی ئەو دەفرۆشرێت[1] .

**دەیەم: لە ڕووی بەجێگەیاندن بریتیە لە پابەندبوونی تەواو و ناتەواو:**

١- **پابەنـدبوونی تـەواو (الالتـزام التـام الوفـاء):** بریتیـە لـەو پابەندبوونـەی كـەوا قەرزدار گشت ئەركەكەی بەجێدەگەیەنێت بەو جۆرەی بـەپێی شـەرع یـان یاسـا یـان ڕێككەوتن لەسەری پێویستكراوە.

٢- **پابەنـدبوونی ناتـەواو (الالتــزام النــاقص):** بریتیــە لــە كــەم و كــوڕی لــە بەجێگەیاندن لە ڕووی بڕی شتەكە یان چۆنیەتی یان دواخسـتنی و ئەگـەر ئـەو كـارە زیانی لێكەوت بێتەوە پێویستە لەسەر قەرزدار قەرەبووی ئەو زیانە بكاتەوە.

**یانزەهەم: لە ڕووی جێبەجێكردنی بریتیە لە پابەندبوونی خۆویستی و بەزۆر:**

١- **پابەندبوونی خۆویستی (الالتزام الاختیاري):** بریتیـە لـەو پابەندبوونـەی كـەوا قەرزدار بە ویستی خۆی قەرزەكەی بداتەوە.

٢- **پابەندبوونی بـە زۆر (الالتزام الجبري):** بریتیـە لـەو پابەندبوونـەی كـەوا دادگـا پێویستە دەكات لەسەر قەرزدار بەجێی بگەیـەنێت ئەگـەر بـە ویسـتی خـۆی بـەجێی نەگەیاند.

---

[1]- بڕوانە د. عبدالحي حجازي – النظرية العامة للالتزام/ ٢/٤ و دواتر.

# باسی چوارەم:
# شایستەیی پابەندبوون و بەربەستەکانی شایستەیی
# أهلية الالتزام و عوارضها

ئەو باسە دەکرێتە دوو بەش یەکەمیان بۆ پێناسەی شایستەیی تەرخان دەکەین و لە دووەمیان پێناسەی بەرەستەکانی شایستەیی دەکەین.

## بەشی یەکەم:
## پێناسەی شایستەیی
## التعریف بالاهلیة

**شایستەیی یان شیاوی – الاهلیة:** لە زمانەوانی بریتیە لە گونجان و دەگوترێت فلان کەس شیاوی ئەو شتەیە.

لە زاراوەی فیقهی دەکرێتە دوو بەش شیاوی وجوبی و شیاوی بەجێگەیاندن، و هەردووکەیان بەسەر ناتەواو و تەواو دابەش دەکرێن.

هەر بەشێك پێناسەیەکی تایبەت بەخۆی هەیە بۆیە ناکرێت بە شێوەیەکی گشتی پێناسەی شیاوی بکرێت چونکە شێوە و چۆنیەتی بەشەکانی شیاوی جیاوازە.

**یەکەم: شیاوی پێویستی ناتەواو (أهلیة الوجوب الناقصة):**

بریتیە لە گونجانی کەسێك بۆئەوەی چەند مافێکی سوود بەخشی هەبێت ئەو مافانەی کەوا پێویستیان بە قەبولکردن نییە وەکو مافی میرات دوای مردنی میراتلێگیراوەکەی، و مافی وەسیەت دوای مردنی وەسیەتکار، و مافی وەقف ئەگەر

لەو کەسانە بوو کەوا وەقفی بۆکراوە.

کۆرپە پێش لەدایك بوونی ئەو شیاوییەی هەیە بەڵام ئەو مافانە لە کاتی هاتنەدی هۆکارەکان نابنە موڵکی ئەو بەڵکو بەستراونەتەوە بە لەدایك بوونی بە زیندوویی کەواتە ئەگەر بە زیندوویی لە دایك بوو خاوەندارێتی ئەو مافانەی بۆ کاتی هاتنەدی هۆکارەکان دەگەڕێتەوە واتا لە کاتی هتنەدی هۆکارەکان بە خاوەنی ئەو مافانە دادەنرێت.

ئەگەر بە مردوویی لە دایك بوو دوای ئەوەی بوونی هەبوو ئەوا لەو حالەتە گشت ئەو شتانەی بۆی پارێزراون دەگەڕێنەوە بۆ ئەو کەسەی کەوا لە کاتی نەبوونی ئەو لە بنەڕەتدا شایستەیەتی.

بەڵام ئەو مافانەی پێویستیان بە قەبولکردن هەیە وەکو کڕینی شتێك بۆ کۆرپە دروست نییە چونکە کۆرپە پێش لەدایك بوونی هیچ پێکهاتەیەکی نییە و هیچ وەلییەك و پێسپێرێکی نییە [1].

**دووەم: شیاوی پێویستی تەواو (أهلية الوجوب الكاملة):**

بریتیە لە گونجانی کەسێك بۆ ئەوەی مافی هەبێت و ئەرکیشی لەسەر بێت واتا تەنها بە لە دایك بوونی بە زیندوویی چەند مافێکی هەیە و هەندێك ئەرکیشی لەسەرە و شیاوی ئەوەیە لە ڕێگەی وەلییەکەی یان پێسپێرەکەی (جێگرایەتی شەرعی و یاسایی) چەند مافێك بە دەست بهێنێت و هەندێك ئەرکیشی لەسەرە وەکو پابەند بوونی بە خەرجی ئەو کەسانەی خەرجی و بژێوییان لەسەر ئەوە ئەگەر لایەنی دارایی بەهێز بێت و زەکاتی لەسەرە ئەگەر مەرجەکانی زەکاتی تیادا بێت بە بۆچوونی ئەو

---

[1] – هەندێك لە زانایان پێیان وایە دروستە پێش لە دایك بوون پێسپێر بۆ کۆرپە دابنرێت بە مەبەستی پاراستنی ئەو مافانەی پێش لەدایکبوونی هەیەتی و یاسای (الولاية على المال) میسری ساڵی ١٩٥٢ کاری پێ دەکات لە شیخ عیسی احمد عیسوی المدخل للفقه الاسلامي گوازراوەتەوە/ ل٤٨٢.

کەسەی پێی وایە زەکات خواپەرستییەکی داراییە و تیایدا لایەنی تواناى دارایی زاڵە بەسەر خواپەرستی.

بەڵام ئەوەی دەڵێت: لایەنی خواپەرستی زاڵە بەسەر لایەنی دارایی پێی وانییە زەکات لە سامانی ئەو پێویست بێت چونکە کۆرپە شیاوی خواپەرستی نییە.

شایەنی باسە هیچ بەربەستێکی شیاوی کاریگەری لەسەر شیاوی پێویستی تەواو نییە وەکو شێتی کەواتە ئەگەر کۆرپە دوای لەدایك بوونی شێت بوو هیچ مافێکی لەدەست نادات.

**سێیەم: شیاوی بەجێگەیاندنی ناتەواو – أهلية الاداء الناقصة:**

بریتیە لە گونجانی کەسێك بۆ ئەوەی چەند رەفتارێك ئەنجام بدات و چەند رەفتارێك ئەنجام نەدات و بە تەواوکردنی تەمەنی حەوت ساڵی ئەو شیاوییەی هەیە و تاکو گەیشتنی بە تەمەنی پێگەیشتن و بیرکردنەوە (سن البلوغ و الرشد) بەردەوام دەبێت.

لەو ماوەیە ئەو رەفتارانەی کەوا تەنها سوودیان هەیە بە شێوەیەکی گشتی راست و دروستن (جا وەلییەکەی مۆڵەتی پێدا بێت یان نا) وەکو وەرگرتنی بەخششەکان وەکو دیاری و پاداشتەکان و هەر شتێکی لەو جۆرە.

ئەو رەفتارانەی کەوا تەنها زیانیان هەیە بە شێوەیەکی گشتی پووچەڵن (جا وەلییەکەی مۆڵەتی پێدا بێت یان نا) بۆ نموونە ئەگەر سامان بەبێ بەرامبەر بدات بە یەکێکی تر.

بەڵام ئەو رەفتارانەی لە نێوان سوود و زیان یان قازانج و زەرە دان وەکو کڕین و فرۆشتن و بە کرێگرتن و هەر رەفتارێکی لەو جۆرە پەیوەستن بە مۆڵەتی وەلیەکەی کەواتە ئەگەر وەلی رازی بوو لە کاتی ئەنجامدانی بە رەفتارێکی راست و دروست دادەنرێت و ئەگەر رازی نەبوو لە بنەڕەتدا بە نەبوو دادەنرێت و هیچ شوێنەوارێکی شەرعی و یاسایی لێ ناکەوێتەوە.

شـایەنی باسـە لـە کاروبارەکـانی تـاوانی دوای تـەواوکردنی تەمـەنی نـۆ سـاڵی شایستەیی ناتەواوە.

**چوارەم: شیاوی بەجێگەیاندنی تەواو -- أهلیة الأداء الكاملة:**

بریتیە لە گونجانی کەسێك بۆ وەرگرتنی مافـەکانی و هـەڵگرتنی بەرپرسـیارییەتی شارستانی و تاوانی بەبێ وەلی و پێسپێر و بۆی هەیە ببەخشێت و مامەڵـە بکـات بـەو جۆرەی لە شەرع و یاسا هاتووە بەبێ ئەوەی پەیوەست بێـت بـە مۆڵـەتی کەسـێکی تر.

دوای دەرکەوتنی بیرکردنـەوە واتـا بـاش دەسـتکاریکردنی سـامانەکەی و توانـای لەسەر بەکارهێنانی و وەربەهێنانی سـامانەکەی بـە باشـی دەسـەڵات بەنـدی لەسـەر ناکام هەڵدەگیرێت چونکە خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿... فَإِنْ آنَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْداً فَادْفَعُواْ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ .... ﴾النساء/٦. واتا: ئەگەر هەستتانکرد ژیر و دانان سامانیان تەسلیم بکەن.

خەملاندنی گەیشتنی بە تەمەنی بیرکردنەوە لە ژێـر دەسـەڵاتی دادوەر دایـە دوای پشت بەستن بە کەسانی شارەزا و لێزان.

# بەشی دووەم:
# بەربەستەکانی شایستەیی
# عوارض الأهلية

لە رووی بەشداریکردن و بەشداری نەکردنی ویست لە روودانیان بەربەستەکان دەکرێنە دوو بەش بەربەستە نائیرادییەکان و پێیان دەگوترێت ئاسمانییەکان و بەربەستە ئیرادییەکان و پێیان دەگوترێت بەربەستە بەدەستهێنەرەکان، و لەو هەردوو حالەتە کاریگەری لەسەر شیاوی پێویستی (اهلية الوجوب) نییە هەروەکو باسمانکرد.

**لەو بەربەستانە:**

**یەکەم: ئەو بەربەستە نائیرادییانەی کاریگەرییان لەسەر هەردوو جۆری شیاوی بەجێگەیاندن (تەواو و ناتەواو) هەیە.**

**١- شێتی (الجنون):** بریتیە لە نەخۆشییەك كەوا تووشی مرۆڤ دێت و هێزی جیاکردنەوەی سوود و زیان و چاکە و خراپە لە یەکتری ناتەواو دەبێت و هەست بە چارەنووسی کاروبارەکانی ئێستا و داهاتوو ناکات.

ئەو بەربەستە دەبێتە مایەی نەمانی هەردوو جۆری شیاوی بەجێگەیاندن بەجۆرێك کەوا ئەو کەسەی تووشی ئەو نەخۆشییە بووە وەکو منداڵی.ناموموێەزە و گشت رەفتارەکانی پووچەڵن و هیچ ماف و پابەندبوونێکی شارستانی لێناکەوێتەوە هەروەها بەرپرسیارییەتی سزایی لەسەر نییە و بەوجۆرە یەکێکە لە بەربەستەکانی بەرپرسیارییەتی تاوانی.

شێتی یان بەردەوامە یان بەردەوام نییە واتا مرۆڤ لە هەندێك کات تووشی دێت و لە هەندێك کات هەشیارە بۆیە ئەو رەفتارە داراییانەی یان ئەو رەفتارە تاوانییانەی لە

کاتی هەشیاری ئـەنجامیان دەدات لـە رووی شـەرع و یاسـا بـە هەنـد وەردەگیرێـن و شوێنەواری شەرعی و یاساییان لێدەکەوێتەوە.

بەڵام ئەو رەفتارانەی لە کاتی شێتی ئەنجامیان دەدات بە نەبوو دادەنـرێن و هـیچ پابەندبوونێکی تاوانیان لێناکەوێتەوە، بەڵام ئەو رەفتارانەی دەبنـە هـۆی لـەناوبردنی شتێك پێویست بە قەرەبووکردنەوە دەکات.

٢- **لە هۆشخۆچوون - بوورانەوە (الاغماء)**: بریتیە لە نەخۆشییەك کەوا تووشـی مێشك دێت و هێزی جوولە و هەستکردن لە کاردەخات بـەڵام لـە بنەڕەتـدا عـەقڵ لـە بەین نابات بەڵکو لە حالەتی بوورانەوە دەیشێوێنێت.

لە رووی پابەندبوونە شارستانی و تاوانییەکان وەکـو شـێت و منـداڵی نامومەیـەزە چونکە هەست و ویستی لەدەست دەدات.

٣- **نووستن (النـوم)**؛ بریتیە لە حالەتێکی سروشتی مرۆڤ لە چەند کاتی رێکخراو و لە بنەڕەتدا عەقڵ لە بەین نابات بەڵام دەیشێوێنێت.

لە رووی شوێنەوارە شەرعی و یاساییەکان وەکو بەربەستەکانی پێشووە.

٤- **گێلی – کەم عەقڵی - (العتە)**؛ بریتیە لە دەردێکی نائیرادی کەوا دەبێتە هـۆی ناتـەواوی عـەقڵ و تووشـبوو قسـەکانی تێکـەڵ دەبێـت چـونکە هەنـدێك لـە قسەکانی وەکو کەسی ژیرە و هەندێك قسەشی وەکـو کەسـی شـێتە بـەو دەربڕینـە حالەتەکە دوو جۆرە:

یەکەم: هیچ هەست و نەستێکی نییە لـەو حالەتـە وەکـو کەسـی شـێتە هـەروەکو باسمان کرد.

دووەم: هەستی بە تەواوی لەدەسـت نـادات بـەڵام وەکـو کەسـانی ژیـری ئاسـایی هەستی نییە، و لەو حالەتە تووش بوو وەکو منداڵی مومەیەزە.

**دووەم: ئەو بەربەستانەی تەنها کاریگەرییان لەسەر شیاوی بەجێگەیاندنی تەواو هەیە نەک بەجێگەیاندنی ناتەواو، و لەوانە:-**

١- **گێلْ (السفه):** بریتیە لە ناتەواوییەك كەوا پـاڵ بـە مرۆڤـەوە دەنێت بـەرەو ئەنجامدانی کارێکی پێچەوانەی عەقڵی تەواو و شەرع و یاسا لەگەڵ ئەوەی لەراستیدا عەقڵی هەیە، ئەو کەسە لایـەن دادوەر دەسـەڵاتی بەنـد دەکرێـت — حیجـری لەسـەر دادەنرێت — و رەفتارەکانی وەکو رەفتارەکانی منداڵی مومەیەزن.

٢- **لەبیرچوون (الغفلة):** بریتیـە لـە لاوازی هەسـتکردن بـەجۆرێك كـەوا تووشـبوو بەرەو رەفتارەکانی سوودبەخش ناچێت و وەکو کەسی گێڵە هەروەکو باسمانکرد.

سێیەم: ئـەو بەربەسـتانەی کـەوا هـیچ کاریگـەرییان لەسـەر شـیاوی نییـە بـەڵام رەفتارەکانی مرۆڤ سنووردار دەکەن و بریتین لە:

١- **نەخۆشی مردن (مرض الموت):**- بەپێی راپۆرتی پزیشکی عادەتەن ئەو کەسە بە زرۆی دەمرێت وەکو نەخۆشی شێرپەنجە چونکە تاکو ئێستا زانستی پزیشکی رێگای چارەسەری ئەو نەخۆشییەی نەدۆزیوەتـەوە بۆیـە نەخۆشـییەکە رەفتارەکـانی مـرۆڤ سنووردار دەکات بەڵام کاریگەری لەسەر عەقڵی نییە و هەر رەفتارێکی نەخۆش کـەوا زیان بە مافەکانی خاوەن قـەرزەکان یـان میراتگران نەگەیـەنێت راسـت و دروسـتن و پێویستییان بە مۆڵەتی هیچ کەسێك نییە و جگە لەوانە هەر رەفتارێك زیـان بـە مـافی قەرزدارەکان یان میراتگران بگەیەنێت لەسەر مۆڵەتی خاوەن ماف دەوەستێت و ئـەو بەربەستە کاریگـەری لەسـەر هـەردوو جۆری بەجێگەیانـدن نییـە چـونکە کاریگـەری لەسەر عەقڵ و هەستی مرۆڤ نییە.

٢- قەرزێك كەوا گشـت سـامانی قـەرزدار بگرێتـەوە یـان زیـاتر بێـت لـە سـامانی قەرزدار:

رەفتارەکانی ئەو کەسـە قـەرزدارە دوای حیجـر لەسـەردانانی بەسـتراونەتەوە بـە مۆڵەتی ئەو خاوەن قەرزە یان میراتگرە یان هـەر کەسـێکی تـر کـەوا بـەو رەفتـارەی زیـانی پێـدەگات و سـامانی قـەرزداری حیجرلەسـەر دانـراو بـە زۆر دەفرۆشـرێت بـە

مەبەستی دانەوەی قەرزەکانی جگە لە کەرەستەکانی پێویستی ژیانی قەرزدار ئەگەر بە ویستی خۆی قەرزەکانی نەدایەوە.

لە ئەنجامی خستنەڕووی ئەو بەربەستانە ئەوەی خوارەوە وەردەگیرێت:

أ- منداڵی نامومەیەز و شێت و کەم عەقڵی نزیک لە شێت خۆیان دەسەڵاتیان بەندکراوە و رەفتارەکانیان پووچەڵن جا وەلی مۆڵەتی پێدا بێت یان نا.

ب- گێلّ و خاوەنی لە بیرچوون و ئەو قەرزدارەی قەرزەکەی گشت سامانی دەگرێتەوە بە (بڕیاری دادوەر) دەسەڵاتیان بۆ کەسانی تر بەند دەکرێت.

ج- وەلی بۆی هەیە بە مۆڵەتی دادگا بڕێك سامان تەسلیمی ئەو منداڵە مومەیەزە بکات کەوا تەمەنی پانزە ساڵی تەواوکردوە هەرچەندە مۆڵەتی بازرگانی پێنەدا بێت و مۆڵەتەکە گشتییە و سنووردارە.

د- لە کاتی مۆڵەت نەدانی وەلّی بە منداڵی مومەیەز دادگا بۆی هەیە مۆڵەتی پێ بدات و دوای ئەوە وەلی بۆی نییە حیجری لەسەر دابنێت.

هـ- دوای مۆڵەتی وەلی دادگا بۆی هەیە حیجر لەسەر منداڵ دابنێتەوە[1].

---

[1] - بڕوانە یاسای شارستانی عیراقی ژمارە ٤٠ی ساڵی ١٩٥١ ماددەکانی ٩٤١-١٠١.

# وانەی حەوتەم

## کاروبارەکانی خێزان (باری کەسی)

## شؤون الاسرة (الأحوال الشخصية)

خێزان کرۆکی کۆمەڵگەیە ئەگەر خێزان باش بوو کۆمەڵگەش باش دەبێت و چاکەکاری زۆر دەبێت و ئەگەر خراپ بوو کۆمەڵگە خراپ دەبێت و خراپەکاری بڵاودەبێتەوە بۆیە قورئانی پیرۆز گرنگی بە خێزان داوە و بە درێژی باسی کاروبار و ئەحکامەکانی خێزانی کردووە و ئەرك و مافی هەر تاکێکی خێزانی دیاریکردووە کەوا بە لەدایك بوون دەست پێدەکات و بە مردن کۆتایی دێت کە بریتین لە مارەبڕین و تەلاق و شیردان و داینگەیی و بژێوی و وردەکارییەکانی بۆ لێکدانەوەی فیقهی بەجێهێشتووە بۆ ئەوەی بەپێی خواستەکانی ژیان و پێشکەوتن و گۆڕانکاری ژیان خێزان رێك بخات بە مەرجێك ئەو رێکخستنە لە چوارچێوەی شەرع و بازنەی خورەوشت دەرنەچێت.

لە دوو باس بە کورتی باسی مارەبڕین و جیابوونەوە – بەردان (الطلاق) دەکەین.

# باسی یەکەم:
# مارەبڕین و
# ئەو شتانەی پەیوەستن بە مارەبڕین
# الزواج و مایتعلق به

مارەبڕین: بریتیە لە پەیماننامەیەك لە نێوان پیاو و ئافرەت بەپێی ئەو پەیماننامەیە هەردووکیان بۆ یەکتری حەلال دەبەن لەسەر بنەمای خۆشەویستی و ڕێزگرتن لە یەکتر و دڵنەوایی و سۆز و بەزەیی و بەرپرسیارییەتی هاوبەش[1].

کۆڵەگەکانی مارەبڕین: بریتیە لە داواکردن لەلایەن یەکێکی تر و قەبولکردن لەلایەنەکەی تر یان لەلایەن نوێنەرییان بە دەستەواژەیەك کەوا لە رووی زمانەوانی یان داب و نەریت[2] و شەرع واتای ئەنجامدانی مارەبڕین بگەیەنێت.

---

[1] – دەستەواژەی (میثاق/پەیماننامە)م لە پێناسەکە بەکارهێناوە چونکە لە قورئانی پیرۆز هاتوو ﴿وكَيْفَ تَأْخُذُونَهُ وَقَدْ أَفْضَى بَعْضُكُمْ إِلَى بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَاقًا غَلِيظًا {النساء/٢١}﴾ واتا: چۆن مارەییان لێ وەردەگرن لە کاتێکا ئێوە چوونەتە لای یەکتر و ئافرەتان پەیمانێکی بەهێز و پتەویان لە ئێوە وەرگرتووە.

[2] – کۆڵەگەکانی مارەبڕین تەنها بریتین لە داواکردن و قەبولکردن و ئەوەش بۆچوونی حەنەفییە و ئەوانەیش لەسەر راستن.

## مەرجەکانی بەستنی مارەبڕین:-

١- شایستەیی بەجێگەیاندن.

٢- دەبێت داواکردن و قەبولکردن بە شێوەیەکی راستەقینە[1] یان حوکمی[2] لە یەك دانیشتن بن.

٣- داواکردن و قەبولکردن لەگەڵ یەکتری یەکسان بن.

٤- هەریەك لە داواکار و قەبولکار گوێبیستی یەکتر بن و لە یەکتری تێ بگەن.

٥- هیچ بەربەستێکی مارەبڕین بە شێوەیەکی بنبڕ نەسەلمێندرا بێت[3].

### مەرجەکانی راستی و دروستی مارەبڕین:

مەرجەکانی راستی هەر رەفتارێکی شەرعی.مارەبڕین یان جگە لە مارەبڕین بریتین لەو شتانەی کەوا راستی رەفتارەکەی پێوە بەستراوەتەوە بەجۆرێك ئەگەر یەك مەرج نەهاتەدی رەفتارەکە هەڵوەشاوە و فاسید بێت[4].

### گرنگترین مەرجەکانی راستی و دروستی مارەبڕین:

١- ئامادەبوونی دوو شاهێد کەوا شیاوییان تەواو بێت گوێبیستی قەسەکانی هەریەك لە ژن و پیاوەکە بن و تێبگەن کەوا مەبەست ئەنجامدانی گرێبەستی مارەبڕینە، کەواتە مارەبڕین بەبێ دوو شاهێد ناتەواوە.

---

[1] – ئەگەر مارەبڕین لە نێوان دووکەسی ئامادەبوو لە یەك دانیشتن ئەنجام بدرێت.

[2] – ئەگەر مارەبڕین لە نێوان دووکەسی دوور لەیەکتر ئەنجام بدرێت لەو حالەتە پێویستە دوو شاهێد ئامادەی هەریەك لە داواکردن و قەبولکردن بن چونکە هەردووکیان لە دوو دانیشتنی راستەقینەن و لە دانیشتنی قەبولکردن مارەبڕینەکە دەبەسترێت.

[3] – واتا لە کاروبارە سەرەکییەکانی پەیوەست بە مارەبڕین.

[4] – ئەگەر یەکێك لە کۆڵەگەکانی مارەبڕین یان یەکێك لە مەرجەکانی بەستنی مارەبڕین نەهاتەدی مارەبڕینەکە پووچەڵە و ئەگەر مەرجێکی راست و دروستی نەهاتەدی مارەبڕینەکە فاسیدە – هەڵوەشاوەیە.

٢– مارەبڕینەکە کاتی نەبێت کەواتە گشت مارەبڕینێکی کاتی وەکو (زواج المتعة/ مارەبڕینی کاتی) و (زواج التحليل/ مارە بەجاش)[١].

٣– نەبەسترا بێتەوە بە مەرجێکی ناتەواو و فاسید وەکو مارەبڕینی ژن و بە ژنە (زواج الشغار[٢]).

٤– پیاوەکە یان ئافرەتەکە یان وەلییەکە لە ئیحرامی حەج دانەبێت[٣].

٥– دەستەواژەی مارەبڕین جێبەجێکراو بێت و نەدرابێتە پاڵ داهاتوو.

**مەرجەکانی بەکاربوونی مارەبڕین:**

مەرجی بەکاربوون بریتیە لەو مەرجەی کەوا بەکاربوونی مارەبڕینی پێیەوە بەندە بەجۆرێك کەوا شوێنەوارە شەرعییەکانی لە رووی ماف و پابەندبوونەکان لێ بکەوێتەوە کەواتە ئەگەر یەکێك لە مەرجەکانی مارەبڕین نەهاتەدی مارەبڕینەکە لەسەر مۆڵەتی ئەو کەسە دەوەستێك کەوا مافی مۆڵەتدانی هەیە.

---

[١] – بریتیە لە مارەکردنی ئەو ئافرەتەی سێ بە سێ تەلاق دراوە لە کەسێك بۆ ئەوەی لەگەڵی جووت بێت تاکو بکرێت بە گرێبەستێکی نوێ بۆ مێردی یەکەم مارە بگەڕێندرێتەوە، و ئەو رێگایە هەڵەیە و لەگەڵ حیکمەتی فەرموودەی خودای گەورە ناگونجێت کە دەفەرمووێت: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يَتَرَاجَعَا إِن ظَنَّا أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ {البقرة/٢٣٠}.

[٢] – بریتیە لەوەی کەوا پیاوێك خوشکەکەی یان کچەکەی لە یەکێك مارە بکات بە مەرجێك ئەویش خوشکی یان کچەکەی لە ئەو مارە بکات.

[٣] – لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) کە دەفەرمووێت: (ئەوەی لە ئیحرام دابێت نابێت مارە بکرێت و نابێت کەسیش مارە بکات).

### گرنگترین مەرجەکان:

١- لایەنەکان شیاوییان تەواو بێت واتا گەیشتبنە تەمەنی بیرکردنەوە (سن الرشد) کەواتــە مــارەبڕینی ئــەو کەســەی شــیاوی تــەواو نییــە بەســتراوەتەوە بــە مۆڵــەتی وەلییەکەی.

٢- مارەکردنی کچی پێگەیشتووە و عاقیـڵ و ڕەشـید لەلایـەن وەلییەکـەی بـەبێ مۆڵەتی کچەکە و ئەگەر کچەکە مۆڵەتی نەدا مارەبڕینەکە بە نەبوو دادەنرێت.

### مەرجەکانی پابەندبوون:

بریتین لەو مەرجانەی ئەگەر هاتنەدی هەریەك لە لایەنەکان بۆی نییە بەبێ پاسـاو گرێبەستەکە هەڵبوەشێنێتەوە.

### لە گرنگترین ئەو مەرجانە:

١- هەریەك لە ژن و مێردەکە هیچ عەیبێکی لەو جۆرەیان نەبێت کەوا پێویست بە جیابوونەوەی دادوەری بکات.

٢- یەکێك لە ژن و مێردەکە بە هۆی منـداڵی یـان شـێتی شـیاوی ناتـەواو نـەبێت چونکە مارەبڕینی کچی یان کوڕی منداڵ یان شێت بـە مۆڵـەتی وەلی و دادوەر لەگـەڵ بــوونی بەرژەوەنــدی شــەرعی راســت و دروســتە و شــوێنەوارە شــەرعییەکانی لــێ دەکەوێتەوە بەڵام لە کاتی بلوغ بوون یان بە خۆهاتنەوە لـە شـێتی ئـەو کەسـەی لـە کاتی مارەبڕین شیاوی تەواو نەبووە بۆی هەیە مارەبڕینەکەی هەڵبوەشێنێتەوە.

٣- ئەگەر مارەبڕین بەبێ مۆڵەتی وەلی لەگەڵ کەسێکی ناهاوشان ئەنجام درابێـت وەلی بـۆی هەیـە دوای ئاگـاداربوونی بـەو کـارە داوا لـە دادوەر بکـات مارەبڕینەکـە هەڵبوەشێنێتەوە.

### ئەو ئافرەتانەی مارەبڕینیان قەدەغەیە:

ئــەو ئافرەتانــەی مارەبڕینیــان قەدەغەیــە دوو بەشــن ئەوانــەی بــۆ هەمیشــە مارەبڕینیان قەدەغەیە و ئەوانەی بۆ ماوەیەکی کاتی مارەبڕینیان قەدەغەیە:

**بەشی یەکەم: ئەوانەی بۆ هەمیشە مارەبڕینیان قەدەغەیە:**

**بریتین لە سێ جۆر:**

١- ئەوانەی بە هۆی رەچەڵەك مارەبڕینیان قەدەغەیە:- پیاو ئافرەتانی نەوەی خۆی یان نەوەی نەوەکانی لێ حەرامن وەکو کچەکانی و کچەکانی کچەکانی و کچەکانی کوڕەکانی چەند بەرەوە خوارەوە بێت.

ئافرەتانی بنەچەی خۆی یان بنەچەی بنەچەکانی چەند بەرەو سەرەوە بێت وەکو دایك و داپیر.

نەوەکانی دایك و باوکی و نەوەکانی نەوەکانی ئەوانە وەکو خوشك و کچەکانی خوشك و کچەکانی برا چەند بەرەو خوارەوە بێت.

نەوەکانی باپیر و داپیرەکان وەکو (پلك و خاڵەت).

٢- ئەوانەی بە هۆی ژنوژنخوازی مارەبڕینیان قەدەغەیە: بۆ نموونە نەوەکانی خێزان و بنەچەکانی ئافرەت مارەبڕییان لە پیاو حەرمە و خێزانەکانی بنەچەکانی خۆشی لێ حەرامەن وەکو خێزەکانی باوکی و باپیری چەند بەرەو سەرەوە بێت، و خێزانەکانی نەوەکانی وەکو خێزەکانی کوڕ و کوڕی کوڕ چەند بەرەو خوارەوە بێت.

٣- ئەوانەی بە هۆی شیردان مارەبڕینیان قەدەغەیە:- پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (ئەوانەی بە هۆی رەچەڵەك حەڕام بن بە هۆی شیردانیش حەڕامن).

بەڵام ئەوە بە شێوەیەکی گشتی نییە بەڵکو حەڕام بوونەکە تەنها شیرخۆر دەگرێتەوە کوڕ بێت یان کچ بەجۆرێك کە دەبێتە یەکێك لە منداڵەکانی خێزانی شیردەرەکە لە رووی حەڕامی وەکو منداڵی رەچەڵەك وایە و برا و خوشکەکانی شیرخۆر ناگرێتەوە کەواتە مارەبڕین لە نێوان برا و خوشکەکانی شیرخۆر و منداڵەکانی شیردەر دروستە.

**بەشی دووەم: ئەو ئافرەتانەی بۆ ماوەیەکی کاتی مارەبڕینییان قەدەغەیە:**

و بریتیە لە پێنج جۆر:

١- هاوسەری یەکێکی تر و ئەو ئافرەتەی لە عیدەی یەکێکی تر دایە.

٢- ئەو ئافرەتەی بە شێوەی سێ بە سێ تەلاق دراوە و بۆ ئەو پیاوە نییە مارەی بکاتەوە کەوا تەلاقی داوە تاکو بە شێوەیەکی ئاسایی لە کەسێکی تر مارەنەبڕێت نەك بە شێوەی مارەبەجاش چونکە مارەبەجاش پووچەڵە لەبەرئەوەی بە مەرج دانراوە دوای جووتبوون تەلاقی بداتەوە هەرچەندە ئەو مەرجە شاراوە بێت چونکە مارەبڕینێکی کاتییە و لەبەرئەوەی ئافرەتەکە رازی نییە ئەو پیاوەی بە شێوەی کاتی مارەی کردووە بە درێژایی ژیان ببێتە هاوسەری.

سەرەڕای ئەوە پێویستە مێردی نوێ لەگەڵی جووت بێت و دواتر تەلاقی بدات و دواتر عیدەی لەو مێردە کۆتایی بێت[1].

٣- کۆکردنەوەی دوو ئافرەتی مەحرەم وەکو مارەبڕینی دوو خوشك و مارەبڕینی ئافرەتێك و پووری یان خاڵەتی، کەواتە ئەو مارەبڕینە حەلال نییە تاکو لە ئافرەتی یەکەم جیا نەبێتەوە و عیددەشی تەواو نەبێت.

٤- مارەبڕینی ژنی پێنجەم لە کاتی بوونی چوار ئافرەت بەڵام ئەگەر یەکێکی تەلاقدا بۆی هەیە ئافرەتێکی تر مارەببڕێت.

مارەیی (المهر): یەکێك لە شتەکانی پەیوەست بە مارەبڕین بریتیە لە مارەیی و بریتیە لە دیارییەکی نموونەیی لەلایەن پیاو بە ئافرەت دەدرێت وەکو خاڵێکی سەرەتایی یەکتر ناسین و دەستپێکی ژیانی هاوبەش کەواتە مارەیی نە کۆڵەگە و نە

---

[1] - خودای گەورە فەرموویەتی ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ {البقرة/٢٣٠}﴾ واتا ئەگەر بۆ جاری سێیەم تەلاقیدا چونکە لە ئایەتی پێشوو فەرموویەتی ﴿الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ {البقرة/٢٢٩}﴾ و خودای گەورە فەرموویەتی ﴿أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ بریتیە لە تەلاقدان بۆ جاری سێیەم.

مەرجی مارەبڕینە چونکە خودای گەورە فەرموویەتی ﴿لاَّ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاء مَا لَمْ تَمَسُّوهُنُّ أَوْ تَفْرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةً ...﴾البقرة/٢٣٦. واتا: هیچ گوناهتان ناگاتێ ئەگەر ئافرەت تەلاق بدەن ئەگەر نەچووبنە لایان یان مارەییتان بۆ دیاری نەکرد بێت.

ئەگەر پیاو پێش جووتبوون ئافرەتی تەلاقدا مارییەکە دەبێتە نیوە و نیوەی بۆ پیاوەکە دەگەڕێتەوە بەڵام جیابوونەوە بە هۆی مردن یان پاش جووتبوون ئافرەتەکە گشت مارەیی بۆ هەیە.

**مارەیی هاوشێوە (مهر المثل):**

ئەگەر لە مارەبڕین مارەیی باس نەکرابوو یان مارەیی باسکراو شتێکی بایەخدار نەبێت وەکو مادده هۆشبەرەکان یان مارەیی نادیار بوو یان شتێکی زەوتکراو بوو مارەیی هاوشێوە بە ئافرەتەکە.

**شوێنەوارەکانی مارەبڕین:**

یەکێك لە شوێنەوارەکانی بریتیە لە بژێوی (النفقة) بۆ نموونە تەنها بە مارەبڕین بژێوی ئافرەتەکە لەسەر پیاو پێویستە هەرچەندە ئافرەتەکە دەوڵەمەند بێت.

یەکێکی تر لە شوێنەوارەکانی بریتیە لەوەی کەوا هەر یەکەیان تەنها بە مارەبڕین میرات لە یەکتری دەگرن هەرچەندە جووت نەبووبن (واتا نەگوازرا بێتەوە).

# باسی دووەم:
# جیابوونەوە – بەردان – و
# ئەو شتانەی پەیوەستن بە جیابوونەوە
# الطلاق و مایتعلق به

بریتیە لە لابردنی کۆت و بەندی مارەبڕین لەلایەن پیاوەکە یان ئافرەتەکە ئەگەر دەسەڵاتی ئەو کارەی پێدرا بێت یان لەلایەن دادوەر بە جیابوونەوەی دادوەری دوای داواکردنی یەکێك لە ژن و مێردەکە و سەلماندنی هۆکارەکانی جیابوونەوە.

ئەگەر دەرکەوت ئافرەت لە ژیانی هاوسەری زیانی ماددی یان مەعنەوی پێدەکەوێت بەجۆرێك کەوا عادەتەن ئەستەم بێت بەرگەی بگرێت بۆی هەیە داوای جیابوونەوە بکات.

پیاوی شەرخۆش و شێت و کەم عەقڵ و زۆرلێکراو و ئەو کەسەی بە هۆی توڕەیی یان بەڵای کت و پڕ یان پیری یان نەخۆشی هێزی جیاکردنەوەی باش و خراپ لە یەکتری لەدەستداوە تەلاقی ناکەوێت، و تەلاقی مەرجدار یان تەلاق بۆ داهاتوو ناکەوێت، و هەروەها تەلاق بە دەستەواژەی سوێند ناکەوێت.

## جۆرەکانی تەلاق:

تەلاقدا دوو بەشە:

١- تەلاقی گەڕاندنەوە (الطلاق الرجعي): بریتیە لە هەر تەلاقێك کەوا دوای جووتبوون (گواستنەوە) روودەدات بە مەرجێك بۆ جاری یەکەم یان دووەم بێت و لە بەرامبەر شتێك نە بێت و بە جیابوونەوەی دادوەری نەبێت.

حوکمی ئەو تەلاقە: دروستە پێش کۆتایی هاتنی عیددە ژیانی هاوسەری دەسپێبکەنەوە بەبێ گرێبەستی نوێ.

٢- تەلاقی کۆتایی (طلاق البائن): بریتیە لە هەر تەلاقێك پێش جووتبوون یان تەلاقدان بۆ جاری سێیەم یان لە بەرامبەر شتێك یان بە رێگەی جیابوونەوەی دادوەری.

حوکمی ئەو تەلاقە: ئەگەر تەلاقی بائینی بچووك بێت دروستە بە گرێبەستێکی نوێ ژیانی هاوسەری دەستپێ بکاتەوە چونکە خودای گەورە فەرموویەتی ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُواْ إِصْلاَحًا﴾البقرة/٢٢٨. واتا: پیاوەکانیان شایستەترن بە گەڕاندنەوەیان ئەگەر مەبەستیان ئاشتبوونەوە بێت.

ئەگەر تەلاقی بائینی گەورە بێت بۆ نموونە ئەگەر تەلاقی جاری سێیەم بێت بۆی نییە مارەی بکاتەوە تاکو پیاوێکی تر مارەی نەکات و لەگەڵی جووت نەبێت و بە تەلاق یان بە مردن لە یەکتری جیانەبنەوە.

## شوێنەوارەکانی تەلاق:

١- ئافرەت بۆی هەیە دوای کۆتایی هاتنی عیدەکەی گرێبەستی هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکی تر ئەنجام بدات.

٢- ئەگەر گشت مارییەکە یان بەشێکی پاشەکی بوو پێویستە پێی بدرێت.

٣- لە ماوەی عیددە بژێوی لەسەر پیاوەکەی پێویستە.

٤- بۆی هەیە داوای کرێی شیردانی یان دایەنگەیی منداڵەکەی بکات.

## بەشەکانی عیددە[1]:

**أ- عیدەی ئافرەتی تەلاقدراو بەوجۆرەی خوارەوە بەسەر دەچێت:**

١- بە دانانی سك ئەگەر سکپڕ بێت و جیابوونەوەکە بە مردن نەبووبێت.

٢- بە بینینی سێ خاوێنی ئەگەر لەو ئافرەتانە بێت کەوا سووری مانگانە دەبینن.

٣- بە سێ مانگ ئەگەر نەگەیشت بێتە تەمەنی سووری مانگانە یان گەورە بێت واتا بچووك بێت و نەگەیشت بێتە تەمەنی سووری مانگانە یان گەورە بێت و گەیشت بێتە تەمەنی نەبینینی سووری مانگانە یان لە بنەڕەتدا خاوێن و بێنوێژی نەبینێت.

**ب- عیددەی ئەو ئافرەتەی مێردی مردووە بەوجۆرەی خوارەوە بەسەر دەچێت:**

١- بە تێپەڕبوونی چوار مانگ و دە ڕۆژ لە بەرواری مردن ئەگەر ئافرەتەکە سك پڕ نەبێت.

٢- ئەگەر سکپڕ بوو بە دوورترین ماوە بەسەر دەچێت واتا بە چوار مانگ و دە ڕۆژ یان دانانی کۆرپە کامیان دوورتر بوون ئەوەیان هەژمار دەکرێت.

**شیردان (الرضاع):**

پێویستە لەسەر دایکی منداڵ شیر بە منداڵەکەی بدات ئەگەر عوزرێکی مەشروعی نەبێت چونکە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ﴾ (البقرة/٢٣٣) واتا: دایکەکان دوو

---

[1] - خودای گەورە فەرموویەتی ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَاثَةَ قُرُوءٍ﴾البقرة/٢٢٨ ، و دەفەرمووێت ﴿وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِن نِّسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ وَأُولَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ الطلاق/٤ ، و دەفەرمووێت ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾ البقرة/٢٣٤.

سالّی تەواو شیر بە منداڵەكانیان دەدەن بۆ هەر كەسێك كە بیەوێت شیردانەكە تەواو بكات.

## داینگەیی (الحضانة):

بریتیە لە پاراستن و پەروەردەكردنی ئەو كەسەی لە كاروباری خۆی سەربەخۆ نەبێت بەو جۆرەی لەبەرژەوەندی ئەو كەسە دابێت و دایك لە پێشترە بۆ داینگەیی و پەروەردەكردنی منداڵەكەی ئەگەر منداڵەكە زیانی پێ نەگات و پێویستە ئەو ئافرەتەی داینگەیی دەكات بالیغ و عاقیلّ و ئەمین بێت و توانای پەروەردەكردنی منداڵەكەی هەبێت، و بژێوی و خەرجی ئەو ئافرەتە لەسەر ئەو كەسە پێویستە كەوا بژێوی منداڵەكەی لەسەر پێویستە.

## وەسیەت (الوصیة):

بریتیە لە دەستكاریكردنی میرات دوای مردن و بریتیە لە بوونە بە خاوەنی ئەو شتە بەبێ بەرامبەر.

بە مەرج دانراوە وەسیەتكارەكە شیاوی بەخشین بێت و خاوەنی ئەو شتە بێت كەوا وەسیەتی كردووە و مەرجە خودی وەسیەت بۆ كراوەكە لە بووندا بێت و بكوژی وەسیەتكارەكە نەبێت و گوناهبار نەبێت، و مەرجە ئەو شتەی وەسیەتكراوە سامانێكی نرخدار بێت و شیاوی مامەڵە پێكردن بێت.

## میرات:

بریتیە لەو شتەی كەوا میراتگر لە دوای میرات لێگراوی بۆی دەمێنێتەوە دوای دەرهێنانی مافەكانی پەیوەست بە میرات بەپێی ئەو ریزبەندییەی خوارەوە:

١- خەرجییەكانی گواستنەوەی مردوو بۆ لانەی كۆتایی.

٢- قەرزەكان ئەگەر قەرزی لەسەر بێت.

٣- جێبەجێکردنی وەسیەت ئەگەر هەبێت.

٤- پاشماوەکە بۆ میراتگرانی بە ڕێگەی خزمایەتی و هاوسەرێتی راستەقینە دەمێنێتەوە.

هۆکارەکانی میرات دوو هۆکارن: خزمایەتی و هاوسەرێتی راستەقینە.

کۆڵەگەکانی میرات سێ کۆڵەگەن:

١- میرات لێگیراو (مردوو).

٢- میرات (تریکە).

٣- میراتگر بریتیە لەو کەسەی هۆکاری میراتی تیادا هاتۆتەجێ.

مەرجەکانی میرات چوار مەرجن:

١- مردنی میراتلێگراو.

٢- زیندووبوونی میراتگر لە دوای مردنی میرات لێگیراو.

٣- بوونی هۆکار (خزمایەتی یان هاوسەرێتی).

٤- نەبوونی یەکێك لە بەربەستەکانی میرات.

ئەو بەربەستانەی میرات کەوا زانایان لەسەریان کۆکن:

١- کوشتن: بکوژ میرات لە کوژراوەکەی ناگرێت چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (بکوژ میرات ناگرێت).

٢- جیاوازی ئاین: بۆ نموونە مسولمان میرات لە نامسولمان ناگرێت و نامسولمان میرات لە مسولمان ناگرێت چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (ئەهلی دوو میللەت میرات لە یەکتری ناگرن).

# وانەی هەشتەم

# تاوان و سزاکان

**الجرائم و العقوبات**

تاوان: یان بریتیە لە کردەوەیەکی قەدەغەکراو یان ئەنجام نەدانی ئەرکێك بەبێ عوزی شەرعی و یەکەمیان بریتیە لە تاوانی ئیجابی واتا ئەنجامدان و دووەمیان بریتیە لە تاوانی سلبی واتا بەجێنەگەیاندن و کۆڵەگەی ماددی ئەو تاوانە بریتیە لە ئەنجام نەدانی ئەرکێك بەبێ پاساو، و کوشتن و دزی و زەوتکردن و دەست پیسی و زینا و هاوکاریکردن لەسەر تاوان و دوژمنکاری ... تاوانی ئیجابین، و وازهێنان لە نوێژ و رۆژوو و زەکات و هاوکارینەکردن لەسەر چاکە و پارێزگاری و بەجێهێشتنی کەسی نقوومبوو لە ئاو یان هەر کارێکی لەو جۆرە بریتین لە تاوانی سلبی.

سزاکان: کوشتن و، بڕین و، جەلد و، بەندکردن یان حەبسکردن و شاربەدەرکردن (دوورخستنەوە) یان کەفارەت.

زانایانی شەریعەت تاوانەکانیان لە ڕووی مەترسیداری و دیاریکردنی یان دیاری نەکردنی سزاکەیان کردۆتە سێ بەشی سەرەکی و لە سێ باس باسییان دەکەین.

# باسی یەکەم:
# ئەو تاوانانەی سزاکانیان دیاریکراوە

### جرائم الحدود

بریتین لە تاوانەکانی دەستدرێژیکردنە سەر بەرژەوەندییە پێویستەکانی ژیانی مرۆڤ وەکو ئاین و ژیان و سامان و ناموس و عەقڵ، لەبەر مەترسیداری ئەو تاوانانە بە دەق بە تاوان دانراون و سزاکەشیان بە دەق دیاریکراوە و لەبەرئەوە پێیان دەگوترێت تاوانە سزا دیاریکراوەکان، و وەکو تاوانی دزی و زینا و بوختان و هەڵگەڕانەوە و بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان و داوێنپیسی.

### تاوانی دزی:

بریتیە لە: هەڵگرتنی بڕێك سامانی گوێزەرەوەی کەسێکی تر بەنهێنی لەلایەن کەسێکی عاقیڵ و بالیغ و ئازاد لەو سامانەی دانراوە بۆ پاراستن و لەو سامانەی بەخێرایی لە ناوناچێت و لە شوێنی پاراستنی سامانی لەو جۆرە دانرا بێت و گومانی حەلالی تیادا نەبێت[1].

بەپێی ئەو پێناسەیە پێویستە دزی ئەو چەند رەگەزەی خوارەوەی تیادا بێت:

١- دەبێت دزەکە بالیغ و عاقیڵ بێت کەواتە سزای دەست بڕین ناکام ناگرێتەوە.

٢- دەبێت سامانە دزراوەکە بڕێك بێت کە بە لایەنی کەم بە قەد دە دیرهەمی زیو

---

[1] – شرح فتح القدير ٥/٣٥٤ و بڕی سامانەکەی بە دە دیرهەم دیاریکردووە و دیرهەم دراوێکی کۆنە و لە زیو دروستکراوە.

یان نیو دیناری زێڕ بێت یان له هەر سەردەمێك له بەرامبەر ئەوە بێت کەواتـه کـەمتر لەوە سزای دەست بڕین نایگرێتەوە.

٣- دەبێت لەو سامانە بێت کەوا بە خێرایی تێك ناچێت کەواتە سزای بڕین دزینـی میوەجات و بەرهەمەکانی شیر و هەر شتێکی لەو جۆرە ناگرێتەوە.

٤- دەبێت سامان بایەخدار بێت (المال المتقوم[1]) کەواتـه سـزای دەسـت بـڕین دزینی مەیی و هەر شتێکی لەو جۆرە ناگرێتەوە.

٥- دەبێت لە شوێنی پاراستنی سامانی لەو جۆرە دانرا بێت واتـا ئـەو شـوێنەی کەوا عادەتەن سامانی وەکو سامانی دزرایی لیّ دەپارێزرێت کەواتە سزای بڕین دزینی ئەو سامانە ناگرێتەوە کەوا لە شوێنی پاراستنی سامانی لەو جۆرە دانەنراوە.

٦- دەبێت سامانەکە موڵکی کەسێکی تر بێت کەواتە بڕین ئەو کەسـە ناگرێتـەوە کەوا گومانی وابووە ئەو سامانەی بردوویەتی سامانی کەسێکی ترە و دواتر دەرکـەوت هی خۆیەتی.

٧- دەبێت دزەکە ناچار نەبوویێت تاوانی دزی ئەنجام بدات.

٨- دەبێت مەبەستی تاوانکاری بێت.

٩- دەبێت گومانی حەلالی تیادا نەبێت کەواتـه بۆچـوونی زۆربـەی زانایـان سـزای بڕین دزیکردن لە نێوان باوان و نەوەکان و نێوان ژن و مێرد و نێوان هاوبەشەکان ..... ناگرێتەوە.

ئەگەر ئەو مەرجانە هاتنەدی و بە شاهێد یان بە دانپێدانان سەلمێندرا ئـەو سـزایە لەسەر دز پیادە دەکرێت کەوا ئایەتە پیرۆزە دیاریکراو کە خودای گەورە فەرموویەتی ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾المائدة/٣٨. واتا دەستی پیاوی دز و ئافرەتی دز ببڕن وەکو سـزایەك بـۆ ئـەو کارەی ئەنجامیان داوە و وەکو ترسێك لەلایەن خـودای گـەورە و پـەنـد و وانەیـەك بـۆ

---

[1] – بریتیە لە هەر سامانێك کەوا لە رووی شەریعەتی ئیسلامی بایەخی هەبێت.

کەسانی تر..

## تاوانی زینا:

خــودای گــەورە فەرموویــەتی ﴿وَلاَ تَقْرَبُــواْ الزِّنَــى إِنَّــهُ كَــانَ فَاحِشَــةً وَسَــاء سَبِيلاً﴾الإسراء/٣٢. واتا نزیکی زینا نەبنەوە چونکە بە راستی زینا تاوانێکی ناشیرینە و ڕێگایەکی خراپە.

### کۆڵەگەکانی تاوانی زینا:

١- کردەوەی ماددی (جووتبوون): بریتیە لـەوەی پیـاو ئەنـدامی نێرینـەی خـۆی بخاتە ناو ئەندامی مێینەی ئافرەتێکی حەڕام لە ئەو بەبێ گرێبەستی مارەبڕین و دڵنیا بێت لەوەی ئافرەتەکە هاوسەری ئەو نییە.

٢- زیناکەر و زینا لەگەڵ کرلو: و مەرجە هەردووکیان:

أ- بلوغ و عەقڵ.

ب- سەریەخۆیی و ئازادی.

ج- بە هیچ ڕێگایەك گومانی نەبێت.

٣- مەبەستی تاوانکاری: ئەگەر پیاوەکە کردەوەکەی ئەنجام دابێت و زانی بێتـی کەوا لەگەڵ ئافرەتێك جووت دەبێت کـەوا لێـی حەڕامـە یـان ئەگـەر ئافرەتێـك خـۆی ئامادە کردبێت و بزانێت کەوا ئەو کەسەی لەگەڵی جووت دەبێت لێی حەڕامە لەو دوو حاڵەتە مەبەستی تاوانکاری دەهێتەدی، کەواتە ئەگەر یەکێکیان کردەوەکەی ئـەنجام دابێت و نەیزانێت کەوا حەڕامە حەددی لەسەر نییە.

### بەڵگەکانی سەلماندنی تاوانی زینا:

بە مەبەسـتی پاراسـتنی ئـابڕووی خانـەوادە و داپۆشـینی ئەنجامـدەری تاوانەکـە شەریعەت توندە لە سەلماندنی تـاوانی زینـا کەواتـە تـەنها بـە چـوار شـاهێد یـان بـە دانپێدانانی تاوانباری بالیغ و عاقیڵ و سەریەخۆ چوار جار لەبەردەم دادگا نـەبێت ئـەو

تاوانه ناسه‌لمێندرێت.

سزای تاوانی زینا:

أ- زیناکه‌ری بێ ژن و زینا له‌گه‌ڵ کراوی بێ مێرد سزاکه‌ی بریتیه له لێدانی سه‌د قامچی.

ب- سزای زیناکه‌ری به ژن و زینا له‌گه‌ڵ کراوی به مێرد به بۆچوونی هه‌ندێك له زانایانی فیقهی بریتیه له له‌ناوبردن به به‌ردبارانکردن و به بۆچوونی هه‌ندێکی تر به‌ردبارنکردن لابراوه چونکه یه‌که‌م به فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌رﷺ سه‌لمێندراوه و دووه‌م به قورئانی پیرۆز سه‌لمێندراوه و ئێمه‌ش ئه‌وه په‌سه‌ند ده‌که‌ین.

## تاوانی بوختان:

خودای گه‌وره فه‌رموویه‌تی ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ، إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾النور/٤و٥. واتا: ئه‌و که‌سانه‌ی که‌وا بوخاتان به ئافره‌ته داوێن پاکه‌کان ده‌که‌ن و دواتر چوار شاهێد ناهێنن هه‌شتا قامچییان لێ بده‌ن و هه‌رگیز شاهێدییان لێ وه‌رنه‌گرن و ئه‌وانه یاخی بوون، ته‌نها ئه‌و که‌سانه نه‌بێت که‌وا دوای ته‌مبێکردنیان په‌شیمان بوونه‌ته‌وه و چاك بوونه چونکه بێ گومان خودای گه‌وره لێخۆش بوو و به به‌زییه.

بوختان له زاراوه‌ی شه‌رعی بریتیه له زینا دانه‌پاڵ که‌سێکی تر به‌بێ ئه‌وه‌ی بتوانێت به چوار شاهێد یان به دانپێدانانی بوختان پێکراو بسه‌لمێنێت.

کۆڵه‌که‌کانی تاوانی بوختان:

١- کرده‌وه‌ی ماددی بریتیه له تاوانبارکردن (واتا زینا دانه‌پاڵ یه‌کێکی تر).

٢- بوختانه‌که‌ر بالیغ و عاقیل و ئازاد بێت.

٣- بوختان پێکراو داوێن پاك بێت (پاك بێت له زینا) لـه ژیانـدا بێـت و دیـاریکراو بێت.

٤- مەبەستی تاوانکاری.

ئەو سزایانەی لە ئایەتە پیرۆزەکەدا هاتوون سێ سزان و بریتین له:

١- هەشتا قامچی.

٢- وەرنەگرتنی شاهێدی.

٣- دانانی بە یاخی بوو و فاسیق و دەرچوو لە ئاین.

## تاوانی هەڵگەڕانەوە:

خودای گەورە فەرموویەتی ﴿.... وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾البقرة/٢١٧. واتا: هەر یەکێك لە ئێوە لـە ئاینەکـەی هەڵگەڕێتـەوە و بمرێت کافیرە و ئەوانە لە دونیا و لە دواڕۆژ کردەوەکانیان بەتاڵە و ئەوانە ئەهلی ئاگرن و بۆ هەمیشە تیایدا دەمێننەوە.

**هەڵگـەڕاوە**: بریتیـە لـەو مسـولمانەی لـە ئاینەکـەی هەڵگەڕاوەتـەوە کەواتـە هەڵگەڕانـەوە تـەنها مسـولمانان دەگرێتـەوە و ئـەو کەسـە نامسـولمانەی ئاینەکـەی دەگۆڕێت بە هەڵگەڕاوە دانانرێت.

زانایانی فیقهی ئیسلامی لەبـەر دوو هۆکـار خـوێنی کەسـی هەڵگەڕاوەیان حـەلال کـردووە: یەکـەمیان: ئـەو کەسـە بـە ئیسـلام پـارێزراوە و ئەگـەر هەڵگەڕایـەوە ئـەو پارێزگارییـە لادەچێت و خـوێنی حـەلال دەبێـت. دووەمیـان: سـزای هەڵگـەڕاوە لـە شـەریعەتی ئیسـلامی بریتیـە لـە کوشـتن نـەك تـەمبێکردن چـونکە پێغەمبـەرﷺ فەرموویەتی (خوێنی مرۆڤی مسولمان حەلال نییە تەنها لە یەکێك لـەو سـێ حالەتانـە نەبێت: کافربوونی دوای باوەڕهێنان، و زیناکردن دوای ژن هێنـان، کوشـتنی کەسـێك بەبێ ئەوەی یەکێکی کوشـت بێـت) و لەبەرئـەوەی پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: (هـەر

کەسێك ئاینەکەی گۆڕی بێت بیکوژن). واتا هەر کەسێك ئاینەکەی گۆڕی بێت و لە دژی ئیسلام کار بکات و تاکو بۆ ماوەی سێ ڕۆژ داوای تەوبەکردن و گەڕانەوە بۆ لای ئیسلامی لێ نەکرێت ناکوژرێت بەڵام سزای دونیایی لە قورئان نەهاتووە.

## تاوانی بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان:

خودای گەورە فەرموویەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ، إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾المائدة/٩٠و ٩١. واتا: ئەی باوەڕداران بەڕاستی مەیی و قومار و گۆشتی سەربڕاو بۆ بت و سەنەمەکان و بورج هەڵدان پیسن و لە کاری شەیتانن و خۆیان لێبپارێزن بە ئومێدی ئەوەی سەرکەون و بەڕاستی شەیتان دەیەوێت بە هۆی مەیی و قومار دوژمنکاری و رق و قینە بخاتە نێوانتان و لە یادی خودا و نوێژکردن لاتان بدات ئایا ئێوە وازناهێنن لەو کارە؟.

ئەو دەقە بە شێوەیەکی بنبڕ بەڵگەیە لەسەر قەدەغەکردنی بەکارهێنانی گشت جۆرەکانی مادده هۆشبەرەکان لەبەر ئەو چەند رووەی خوارەوە:

١– دانانی ماددی هۆشبەر لە ریزی مەیی و قومار و بت و بورج[1].

٢– بە (رجس)ی داناوە چونکە ریجس پاك نابێتە بە پێچەوانەی (نجس)[2].

٣– بە کارەکانی شەیتانی داناوە.

٤– فەرمانکردن بە خۆپاراستن لێیان فەرمانێکە و پابەندبوون پێیەوە پێویستە.

---

[1] - (بریتیە لەو رەمزانەی کەوا خەڵکی نەفامی سوێندیان پێ دەخوارد)

[2] – لەبەرئەوەی لە زمانی کوردی وشەی ﴿الرجس و النجس﴾ واتای پیس دەگەیەنن بەڵام لە زمانی عەرەبی دوو جۆرە پیسی جیاوازن بۆیە لەو برگەیە وەکو خۆی بە عەرەبی نووسیومانەتەوە/ وەرگێر.

٥- بوونی بە سەرچاوەی خراپەکاری و دوژمنایەتی و رق و قینە بە هۆی ئەو قسە ناڕێکانەی بە سەر زمانی کەسی سەرخۆش دادێن.

٦- بوونی بە هۆکاری لادانی مرۆڤ لە یادی خودا و هەستکردنی بە بەرپرسیارییەتی.

٧- فەرمانکردن بە کۆتایی پێهێنان و دەستهەڵگرتن لێی بە شێوەیەکی پێویست[1].

**سزای سەرخۆش:** ئەگەر سەرخۆش بالیغ و عاقیل و سەربەخۆ بێت و بزانێت سەرخۆشی حەرامە و تاوانەکە لەبەردەم دادگا بە شاهێدی یان دانپێدانان یان ڕێگاکانی تر سەلمێندرا تاوانبار سزا دەدرێت بە لێدانی چل قامچی و پێشەوا (سەرۆکی دەوڵەت) بۆی هەیە چل قامچی تری بۆ زیاد بکات بە مەبەستی تەمبێکردنی تاوانبار[2].

---

[1] - بگەڕێوە بۆ کتێبەکەی پێمە (المسؤولية الجنائية في الشريعة الاسلامية ل٣١ و لاپەڕەکانی دواتر.)

[2] - المهذب لابي اسحاق ابراهيم بن علي الشيرازي ٢/٣٨٦ و لاپەڕەکانی دواتر.

# باسی دووەم:
# تاوانەکانی قیصاص[1] و خوێنبایی

## جرائم القصاص و الدية

خودای گەورە فەرموویەتی ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالحَقِّ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَانًا فَلاَ يُسْرِف فِّي الْقَتْلِ إِنَّهُ كَانَ مَنْصُورًا﴾الإسراء/٣٣.
واتا: ئەو کەسە مەکوژن کەوا خودای گەورە کوشتنی قەدەغە کردووە تەنها بە هۆی مافێك نەبێت و ئەو کەسەی بە ستەم کوژراوە ئەوا ئێمە دەسەڵاتمان بە خزمی نزیکی ئەو داوە تاکو تۆڵەی بسەنێتەوە کەواتە با زیادەڕەوی نەکات لە کوشتنەوە و بەڕاستی ئەو لەلایەن دەسەڵاتی ڕەوا پشتیوانی دەکرێت.

تاوانەکانی قیصاص و خوێنبایی بریتین لە تاوانەکانی دەستدرێژیکردنە سەر گیان و جگە لە گیان و بریتین لە تاوانەکانی کوشتن و بریندارکردن و لێدان، و لە حاڵەتی بە ئەنقەست و دوژمنایەتی قیصاص پێویستە، و لە حاڵەتی لێبوردن لە قیصاص یان بوونی بەربەستێکی شەرعی، و لە حاڵەتەکانی کوشتنی نیمچە ئەنقەست و کوشتنی بە هەڵە، و لە حاڵەتی لە ناوبردنی ئەندامێکی مرۆڤ یان بریندارکردنی بە هەڵە خوێنبایی پێویستە.

[1] – القصاص/ واتا تاوانبار چ تاوانێکی ئەنجامداوە بە هەمان شێوە تۆڵەی لێبکرێتەوە.

## کۆڵەگەکانی کوشتن:

کوشتن بریتیە لە لەدەستدانی گیانی مرۆڤ بە ڕێگەی کردەوەی کەسێك و بەوجۆرە کۆڵەگەکانی کوشتن سێ کۆڵەگەن:

١- بوونی مرۆڤێکی زیندوو و ئەو مرۆڤە گیانی لەدەست دابێت.

٢- ئەنجامدانی کردەوەیەك لە لایەن تاوانبار.

٣- بوونی پەیوەندی هۆکارییەتی لە نێوان ئەو کردەوەیەی دراوەتە پاڵ تاوانبار و نێوان ئەو مردنەی لە ئەنجامی ئەو کردەوەیە ڕوویداوە.

## جۆرەکانی کوشتن:

جمهوری زانایان کوشتنیان کردۆتە سێ جۆر:

**جۆری یەکەم: کوشتنی بە ئەنقەست:** ئەگەر ئەو ڕەگەزانەی خوارەوەی تیادا بێت بە کوشتنی بە ئەنقەست دادەنرێت:

أ- بکوژ کردەوەیەك ئەنجام بدات کە ببێتە مایەی مردنی تاوانلێکراو.

ب- تاوانبار مەبەستی دەرەنجامی کردەوەکە بێت کە بریتیە لە مردن.

ج- ئەو ئامرازەی لە جێبەجێکردنی تاوانەکە بەکارهێنراوە بە زۆری ئامرازێکی بکوژ بێت.

د- دەبێت پەیوەندی هۆکارییەتی لە نێوان کردەوەکە و مردن هەبێت و ئەگەر ئەو ڕەگەزانە هاتنەدی و تاوانەکە لەبەردەم دادگا سەلمێندرا بڕیاری قیصاصی لەسەر دەدرێت و پێش جێبەجێکردنی سزاکە ڕای میراتگران و خاوەن خوێن وەردەگیرێت چونکە خودای گەورە وەلی تاوانلێکراوی سەرپشك کردووە لە نێوان سێ ڕێگا کە دەفەرمووێت ﴿....وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَانًا...﴾الإسراء/٣٣. واتا ئەو کەسەی بە ستەم کوژراوە ئەوا ئێمە دەسەڵاتمان داوە بە وەلییەکەی تاکو تۆڵەی بۆ

بسەنێتەوە، واتا بۆی هەیە داوای جێبەجێکردنی قیصاص بکات یان لە قیصاص خۆش بێت و خوێن وەربگرێت یان دەست لە هەردوو مافەکە هەلگرێت.

چونکە هۆکاری دانانی قیصاص بریتیە لە سارێژکردنی برینی دلی وەلییەکان و میراتگرانی تاوانلێکراو و پاراستنی ژیانی کەسانی بێتاوان هەروەکو خودای گەورە فەرموویەتی ﴿وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الأَلْبَابِ ....﴾البقرة/١٧٩. واتا پەیڕەوکردنی سزای قیصاص بۆ ئێوە هۆکاری ژیانە.

ئەو هۆکارە لە حالەتی وەرگرتنی رای میراتگران دەربارەی جێبەجێکردنی سزا دەهێتەدی.

**جۆری دووەم: کوشتنی نیمچە ئەنقەست (قتل شبه العمد) (یان ئەو لێدانەی دەبێتە مایەی مردن):** ئەگەر ئەو رەگەزانەی خوارەوەی تیادا بێت بە کوشتنی نیمچە ئەنقەست دادەنرێت:

١- تاوانبار کردەوەیەك ئەنجام بدات و ببێتە هۆی مردنی تاوانلێکراو ئەو کردەوەیە لێدان بێت یان بریندارکردن یان هەر ئازاردانێکی تر.

٢- تاوانبار بە ئەنقەست کردەوەیەکی ماددی ئەنجام بدات و ببێتە هۆی مردن.

٣-.مەبەستی دەرەنجامەکە (واتا کوشتن) نەبێت. ئەو رەگەزە پێوەری جیاوازیکردنە لە نێوان کوشتنی بە ئەنقەست و کوشتنی نیمچە بە ئەنقەست و دادوەر ئەو رەگەزە لە بارودۆخەکانی کێشەکە و شاهێدی شاهێدەکان و ئامرازی بەکارهێنراو لە ئەنجامدانی تاوانەکە وەردەگرێت.

٤- بوونی پەیوەندی هۆکارییەتی لە نێوان کردەوەی تاوانبار و مردنی تاوانلێکراو و ئەگەر ئەو رەگەزانە هاتنەدی دوو سزا پێویست دەبێت.

أ- خوێنبایی (الدية): بریتیە لە قەرەبووکردنەوە و لە سامانی تاوانبار دەدرێت نەك لە سامانی خانەوادەکەی چونکە تاوانبار مەبەستی تاوانکاری بووە.

ب- كەفارەت: بریتیە لە ئازادکردنی مرۆڤێکی کۆیلە، و ئەگەر دەست نەکەوت دوو مانگ لە دوای یەك بە ڕۆژوو دەبێت، و ئەگەر نەیتوانی خواردنی شەست هەژار دەدات.

**جۆری سێیەم: کوشتنی بە هەڵە: ئەگەر ئەو ڕەگەزانەی تیادا بێت بە کوشتنی بە هەڵە دادەنرێت:**

١- تاوانبار کردەوەیەك ئەنجام بدات و ببێتە هۆی مردنی تاوانلێکراو.

٢- تاوانبار لە کردەوەکە یان لە مەبەستەکە هەڵە بکات.

أ- هەڵە لە کردەوە وەکو ئەوەی مەبەستی ئەنجامدانی کردەوەیەکی ڕەوا بێت و ببێتە هۆی دەرەنجامێکی ناڕەوا بۆ نموونە ئەگەر مەبەستی پاککردنەوەی چەکەکەی بێت و گوللەیەکی لێ دەرچوو‌بێت و بە سینگی تاوانلێکراو کەوت بێت و تاوانبار ئاگاداری ئەو گوللەیە نەبووبێت.

ب- هەڵەکردن لە مەبەست بۆ نموونە مەبەستی کەسی دەستدرێژیکار بێت و کەسێکی بێتاوان بپێکێت و ئاگاداری ڕاستی شتەکە و کەسە نەبێت.

٣- پەیوەندی هۆکارییەتی لە نێوان کردەوەکە و مردنەکە هەبێت و ئەگەر ئەو ڕەگەزانە هاتنەدی کەفارەت لەسەر تاوانبار پێویستە و خوێنبایی (قەرەبووکردنەوە) لەسەر هۆزی تاوانبار یان سەندیکاکەی یان دەزگاکەی پێویستە و نهێنی پێویستکردنی خوێنبایی لەسەر هۆزی تاوانبار ئەوەیەوە کەوا ئیسلام پێی وایە دادپەوەری نییە بارگرانی بخرێتە سەر ئەو بکوژەی بە هەڵە تاوانەکەی ئەنجام دەدات و بە هەمان شێوەی مرۆڤی بەرپرسیاری تەواو لەو تاوانە بەرپرسیار بێت و لەبەرئەوەی ئەو تاوانبارە لە ڕووی دەروونی سزا دەدرێت و هیچ سزایەکی تری ماددی بۆ زیاد ناکرێت[١].

---

[١] - بڕوانە المغني لابن قدامة (عبدالله بن احمد المقدسي) ٧/٦٣٥ و دواتر شرح الخرشي للامام حمد الخرشي المالكي على مختصر الخليل لامام ابي ضياء سيدي خليل ٨/٣/ و دواتر "المهذب لابي ←

# باسی سێیەم:
# ئەو تاوانانەی سزایان دیاری نەکراوە

## جرائم التعاذير

**تاوانی سزا دیاری نەکراو:**

بریتیە لەو تاوانەی کەوا سزاکەی بە دەقی قورئان و فەرموودە دیاری نەکراوە بەڵکو کاری دیاریکردن و خەملاندنی ئەو سزایە دراوە بە فەرمانڕەوا (سەرۆکی دەوڵەت) بە هاوکاری لەگەڵ ئەهلی راوێژ و لە ژێر تیشکی خواستەکانی بەرژەوەندییە گشتییەکان و قەبارەی تاوانەکە و مەترسی تاوانبار سزاکە دیاری دەکات.

بەوپێیە دەتوانین بڵێین: زۆربەی تاوانەکانی یاسای سزاکانی عیراقی و جگە لەوە لەو تاوانانەی بەشی سێیەمن.

ئەو تاوانانەی سزایان دیاری نەکراوە لە رووی بنچینە دەکرێنە سێ جۆر:

١- **جۆری یەکەم:** هەر تاوانێك لە تاوانەکانی سزا دیاری کراو و تاوانەکانی قیصاص ئەگەر یەکێك لە مەرجەکانی جێبەجێکردنی سزای دیاری کراو بۆی نەهات بێتەدی یان گومانی تیادا بێت بە شێوەیەکی سروشتی دەبێتە تاوانی تەعزیر و دەسەڵاتی یاسادانانی سەردەم سزاکەی دیاری دەکات.

---

اسحاق الشيرازي الشافعي ٢/١٧٣ و دواتر. الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية للشهيد السعيد زين الدين الجبعي العاملي ٣٩٦٢ و دواتر المحلي لابن حزم الظاهري ابي محمد بن احمد ١٠/٣٤٢ و دواتر.

بۆ نموونە: تاوانی زینا بـە چـوار شـاهێد دەسـەلمێندرێت کەواتـە ئەگـەر بـە سـێ شاهێد-یان بە دوو شاهێد سەلمێندرا دەبێتە تاوانی تەعزیری تاوانبار بـە حەبسـکردن سزا دەدرێت و هەروەها تاوانی دزی لە نێوان بـاوان و نـەوەکان و نێـوان ژن و مێـرد و نێـوان هاوبەشـەکان گومـانی تیادایـە بۆیـە تاوانەکـە دەبێتـە تـەعزیری و دزەکـە بـە حەبسکردن سزا دەدرێت لە جیاتی دەست برین.

٢- **جۆری دووەم:** هەر تاوانێك بە دەقی قوریان یان فەرموودە بە تاوان دانرا بێـت بەڵام سزاکەی بە دەق دیاری نەکرا بێت بە تاوانێکی تەعزیری دادەنرێت و دەسـەڵاتی یاسادانانی سەردەم سزاکەی دیاری دەکات.

گرنگرتین ئەو تاوانانە، تاوانی سیخوڕی کەوا لە دەقی فەرموودەی خودای گـەورە هاتووە ﴿ولاتجسسوا﴾ الحجرات/١٢. واتا: سیخوڕی مەکـەن، و تـاوانی شـاهێدی درۆ کەوا لە دەقی فـەرموودەی خـودای گـەورە هـاتووە ﴿فَـاجْتَنِبُوا الـرِّجْسَ مِنَ الْأَوْثَـانِ وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ﴾الحج/٣٠. واتـا: خۆتـان لـە پیسـی بـت و سـەنەمەکان بپـارێزن و خۆتان لە قەسەی درۆ بپارێزن، و تاوانی فێڵکردن لە پێوان و کێشـان کـەوا لـە دەقـی فەرموودەی خودای گەورە هـاتووە ﴿وَيْـلٌ لِّلْمُطَفِّفِـينَ ، الَّـذِينَ إِذَا اكْتَـالُواْ عَلَـى النَّـاسِ يَسْتَوْفُونَ، وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ﴾المطففين/١و٢و٣. واتا: هاوار بـۆ ئەوانـەی لە کێشان و پێوان فێل دەکەن و ئەوانەی کاتێك شتێك لە خـەڵکی دەکـڕن بـە زیـادە وەری دەگـرن و ئەگـەر شـتێکیان بـۆ بپێـون یـان بکێشـن فێـڵ دەکـەن، و تـاوانی زەوتکردن و تاڵانکردن و لێسەندن کەوا لە دەقی فەرموودەی خودای گـەورە هـاتووە ﴿وَلاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُم بَيْنَكُم بِالْبَاطِلِ ....﴾البقرة/١٨٨. واتا: سـامانی یـەکتر بـە نـاڕەوا مەخۆن، و تاوانی بەرتیل کەوا لە دەقی فەرموودەی پێغەمبـەرﷺ هـاتووە (نـەفرەتی خودا لە بەرتیل خۆر و بەرتیل وەرگر[1]).

---

[1] - سبل السلام/١٦٤/٤.

جگە لەوە گشت ئەو تاوانانەی لە دەقی قورئانی پیرۆز یان فەرموودەی پێغەمبەرﷺ هاتوون و دیاریکردنی سزاکەیان دراوەتە دەست فەرمانڕەوا کەوا بە هاوکاری لەگەڵ ئەهلی راوێژ و پرس و را سزاکەیان دیاری بکات.

٣- **جۆری سێیەم:** تاوانە نوێیەکان بریتین لەو تاوانانەی کەوا هیچ دەقێك نییە لە سەر بە تاوانکردنیان و دانانی سزا بۆیان بەڵکو فەرمانڕەوا بە هاوکاری لەگەڵ ئەهلی راوێژ هەڵدەستێت بە داهێنانی ئەو تاوانە و بریتین لەو کردەوانەی کەوا لەلایەنی رەوشتی یان ئابووری یان تەندروستی یان لە هەرلایەنێکی تر زیانی بۆ بەرژەوەندییە گشتییەکان هەبێت بۆ نموونە تاوانی تیرۆرستی و تاوانی سەرپێچیکردنی سیستەمی هاتووچۆ و ئەو جۆرە تاوانەی سێیەم جێگیر نییە بەڵکو بەپێی گۆڕان و پێشکەوتنی ژیان دەگۆڕێت.

# وانەی نۆیەم

## ئەو پەیوەندییانەی کەوا یاسای گشتیان لەسەر پیادە دەکرێت

## العلاقات التي تخضع لقانون العام

پێشتر گوتمان فیقهی ئیسلامی چارەسەری ئەو پەیوەندییانەی کردووە بەڵام بەشی ئەو پەیوەندییانە لە پەیوەندییەکانی تر وەکو پەیوەندییە داراییەکان و باری کەسی و خواپەرستییەکان کەمتر بووە بە هۆی سروشتی سیستەمی ئەو فەرمانڕەوایەتییەی لە کۆماری و پرس و ڕاوێژەوە بوو بە سیستەمی میراتگری و تاکەکەسی.

لەگەڵ ئەوە چەند دەقێکی قورئانی پیرۆز هەن کەوا ئاماژە بە بنەما گشتییەکان و بنچینە گشتگیرەکان دەکەن کەوا موجتەهید دەتوانێت لە هەر سەردەمێك ڕێسا و ئەحکامەکانی ئەو پەیوەندییانەیان لێ وەربگرێت بە تایبەتی پەیوەندییە دەستوورییەکان و نێودەوڵەتییەکان و سەرەڕای ئەوە هەندێك لە زانایانی فیقهی مسولمان لە ئەحکامەکانی ڕێکخستنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان داهێنانیان کردووە لە ژێر ناونیشانی (السیر – بەڕێوەبردن) بۆ نموونە وەکو (محمد کوڕی حسن شیبانی) گەورەترین یاوەری ئەبو حەنیفەیە کەوا ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبووە لە بڵاوکردنەوەی ئەو مەزهەبە و لە گشت زانایانی سەدەی دووەم بەرهەمی زیاتری

هەبووە و دوایین کتێبی داناوە بە ناوی (السیر الکبیر) و ئەحکامەکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی نێوان دەوڵەتی ئیسلامی و تەواوی وڵاتان لە هەردوو حاڵەتی جەنگ و ئاشتی لە خۆدەگرێت و باس لە ئەهلی ئاشتی و ئەهلی جەنگ لە هاوبەشدانەرەکان دەکات و باس لە ئەحکامەکانی دیلەکانی هەردوولا دەکات یەکسانە دیلەکان پیاو بن یان ئافرەت منداڵ بن یان گەورە، و باس لە ئەحکامەکانی گشت جۆرەکانی ئاسایش و ئاسایشی ئەو شاندانە دەکات کەوا لە خانەی جەنگ بەرەو خانەی ئیسلام دەێن و باس لە پارێزەیی (حصانە)ی ئەو شاندانەش دەکات، و باس لە دەستکەوتەکانی جەنگ و ئەحاکامەکانی ئاشتبوونەوە و هاوپەیمانێتی و ئەحکامەکانی ئەو زەوییانە دەکات کەوا ئەهلی جەنگ لە جەنگ و ئەهلی ئیسلام لە جەنگ دەستییان بەسەرداگرتووە و باس لە پەیماننامەکان و تاوانەکانی جەنگ دەکات، لەگەڵ سەدان پرسی پەیوەست بە ئەهلی جەنگ و نوێژکردن بۆ مسولمانان لە هەردوو حاڵەتی جەنگ و ئاشتی.

لە گشت ئەو مەسالانە شەیبانی پشتی بە قورئانی پیرۆز یان ئەو فەرموودانە بەستووە کەوا دەبارەی جەنگەکانی پێغەمبەرﷺ گێڕدراونەتەوە لەسەر شوێنەواری ئەو رووداوانەی روویانداوە، و لەسەر ئەو ئەحکامانەی لە کاتی جەنگ و فەتحەکانی مسولمانان روویانداوە و هەروەها لە زۆربەی حاڵەتەکان قیاسی بەکارهێناوە.

لێرەدا پێگەی ئەو کتێبە لەلایەنی یاسای نێودەوڵەتی ئیسلامی دەردەکەوێت و (هاورن رەشید) کاتێك ئەو کتێبەی بینیوە پێی سەرسام بووە و بە یەکێك لە شانازییەکانی داناوە.

لە ماوەی دەوڵەتی عوسمانی زیاتر گرنگی پێدراوە بۆیە لە سەردەمی (سولتان محمود خان) وەرگێراوەتە سەر زمانی تورکی و بووتە بنچینەی ئەحکامەکانی جەنگاوەرانی عوسمانی لە جەنگەکانیان ئەگەڵ دەوڵەتە ئەورووپییەکان، و هەروەها زۆر خەڵکی گرنگی پێداوە و راڤەیانکردووە، و گرنگترین راڤەکانی ئەو کتێبە بریتین لە (شرح السرخسي و الجمال الحصري).

(شـەیبانی) لـە دانـانی کتێـب دەربـارەی کاروبارەکـانی پەیوەسـت بـە یاسـای نێودەوڵـەتی پـێش (غروسیوسـی هولەنـدنی ١٥٨٣ – ١٦٤٥ م) کـەوتووە کـەوا لـە سەدەی حەڤدەهەم ژیاوە و بە باوکی یاسای نێودەوڵەتی ناوزەندکراوە چونکە چەند ئەحکامێکی تایبەت بەو یاسایەی باسکردووە.

ئەوانـەی گرنگییـان بـە یاسـای نێودەوڵـەتی داوە لـە دانـانی بنچـینە و ڕێسـاکانی یاسای نێودەوڵەتی لەلایەن پیاوانی یاسا بە سەدان ساڵ گرنگییان بە ڕۆڵـی شـەیبانی داوە، و لە (غـوتنجن) لـە ئـەلمانیا (کۆمەڵـەی شـەیبانی بـۆ مافـە نێودەوڵەتییـەکان) دامەزرا و لە زانایانی یاسای نێودەوڵەتی وڵاتانی جیهانی پێکهات بوو[1].

یەکێکی تر لەو گەورە زانایانـەی فیقهـی ئیسـلامی کـەوا چارەسـەری پەیوەندییـە نێودەوڵەتییـەکانی لـە هـەردوو حالـەتی ئاشـتی و جـەنگ کـردووە بریتیـە لـە ئیمـامی (ئـەوزاعی ٨٨–١٥٧ك) و کتێبێکـی هەیـە بـە نـاوی (کتـاب السـیر الاوزاعـی) و ئەحکامەکانی جەنگ و هەر شتێکی پەیوەست بەو ئەحکامانە لەخۆدەگرێت[2].

باسەکەمان دەربارەی ئەحکامـەکانی یاسـای گشـتی بەسـەر پێـنج بـاس دابـەش دەکەین و لە یەکەمیان باس لە ئەحکامەکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان دەکەین و لە دووەمیان باس لە ئەحکامـە دەسـتورییەکان دەکـەین، و لـە سـێیەمییان بـاس لـە ئەحکامــە داراییــە گشــتییەکان دەکــەین، و لــە چــوارەمییان بــاس لــە ئەحکامــە کارگێڕییـەکان دەکـەین، و لـە پێنجـەمیان و کۆتـایی بـاس لـە ئەحکامـەکانی دادگـا دەکەین.

---

[1] – بگەڕێوە بۆ (شرح کتاب السیر لمحمد بن الحسن الشیبانی املاء محمد بن احمد السرخسي، لێکۆلینەوەی (د. صلاح الدین المنجد) ١٩٥٨،١ب، ل١١ و دواتر.

[2] – محاسن السماعي في مناقب الامام عمرو الاوزاعي تحقیق الامیر شکیب ارسلان، و د. عبدالله الجبوری، چ/ رشاد، ب١، ل٧٧.

## باسی یەکەم:
## بنچینەکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان

## أسس العلاقات الدولية

لە ئیسلامدا پەیوەندییەکانی نێوان میللەتان و نەتەوەکان لەسەر ئەو شەش بنچینەی خوارەوە دادەمەزرێن:

بنچینەی یەکەم: گشت مرۆڤەکان لە یەك رەچەڵەکن چونکە لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز هاتووە کەوا گشت تاکەکانی خانەوادەی مرۆڤایەتی خوشك و بران و لە یەك باوك و یەك دایکن و سروشتی برایەتی بریتیە لە یەکسانی لە هەڵسوکەوت و ئەرکەکان و هاوشانی بۆ بەسەربردنی ژیانێکی خۆش لەسەر هەسارەی زەوی بە مەبەستی وەبەرهێنانی خێروبێرەکانی ئەو هەسارەیە بەبێ جیاوازی لە رووی پۆست و فەرمانبەرێتی و پێگەی سیاسی یان کۆمەڵایەتی یان کارگێری بەڵکو گەورایەتی تەنها بۆ ئەو کەسەیە کەوا نزیکترە لە خودا و بۆ خەڵکی بە سوودترە چونکە خودای گەورە فەرموویەتی ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾الحجرات/١٣. واتا ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لە نێر و مێ دروست کردووە و ئێوەمان کردۆتە چەند میللەت و چەند تیرە بۆ ئەوەی یەکتر بناسن و بەرێزترینتان لەلای خودای گەورە پارێزگارترینتانە.

بنچینەی دووەم: گشت خەڵکی لە یەك کانزان و لە دەقی زۆر لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز هاتووە کەوا ئەو کانزایەی مرۆڤی لێ دروستکراوە بریتیە لە خۆڵ (گڵ)

و خۆڵ بریتیە لەو پێکهاتەی کەوا گشت دروستکراوێکی زیندوو بە سەریدا دەڕوات بۆیە پێویستە لەسەر ئەوەی لە خۆڵ دروستکراوە وەکو خۆڵ ملکەچ و لەخۆبوردە بێت.

شایەنی باسە گشت تاکێکی مرۆڤ لە دوو ڕەگەز پێك دێت ڕەگەزی ئاوی پیاو و ڕەگەزی هێلکۆکەی ئافرەت و ئەو دوو ڕەگەزە لە چەند ماددەیەکی خواردەمەنی پێکدێن کەوا لە خۆڵ دروست دەبێت کەواتە گشت مرۆڤێك لە کانزای خۆڵ دروستکراوە هەروەکو خودای گەورە فەرموویەتی ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ﴾الروم/٢٠. واتا: یەکێك لە نیشانەکانی گەورەی خودا ئەوەیە کەوا ئێوەی لە خۆڵ دروستکردووە و دواتر بوونەتە مرۆڤ و بە زەویدا بڵاوبوونەتەوە.

پێغەمبەرﷺ لە حەجیماڵئاوایی جەختی لەسەر ئەو دوو ڕەگەزە کردۆتەوە و فەرموویەتی (هەمووتان لە ئادەمن و ئادەمیش لە خۆڵە و کەسی عەرەب لە کەسی جگە لە عەرەب گەورەتر نییە و کەسی سپی پێست لە ڕەش پێست گەورەتر نییە تەنها بە خواپەرستی نەبێت).

بنچینەی سێیەم: دروستکاری گشت مرۆڤێك یەکە چونکە دروستکار و بەدی هێنەری گشت مرۆڤێك یەکە و بریتیە لە خودای گەورە کەواتە مرۆڤ وەکو کاڵاکانی بازاڕ نییە کەوا هەندێکیان لە یابان دروستکرابن و لەو کاڵایانە بە نرختر بن کەوا لە چین دروستکراون مادام دروستکار دروستکراوەکان لە چاکە و خراپە لە یەك پلەن و خودای گەورە فەرموویەتی ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ ...﴾البقرة/٢١. واتا ئەی خەڵکینە ئەو خودایە بپەرستن کەوا ئێوە و ئەوانەی پێش ئێوەشی دروستکردووە.

بنچینەی چوارەم: یەکبوونی بەرژەوەندییە هاوبەشەکان بۆ نموونە گشت پەیامە ئاسمانییەکان بۆ هێنانەدی بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ هاتوون لە پێش هەموویان پەیامی پێغەمبەرمان (ﷺ) و خودای گەورە ڕوو لە پێغەمبەرەکەی محمد (ﷺ) دەکات و دەفەرموێت: ﴿وما ارسلناك الا رحمة للعالمين﴾ ڕەحمەت بریتیە لە بەرژەوەندی

ئیجابی (سوودی بەدەستهاتوو) و سلبی (خراپەی دوورخراوە) یەکسانە بەرژەوەندی ماددی بێت یان بەرژەوەندی مەعنەوی و دونیایی بێت یان دوارۆژی و گشت ئەو دروستکراوانەی لەناو زەویدان گیاندارین یان بێ گیان بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ دروستکراون و گشت خێروبێرەکانی زەوی لە نێوان گشت خەڵکی هاوبەشن هەروەکو خودای گەورە فەرموویەتی ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً...﴾البقرة/٢٩. واتا: خودا ئەو خودایە کەوا گشت ئەو شتەی لەناو زەویدایە بۆ ئێوەی دروستکردووە، کەواتە گشت مرۆڤێك بۆی هەیە بەپێی پێویستی بەشی خۆی لە خێروبێری زەوی و ئاسمان وەرگبرێت بە مەرجێك زیادەڕەوی نەکاتە سەر بەشی یەکێکی تر.

بنچینەی پێنجەم: یەکبوونی چارەنووس چونکە چارەنووسی گشت مرۆڤێك بریتیە لە مردن بەبێ جیاوازی لە نێوان بەهێز و بێ هێز هەروەك خودای گەورە فەرموویەتی ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ....﴾آل عمران/١٨٥. واتا گشت گیانلەبەرێك تامی مردن دەچێژێت و لە ڕۆژی دوایی پاداشتی کردەوەکانیان بە چاك و خراپە وەردەگرن، و فەرموویەتی ﴿أَيْنَمَا تَكُونُواْ يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ .....﴾النساء/٧٨. واتا: لە هەر جێگایەك بن مردن دەتانگاتێ هەرچەدەن لە ناو تەلاری پتە و بە هێزدابن.

بنچینەی شەشەم: یەکبوونی بەرپرسیارییەتی: سەرەڕای ئەوەی باسمانکرد یەکێکی تر بریتیە لە نەبوونی حەسانە بۆ هیچ مرۆڤێك لە هەر پێگەیەك بێت کەواتە لە ئیسلامدا پۆست یان فەرمانبەرێتی مافێك و پێگەیەك نییە کەوا بە هۆیەوە لە کەسانی تر جیاواز بێت، بەڵکو بریتیە لە ئەرك و بەرپرسیارییەتی، چونکە ئەو پۆستەی هەر بەرپرسێك داگیری دەکات تەنها بۆ خزمەتی کەسانی ترە.

لە صەحیحی موسلیم هاتووە[1] (ئەبی زەڕ (ﷺ) دەڵێت: گوتم ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئایا دامنامەزرێنی لە جێگایەك و دەستی لەسەر شانی مندا و

---

[1] – صحيح مسلم ٣/١٤٥٧.

فەرموویەتی: ئەی ئەبا زەڕ تۆ لاوازی فەرمانبەرێتی ئەمانەتە و لە ڕۆژی دوایی دەبێتە شەرمەزاری و پەشیمانی تەنها ئەو کەسە نەبێت کەوا مافی خۆی پێدەدات و ئەو ئەرکەی لەسەر شانییەتی بەجێیی دەگەیەنێت).

ئەو فەرموودە پیرۆزە بنەمایەکی گەورەیە بۆ خۆپاراستن لە پۆست و فەرمانێتی بە تایبەتی ئەو کەسانەی لاوازن لە بەجێگەیاندنی ئەرکانی ئەو پۆستانە لەبەر نەشیاوی و ناشایستەییان بۆ ئەو پۆستانە.

## باسی دووەم:
## ئەحکامەکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان

## أحكام العلاقات الدولية

هەروەکو باسمانکردن ئیسلام فەرمان دەکات کەوا ئەو پەیوەندییانە لەسەر بنچینەی برایەتی مرۆڤایەتی و بنچینەی ئاشتی و خۆشەویستی و هاوکاری و هاوبەرپرسیارییەتی دابمەزرێن.

ئیسلام فەرمان دەکات بە پابەندبوون بە ئاشتی و پەنانەبردن بۆ بەکارهێنانی هێز تەنها لە حالەتەکانی پێویست نەبێت و خودای گەورە دەفەرموێت ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ ادْخُلُواْ فِي السِّلْمِ كَآفَّةً وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾البقرة/٢٠٨. واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە گشتتان وەرنە ناو ئاشتی و شوێن هەنگاوەکانی شەیتان نەکەون چونکە بە ڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئێوە.

پەنابردن بۆ بەکارهێنانی هێز و جەنگ لە حالەتی پێویست پێی دەگوترێت تێکۆشان و قورئانی پیرۆز ئەو ئامانج و خواستانەی دیاری کردووە کەوا تێکۆشان لە

پێناویانـدا پێویسـتە لەوانـە بـەرگریکردن لـە بیروبـاوەڕ هـەروەکو خـودای گـەورە فەرموویەتی ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَالَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُواْ أَوْلِيَاء الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا﴾النساء/٧٦. واتـا: ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لە پێناوی خودا دەجەنگن و ئەوانەی بێ باوەڕن لـە پێنـاوی ستەمکارەکان دەجەنگن بۆیە جەنگ لەگەڵ دۆستانی شەیتان بکەن بەڕاسـتی فێڵـی شەیتان لاوازە.

یەکێکی تر لەو حالەتانە: بەرەنگاربوونەوەی فیتنە و ئاشـووب و لابردنـی فیتنـە و خودای گەورە فەرموویەتی ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ .... ﴾البقرة/١٩٣. واتـا: لەگـەڵ کارفرەکـان بجـەنگن تـاکو فیتنـە نـەمێنێت و یـەکێکی تـر لـەو حالەتانـە بەرگریکردنی شەرعی لە گیـان و جگـە لـە گیـان وەکـو نـامووس و سـامان و خـودای گـەورە فەرموویـەتی ﴿..فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾البقرة/١٩٤. واتا هەر کەسێك دەستدرێژی کردە سەر ئێوە ئێوەش بە هـەمان شێوە بەرپەچی بدنەوە.

## ئەو بنەمایانەی ئیسلام کەوا ڕەوایەتی جەنگ سنووردار دەکەن:

ئیسلام چەند بنەمایەکی مرۆڤایەتی داناوە و داوایکردووە لە کـاتی جـەنگ ڕەچـاو بکرێن لەوانە:

١- پابەندبوون بە بەڵێننامە و پەیماننامەکان و قەدەغەکردنی پـەیمان شـکاندن و ناپاکی بە ئاشکرا و بە نهێنی.

٢- ڕێزگرتن لە مرۆڤایەتی و بانگەشەکردنی بۆ برایەتی گشتی جا لایەنی بەرامبەر هەر میللەتێك بێت.

٣- دانانی چاکەکاری و ڕەوشـت بـە بنچینەی پەیوەندییـە نێودەوڵەتییـەکان لـە کاتی جەنگ و ئاشتی بە شێوەیەکی یەکسان.

٤- بەزەیی هاتنەوە لە حاڵەتەکانی داواکردنی بەزەیی و لێبوردن لە کاتی بە توانایی.

٥- دادپەروەری بە شێوەیەکی گشتی و زیادەڕەوی نەکردن لە سنووری پێویست بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتن یان پەنابردن بۆ گفتوگۆ و ئاشتی.

## راسپاردەکانی جەنگ:

کۆمەڵێك راسپاردە هەیە و پێویستە لەسەر تێکۆشەرانی مسولمان پێیانەوە پابەند بن و لە قورئانی پیرۆز و فەرمووده هاتوون و ئەوانەی کەوا خەلیفەکانی راشیدین ئاماژەیان پێکردوون لەوانە:

أ- زیادەڕەوی نەکردن لە سنووری ڕێگەپێدراو و خودای گەورە فەرموویەتی ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ واتا: هەر کەسێك دەستدرێژی کردە سەر ئێوە ئێوەش بە هەمان شێوە بەرپەچی بدنەوە و لە خودای گەورە بترسن و بزانن کەوا خودای گەورە لەگەڵ ئەو کەسانە دایە کە لێی دەترسن.

ب- پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (ستەم و غەدر مەکەن و منداڵ مەکوژن ... و هەندێك پیاو دەبینن کەوا وازییان لە خەڵکی هێناوە و رووبەڕوویان نەبنەوە .... و ئافرەت و کۆرپە و پیرەمێرد و پیرەژن مەکوژن و دارخورما نەسوتێنن، و درەخت دەرنەهێنن و هیچ ماڵێك نەڕووخێنن).

ج- جێنشینی یەکەم ئەبو بەکرﷺ فەرموویەتی (ناپاکی و ستەم نەکەن و منداڵ و پیر و ئافرەت مەکوژن و دارخورما و نەبڕن و نەیسووتێنن، و داری بەرهەمدار نەبڕن، و هیچ مەڕ و بزن و جێڵ و وشترێك نەکوژنەوە).

د- عومەری کوڕی خەتتابﷺ فەرموویەتی (من فەرمان بە تۆ[1] و بە جەنگاوەرانی

---

[1] - قسە لەگەڵ یەکێك لە سەرکردەکانی سوپا دەکات.

لەگەڵ تۆ دەکەم کەوا لە گشت حاڵەتێك لە خودا بترسن چونکە بە ڕاستی لە خودا ترسان باشترین چەکە بەرامبەر بە دوژمن و بە هێزترین فێڵە لە جەنگەدا و فەرمانتان پێ دەکەم کەوا زۆر خۆتان لە تاوان بپارێزن نەك لە دوژمن چونکە تاوانی سوپا لە دوژمن مەترسیدارترە، و مسولمانان بە تەنها بە تاوانی دوژمن سەر دەکەون و ئەگەر وانەبێت ئێمە لەوان بە هێزتر نین چونکە ژمارەی ئێمە وەکو ژمارەی ئەوان نییە و کەرەستەی جەنگمان وەکو کەرەستەی ئەوان نییە کەواتە ئەگەر لە تاواندا وەکو ئەوان بین ئەوان لە ئێمە بەهێزتر دەبن).

هـ- عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ فەرموویەتی (نەکەی خوێن ڕێژی بەبێ ئەوەی حەلال بێت و هیچ شتێك لە خوێنڕشتن بە ناڕەوا لە نەهامەتی و نەمانی بەهرە و نیعمەت نزیکتر نییە و دەسەڵاتی خۆت بە خوێنڕشتن بە ناڕەوا بەهێز مەکە چونکە ئەو کارە دەبێتە هۆی نەمانی دەسەڵات نەك بەهێزبوونی دەسەڵات)[1].

## هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ دیلەکانی جەنگ:

قورئانی پیرۆز فەرمانی کردووە بەوەی بە شێوەیەکی باش مامەڵە لەگەڵ دیلەکانی جەنگ بکرێت و سووکایەتیان پێنەکرێت و ئەشکەنجە نەدرێن و نەترسێندرێن و چارەنووسی دیلەکانی دیاریکردووە کە بریتییە لە ئازادکردن بەبێ بەرامبەر یان بە بەرامبەر و بە زۆری لە بەرامبەر دیلێکی تر ئازاد دەکرێن.

خودای گەورە فەرموویەتی ﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنْتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا...﴾محمد/٤. واتا: ئەگەر بە بێباوەڕەکان گەیشتن لە گەردەنیان بدەن تاکو بەسەریاندا زاڵ دەبن و بە دیلییان بگرن ئەو کاتی یان بەبێ بەرامبەر یان بە بەرامبەر ئازادییان بکەن تاکو جەنگەکە تەواو دەبێت.

---

[1] - بۆ زیاتر درێژە بگەڕێوە بۆ کتێبی ئێمە (فلسفة الشریعة).

خودای گەورە دەربارەی کەسانی چاکەکار فەرموویەتی ﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا﴾الإنسان/٨. واتا: ئەو چاکەکارانەی خواردەمەنی بە هەژار و یەتیم و دیلەکان دەدەن هەرچەندە خواردەمەنیان خۆشدەوێت و پێویستییان پێیەتی کەواتە چاکەکارییان پاڵییان پێوە دەنێت بەرەو گیانی لەخۆبوردەیی و ئەو کەسانە لەخۆیان لەپێشتر دادەنێن.

بەوپێیە ئیسلام فەرمان دەکات کەوا بە شێوەیەکی باش هەڵسوکەوت لەگەڵ دیلەکان بکرێت و هەروەها فەرمان دەکات بە ئازادکردنیان و گەڕاندنەوەیان بۆ ناو کەس و کار و وڵاتەکەیان بەبێ بەرامبەر یان لە بەرامبەر شتێکەو ئازادکردن بەبێ بەرامبەر لە پێشتر هاتووە بە مەبەستی هاندان لەسەر ئەوەی کەوا ئازادکردن بەبێ بەرامبەر باشترە.

## ڕاگرتنی جەنگ و پەنابردن بۆ ئاشتی:

قورئانی پیرۆز فەرمانی کردووە بە فەرماندەی سوپای مسولمانان کەوا دەستبەجێ داواکاری دوژمن دەربارەی ڕاگرتنی جەنگ و پەنابردن بۆ ئاشتی قەبول بکات بە مەبەستی چارەسەرکردنی ئەو مەسەلەیەی کەوا جەنگی لە پێناودا هەڵگیرساوە و خودای گەورە فەرموویەتی ﴿وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾الأنفال/٦١. واتا: ئەگەر دوژمن داوای ئاشتیان کرد تۆش ئاشتی قەبول بکە و پشت بە خودا ببەستە.

## دبلۆماسییەتی لە ئیسلامدا:-

سیاسەتکار (دبلۆماسی) بریتیە لەو پەیامبەرەی کەوا چاودێری ئەو هەواڵانە دەکات کەوا بۆی ڕەوانە دەکرێن، و نوێنەر (باڵوێز) بریتیە لە پەیامبەر و ئەو کەسەی ئاشتبوونەوە لە نێوان گەڵ و میللەت دەکات، ئەو دوو دەستەواژەیە بۆ نوێنەری دبلۆماسی بەکارهاتوون و واتای ئاشتبوونەوە و نێوانکار لە وشەی (سفیر) زیاترە و

ئەو دەستەواژەیە لە قورئانی پیرۆز هاتووە (بأیدي سفرة کرام بررة) (سفرة) کۆی سفیرە.

پێغەمبەرﷺ ژمارەیەك پەیامبەر و شاندی ناردن بۆ لای پادشاکانی دراوسێ وەکو (نەجاشی) پادشای حەبەشە و (موقەوقیس) پادشای میسر، و (کیسرا) پادشای فارس، و (هیرەقل) ئیمپراتۆری رۆم، و ئەو پەیامبەرانە چەند نووسراوێکیان هەڵگرت بوو کەوا بە دەستەواژەی (سەلام لەسەر ئەو کەسەی شوێنکەوتەی رێنموونی دەبێت) دەستیان پێکرد بوو و لەو نووسراوانە پێغەمبەرﷺ بانگی کردن بەرەو ئیسلام.

هەروەها پێغەمبەرﷺ پەیامبەری ناردوون بۆ سەرکردەکانی هۆزەکانی عەرەبی لەوانە (مونزری کوڕی ساری) پادشای بەحرەین و (جعفر جلندی) پادشای عەمان و زۆربەی وەڵامەکان لایەن پادشا و سەرکردەکانی هۆزەکان ئەرێنی بوون، و هەروەها خەلیفەکان چەند نووسراو و نێردراوی دبلۆماسی هاوشێوەیان ناردوون لە ماوەی خەلافەتی راشیدین و ئەمەوی و عەباسی.

## پارێزمیی (حەصانە)ی دبلۆماسی:

لە ئیسلامدا نوێنەرانی دبلۆماسی حەصانەیان هەیە لەسەر زمانی پێغەمبەرﷺ بۆ نموونە پێغەمبەرﷺ بە نێردراوی (موسەیلەمەی درۆزەن)ی فەرموو: (چونکە نێردراو ناکوژرێت ئەگەرنا لە گەردەنم دەدای).

یاوەرانی پێغەمبەرﷺ و خەلیفەکانی راشیدین و مسولمانان لە سەردەمانی پێشووی ئیسلامی کاری حەسانەیان پەیرەوکردووە هەروەکو ئەو کاتەی ئێستا[1].

[1] — بۆ زیاتر درێژی بگەرێوە د.صبحي محمصاني، القانون و العلاقات الدولیة في الاسلام / چاپی بەیروت، ل١٣٧ و دواتر.

**پیرۆزی پەیماننامەکان لە ئیسلامدا:**

قورئانی پیرۆز فەرمانی کردووە بە پابەندبوون بەو ئەرکانەی لە پەیماننامەدا هاتوون ئەگەر پەیماننامەکە راست و دروست بێت و مەرجە شەرعییەکانی تیادا بێت و زیان پێگەیاندنی قەدەغەیە ئەگەر لایەنەکەی تری پەیماننامەکە پێشتر پێشێلی نەکردبێت، هەروەکو خودای گەورە فەرموویەتی ﴿وَأَوْفُواْ بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْؤُولاً[1]﴾واتا: پابەندبن بە پەیمان و بە راستی پەیماندان بەرپرسیارییەتییە و فەرموویەتی ﴿وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ اللّهِ إِذَا عَاهَدتُّمْ وَلاَ تَنقُضُواْ الأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ اللّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلاً إِنَّ اللّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ﴾ و قورئانی پیرۆز فەرمانی کردووە بە پابەندبوون بەو ئەرکانەی لە پەیماننامەدا هاتوون، و هەروەکو خودای گەورە فەرموویەتی ﴿إِلاَّ الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْئًا وَلَمْ يُظَاهِرُواْ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّواْ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَى مُدَّتِهِمْ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ[2]﴾ واتا: تەنها ئەو هاوبەشدانەرانە نەبێت کەوا پەیماننتان لەگەڵ بەستوون و دواتر هیچ شتێکیان لە پەیمانەکە کەم نەکردووە و پشتگیری هیچ کەسێکیان نەکرد لە دژی ئێوە ماوەی پەیمانەکەیان لەگەڵ تەواو بکەن و بە راستی خودای گەورە کەسانی پارێزگاری خۆش دەوێت.

**چەند پەیماننامەیەك لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ بەستران لەوانە:-**

**أ-** ئەو پەیماننامەیەی کەوا پێغەمبەرﷺ لە رۆژەکانی یەکەمی کۆچکردنی بۆ شاری مەدینە نووسی و بریتی بوو لە نووسراوێك لە نێوان باوەڕدارەکانی کۆچکردوو لە مەککە و یاریدەدەرانی خەڵکی شاری (یەسریب) لایەنێك و جولەکەکان لایەنی دووەم و بەپێی ئەو پەیماننامەیە جولەکەکان لەسەر ئاین و سامانی خۆیان بوون و چەند مەرجێکی بۆ دانان و چەند ئەرکێکی لەسەر پێویست کردن.

---

[1] - الاسراء/٣٤.

[2] - التوبة/٤.

ئازادی بیروباوەڕ و بیروڕا، و پیرۆزی گیان و ژیان (ئازادی کەسایەتی) و پیرۆزی سامان (پیرۆزی خاوەندارێتی کەسایەتی) جگە لەوە چەند ماف و ئازادییەکی تری بۆ بڕیاردان.

ب- یەکێکی تر لە پەیماننامەکانی پێغەمبەرﷺ بریتی بوو لە ئاشت بوونەوەی حودەیبییە (صلح الحدیبیة) کەوا لە نێوان مسولمانان و هۆزی قورەیشی مەککە بەسترا لە ساڵی شەشەمی کۆچی (٦٢٨ز) و لە پەیماننامەکە رێککەوتبوون لەسەر ئەوەی مسولمانانی مەدینە و هاوپەشدانەرەکانی مەککە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دەستدرێژی نەکەنە سەریەك، هەروەها دانپێدانانێکی فەرمی بوو لەلایەن مەککەییەکان بە دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینە.

لە بنەڕەتدا ماوەی پەیماننامەکە دە ساڵ بوو بەڵام دوای دوو ساڵ کۆتایی هات چونکە قورەشییەکان پەیمانەکەیان شکاند[١].

---

[١] – دەقی ئەو پەیماننامەیە لە سیرەی ئیبن هیشام هەیە، و لە ژیانی محمد لهیکل/ل٢٦٢-٢٢١، و پرۆفیسۆر صبحی محمصانی ئاماژەی پێکردووە سەرچاوەی پێشوو/ل١٤٠.

# باسی دووەم:
# ئەحکامە دەستورییەکان

## الاحکام الدستورية

مەبەست لە ئەحکامە دەستورییەکان کۆمەڵە ڕێسایەکی بنچینەیی گشتییە کەوا سروستی فەرمانڕەوایەتی دەوڵەت دیاری دەکەن و ڕێساکانی فەرمانڕەوایەتی لە دەوڵەت دادەنێن، و چەند گرەنتیەك دادەنێن بۆ مافەکانی تاك و دەسەڵاتی تاکەکان بەسەر مافەکانیانەوە روون دەکەنەوە، و دەسەڵاتە گشتییەکانی دەوڵەت و تایبەتمەندییەکانی ئەو دەسەڵاتانە ڕێکدەخەن.

قورئانی پیرۆز بە مەبەستی ڕەچاوکردنی بەرژەوەندییە باڵاکان لە گشت کاتێك و سەردەمێك سروشتی فەرمانڕەوایەتی دیاری نەکردووە بەڵکو ئەو کارەی بۆ خواست و پێویستییەکانی ژیان بەجێ هێشتووە.

بەڵام جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کەوا پێویستە دەوڵەت لەسەر چوار بنچینەی سەرەکی دابمەزرێت.

### بنچینەی یەکەم: ڕاوێژ و شایستەیی سەرکردە (الشورى و أهلية القائد):

خودای گەورە فەرموویەتی :﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾آل عمران/١٥٩. واتا: بەپێی ڕەحمەتی خودا لەگەڵیان نەرم و نیانبە (ئەی موحەمەد) چونکە ئەگەر لەگەڵیان توند و تیژ و دڵڕەق

بیت ئەوانەی لە دەورت کۆبوونەتەوە پەرت و بڵاو دەبن کەواتە لێیان ببورە و داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە و لەکاروبارەکان راوێژییان پیێ بکە و ئەگەر لەسەر مەسەلەیەك رێککەوتن پشت بە خودا ببەستن چونکە بە ڕاستی خودا ئەو کەسانەی خۆشدەوێت کەوا پشتی پیێ دەبەستن.

ئەو چەند ئەحکامەی خوارەوە لەو ئایەتە وەردەگیرێن:

یەکەم: پێویستە لەسەر سەرکردەی میللەت چاو لە پێشەوامان محمد (ﷺ) بکات و ئەو خەسڵەتانەی سەرکردایەتی لەخۆی بەرجەستە بکات و خودای گەورە فەرموویەتی ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ......﴾الأحزاب/٢١. واتا: بەڕاستی پێغەمبەرﷺ بۆ ئێوە باشترین نموونە و پێشەنگە، بۆیە شوێنی بکەون.

دووەم: رەوشت باش و جگە لەوە هەر خەسڵەتێکی باشی سەرکردە دیاری و رەحمەتی خودایە ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ لِنتَ لَهُمْ....﴾.

سێیەم: (الفظ) بریتیە لە مرۆڤی رەوشت خراپ، بەلاَم (غلیظ القلب) بریتیە لەو مرۆڤەی کەوا هیچ شتێك کاری تیادا ناکات کەواتە ناکرێت مرۆڤ بۆ هیچ کەسێك رەوشت خراپ نەبێت بەلاَم نەرم و نیان نەبێت لەگەڵیان و بەزەیی پێیاندا نەهێتەوە.

کەواتە پێویستە سەرکردە هیچ یەکێك لەو دوو خەسڵەتەی تیادا نەبێت چونکە ئەو دوو خەسڵەتە لەگەڵ ئەرکی کارگێری ناکۆکن.

چوارەم: پێویستە سەرکردە لایەنی لێبوردنی زاڵ بێت چونکە مەبەست لە سزادان بریتیە لە چاکسازی کەواتە مادام تروسکاییەکی ئومێدی چاك بوون هەیە لە رێگەی لێبوردن پێویستە پەنا بۆ سزادان نەبردرێت و خودای گەورە دەربارەی باوەڕداران فەرموویەتی ﴿الَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾آل عمران/١٣٤. باوەڕداران ئەو کەسانەن کەوا لە خۆشی و ناخۆشی دەبەخشن و لە تورەیدا دان بەخۆیاندا دەگرن و لە خەڵکی دەبورن و خودای گەورە کەسانی چاکەکاری خۆش دەوێت.

پێنجەم: ئەو ئایەتە واتای ئەوە دەگەیەنێت کەوا پێغەمبەرمان (محمدﷺ) لە کاتی نەبوونی نیگا فەرمانی پێکراوە ئیجتیهاد بکات و ئیجتیهاد بە وتووێـژ و توێژینـەوە بـە هێز دەبێت بۆیە فەرمانی پێکراوە راوێژ بکات.

شەشـەم: ئەگـەر پێغەمبـەرﷺ بـۆ دوایـن پـەیامی ئاسمـانی هەڵبـژێردرا بێـت و پێویستکرا بێت لەسەری پەنا بۆ راوێژ ببات و هیچ بریارێك تـەنها بـە بۆچـوونی خـۆی دەرنەکات ئەوا لەسەر سەرکردەکانی تری میللەت پێویستترە هـیچ بریارێـك تـەنها بـە بۆچوونی خۆیان دەرنەکەن[١].

حەوتەم: ئەگەر بە راوێژ رایەك پەسەندکرا پێویستە نییـە تـەنها پشـت بـەو رایـە ببەسـترێت بـەڵکو پێویسـتە بـە هـەمان شـێوە پشـت بـە خـودا و یاریمـەتی خـودا ببەسترێت.

هەشتەم: پشت بەستن واتای ئەوە نییە مـرۆڤ خـۆی پشـت گـوێ بخـات و ئەگـەر وابێت راوێژکردن پێچەوانەی پشت بەسـتنە بـەڵکو پشـت بەسـتن واتـا مـرۆڤ هۆکـارە بەرچاوەکان رەچاو بکات و لە دڵیدا پشت بە خودا ببەستێت.

## بنچینەی دووەم: داد (العدل):

داد یان دادپەروەری بریتیە لەوەی هەر کەسێك مافی خۆی پێ بدرێت بـۆ نموونـە ئەگەر زیاتر پاداشتی وەرگرت یان لە تاوان بە کەمتر لە سزای خۆی سزا درا ئـەوا بـەو زیادەیە یان کەمییە دەگوترێت چاکە هەروەکو خودای گەورە فەرموویـەتی ﴿إِنَّ اللَّـهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ...﴾النحل/٩٠. واتا: بە ڕاستی خودای گەورە فەرمان دەکات بە دادپـەروەری و چـاکە، و هەنـدێك لـە زانایـانی یاسـا ئـەو جیاوازییـەی نـاوبراو بـە دادپەروەری نـاو دەبـەن و ئـەوەش هەڵەیـە چونکە داد سەرچـاوەیە و دادپـەروەری

---

[١] – بۆ زیاتر درێژە بگەڕێوە بۆ (تفسیر الفخر الرازی المعروف بالتفسیر الکبیر و مفتاح الغیب للامـام محمد الرازی)/٩/٦٢ و دواتر.

بەرهەمی سەرچاوەیە لە رووی واتا جیاواز نین چونکە پێکهاتەی هەردووکیان یەکە (ع،د،ل/ عدل).

داد بنچینەی سەرەکی هەر حوکمێکە جار هەر جۆرێك بێت و زۆر لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز باس لەو راستەییە دەکەن لەوانە خودای گەورە فەرموویەتی ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ إِنَّ اللّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾النساء/٥٨. واتا: بە راستی خودای گەورە فەرمانتان پێدەکات سپاردەکان بۆ خاوەنەکانیان بگەڕێننەوە و ئەگەر دادوەریتان کرد لە نێوان خەڵکی بە دادپەروەری بڕیار بدەن و بەڕاستی خودا ئامۆژگاریتان دەکات بە چاکە و بە راستی خودا بیسەر و بینەرە.

ئەو ئایەتە پیرۆزە واتای ئەوە دەگەیەنێت کەوا ئەمانەت بریتیە لە هەر ئەرکێکی سەرشانی مرۆڤ و پێویستە لەسەر مرۆڤ ئەو ئەرکە بەرامبەر بە پەروەردیگاری و بەرامبەر بە خۆی بەجێی بگەیەنێت[1] رەچاوکردنی ئەمانەت بەرامبەر بە پەروەردیگار بریتیە لە ئەنجامدانی ئەو کارەی خودا فەرمانی پێکردووە و دووربوون لەو کارەی خودا قەدەغەی کردووە و رەچاوکردنی ئەمانەتی مرۆڤ لەگەڵ دەروونی خۆی بریتیە لەوەی کەوا هیچ شتێك هەڵ نەبژێردرێت کەوا بۆ دونیان و بۆ ئاینی بە سوود نەبێت و بە هۆی پاڵنەری ئارەزووبازی یان تورەیی بەرەو ئەو کارە هەنگاو نەنێت کەوا بۆ خۆی زیان بەخش بێت.

ئەمانەت بەرامبەر بە کەسانی تر: بریتیە لەو کارەی کەوا پێویستە بەرامبەر بە کەسانی تر ئەنجام بدرێت وەکو ئەنجامدانی کاری سوودبەخش و ئەنجام نەدانی کاری زیان بەخش.

بەرپرسیارییەتی سەرکردایەتی میللەت ئەمانەتە لەسەر شانی سەرکردە و پێشەوا (سەرۆکی دەوڵەت) بۆیە پێویستە لەسەری ئەو ئەمانەتە بە دادپەروەری و چاکە

---

[1] – التفسير رازی سەرچاوەی پێشوو ١٠/١٤٥ و دواتر.

بەجێبەگەیەنێت هەروەکو خودای گەورە فەرموویەتی ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ ......﴾ و پێویستە لە هەر شتێك دەیڵێت و فەرمانی پێدەكات دادپەروەر بێت، هەروەکو قورئان داوای دەکات ﴿...وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُواْ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى...﴾الأنعام/١٥٢. واتا: ئەگەر قسەتان کرد دادپەروەربن هەر چەندە لایەنی نارەوا خزمتان بێت.

دەبێت لە رەفتارەکانی دادپەروەر بێت تەنانەت لەگەڵ دوژمنانیش هەروەکو خودای گەورە فەرموویەتی ﴿وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾المائدة/٨. واتا: رق و قینە و خراپەکاری کەسانێك واتان لێ نەکات لە دادپەروەری لابدەن و دادپەروەر بن چونکە دادپەروەری لە پارێزگاری و لەخوا ترسان نزیکترە.

## بنچینەی سێیەم: یەکسانی (المساواة):

بریتیە لە هاوسەنگی لە نێوان ماف و ئەرکەکانی تاك بەجۆرێك کەوا هیچ کامێکیان لەوەی تر زیاتر نەبێت و رەچاوکردنی یەکسانی یەکێکە لە گرنگترین کۆڵەگەکانی سەقامگیری و جێگیربوونی هەر حوکمێك یەکسانە حوکمێکی ئیسلامی بێت یان نائیسلامی چونکە یەکسانی لە مافە سروشتییەکان بریتیە لە پابەندبوون بە ئادەمیزادی مرۆڤ کەوا بۆ رێبازی ژیان پێویستە و هەر کەم کورییەك لەو کۆڵەگەیە شوێنەواری نەرێنی لێ دەکەوێتەوە و کاریگەری خراپی دەبێت لەسەر تاك و کۆمەڵگە و خودی فەرمانڕەوایەتی.

بە تێڕاونینی ئیسلام بنچینەی یەکسانی بریتیە لە پەیوەندی رەچەڵەك و بە یەك گەیشتن لە یەك بنەما و سەرەڕای پەیوەندییەکانی تر، و خودای گەورە فەرموویەتی ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾الحجرات/١٣. و پێغەمبەرﷺ جەختی لەسەر ئەو راستییە کردۆتەوە و فەرموویەتی (خەڵکی وەکو ددانەکانی شانە یەکسانن) واتا ئەی

ئەو كەسانەی لە رووی رەگەز و رەنگ و میللەت و هۆز و تیرە جیاوازن هەمووتان لە یەك بنچینەن كەواتە پەرتەوازە و جیاواز مەبن، ئەوەی بانگتان دەكات پەروەردیگاری ئێوەیە و ئێوەی لە پیاو و ئافرەت دروستكردووە و تێتان دەگەیەنێت كەوا مەبەست لە دابەشكردنی ئێوە بۆ چەند تیرە و میللەت بۆ ناكۆكی و دژایەتیكردنی یەكتر نییە بەڵكو بۆ یەكترناسین و هاوكاریكردنی یەكترە، بەڵام جیاوازی لە زمان و رەنگ و سروشت و بەهرە و ئامادەگی چەند جۆرێكن و پێویست بە ناكۆكی ناكات بەڵكو پێویستە هاوكاری یەكتر بكەن بە مەبەستی راپەڕاندنی گشت ئەركەكان و دابینكردنی گشت پێویستییەكان و رەنگ و رەگەز و زمان و هەرێم و هەر واتایەكی لەو جۆرە لە تەرازووی خودای گەورە هەژمار ناكرێن بەڵكو لەلایەن خودا یەك تەرازوو هەیە كەوا بەها و گەورایەتی مرۆڤی پێ دیاری دەكرێت ئەویش ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾.

بەوجۆرە گشت هۆكارەكانی ناكۆكی و دژایەتیكردن نامێنن و گشت ئەو لایەنە ماددیانە بێنرخ دەبن كەوا هۆكاری دوژمنایەتین و هۆكارێكی گرنگ بۆ نەرموونیانی و هاوكاری دەردەكەوێت كە بریتیە لە پەروەردیگاری خودای گەورە بە سەر گشت خەڵكی و دروستكردنیان لە یەك بنچینە[1].

## بنچینەی چوارەم: ئازادی (الحرية):

ئیسلام دانیناوە بە ئازادی و مافەكانی تاك، لەو ئازادی و مافانە:

أ- مافی خاوەندارێتی تاك و بە چەندین ئەحكام ئەو مافەی دەستەبەر كردووە لەوانە قەدەغەكردنی دەستدرێژكردنە سەر ئەو مافە هەروەكو خودای گەورە فەرموویەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ ....﴾النساء/٢٩.

لەوانە دانانی سزایەكی توند بۆ ئەو كەسەی دزی دەكات ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِّنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾المائدة/٣٨.

---

[1] - بڕوانە سید قطب/ ظلال القرآن/١٤٣/٢٦.

بەڵام ئیسلام مافی خاوەندارێتی بەبێ سنوور و رەها دانەناوە هەروەکو لە جێگەی خۆی باسمان کرد.

ب- ئازادی بیروڕا: یەکێکی تر کاروبارە دونیاییەکان و هیچ مۆرکێکی ئاینی پێوە نییە بریتیە لەوەی کەوا تاك ئازاد بێت لە دەربڕینی هەر رایەك کە دەیەوێت بەڵام بەبێ دوژمنایەتی (واتا بێ ئەوەی بوختان بکات یان جوێن بدات یان بانگەواز بکات بۆ فیتنە و ئاشوب و بەڕەڵایی) و خودای گەورە فەرموویەتی ﴿لاَّ يُحِبُّ اللّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوَءِ مِنَ الْقَوْلِ إِلاَّ مَن ظُلِمَ وَكَانَ اللّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا﴾النساء/١٤٨. کەواتە خودا حەز لە قسەی ناشیرین ناکات.

بەڵام لە کاروبارە ئاینییەکان هەر تاکێك کەوا مەرجەکانی ئیجتیهادی تیادا بێت بۆی هەیە بۆچوون و رای خۆی لە سەر هەر مەسەلەیەك دەربڕێت کەوا دەقی بنبڕی لەسەر نەبێت.

ج- ئازادی بیروباوەڕ: هەروەها ئیسلام ئازادی بیروباوەڕی ئاینی دەستەبەرکردووە و لە چەندین ئایەت ئاماژەی پێکردووە لەوانە خودای گەورە فەرموویەتی ﴿وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ﴾يونس/٩٩. واتا: ئەگەر پەروەردیگارت ویستبای گشت خەڵکی سەر زەوی باوەڕی دەهێنا ئایا تۆ زۆری لە خەڵکی دەکەیت بۆ ئەوەی ببن بە باوەڕدار.

یەکێکی تر لەو ئایەتانە خودای فەرموویەتی ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ...﴾البقرة/٢٥٦. واتا: زۆری لە ئایندا نییە و راستی لە ناڕەوا دیارە، و هەروەها زۆر ئایەت لە قورئانی پیرۆز دەبینین کە تاك هاندەدەن بۆئەوەی بیروباوەڕی لە رێگەی تێڕوانین و بیرکردنەوە وەبگرێت نەك لە رێگەی بە یەکتر چوون و لاسایکردنەوەی دایك و باوك یان هەر شتێکی لەو جۆرە.

# باسی چوارەم:
# ئەحکامە کارگێڕییەکان

## الاحكام الادارية

ئیسلام سروشتی داهات و شت و مەکە هاوردەکراوەکان و ناوەندە گشتییەکانی دەوڵەتی دیاری نەکردووە بەڵکو ئەو کارەی بۆ عەقڵی تەواو و راست و دروست بەجێهێشتووە بۆئەوەی لە ژێر تیشکی خواستەکانی ژیانی پێشکەوتوو و رەچاوکردنی بەرژەوەندییە باڵاکانی میللەت لە هەر کات و شوێنێك ئەو کاروبارانە رێك بخات.

زانایانی فیقهی مسولمان بڕیاریانداوە کەوا سەرۆکی دەوڵەت بەوپێیەی دەسەڵاتی جێبەجێکردنی پێسپێردراوە و بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ ئەو کارە دەکات بەرامبەر بە خودا و بەرامبەر بە خەڵکی بەرپرسیارە.

بۆی هەیە پشت بە کەسانی پسپۆڕ و خاوەن ئەزموون و لێزان و شایستە ببەستێت هەر کەسێك لە چوارچێوەی کارەکەی و تایبەتمەندییەکەی.

دەزگای دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە سەرۆکی دەوڵەت و یاریدەدەرە کارگێڕییەکان پێکدێت لە گشت ناوەندە گشتییەکان.

پێشەوا (سەرۆکی دەوڵەت) دەسەڵاتە ئاینی و دونیایی (رامیارییەکان)ی هەیە.

## یەکەم: دەسەڵاتە ئاینییەکان:

١- پاراستنی ئاین: پێویستە لەسەری گشت پێویستییەکانی فێرکردن دابین بکات و بنەماکانی فێرکردن بڵاو بکاتەوە و چاودێری پابەندبوون بە ئاین بکات و لێپرسینەوە لەگەڵ هەر کەسێك بکات کەوا لە ئاین دەردەچێت.

٢- تێکۆشان لە پێناوی خودا و بەرگریکردن لە گەڵی مسولمان هەر کاتێك دووچاری مەترسی دوژمن ببێتەوە و بە دانایی و ئامۆژگاری چاکە و ڕێگا ئاشتییەکان بانگەواز بۆ ئیسلام بکات.

٣- لە هەڵگرتنی سامان لە داهاتەکانی دەوڵەت و خەرجکردنی لە خەرجییە شەرعییەکان ڕەچاوی شەریعەت و دادپەروەری بکات.

٤- بەردەوام بێت لەسەر دروشمە ئاینییەکان و کار بکات بۆ دروستکردنی شوێنەکانی خواپەرستی و ژیانی ئەو کەسە دابین بکات کەوا بەرپرسیارییەتی ئەو شوێنانە دەگرێتە ئەستۆ لە ڕووی بەجێگەیاندنی دروشمە ئاینیەکان و لە ڕووی بەردەوامی و کەل و پەلی بۆ ئەو شوێنانە و هەروەها گرنگیدان بە ناوەندە گشتییەکانی دەوڵەت و دەزگا تەندروستی و کۆمەڵاتی و ئابوورییەکان و هەر ناوەندێکی تری پێویست بۆ ژیانی گشتی.

## دووەم: دەسەڵاتە دونیاییەکان (ڕامیارییەکان):

١- سەرپەرشتیکردنی کاروبارە گشتییەکانی دەوڵەت و (ماوردی) دەڵێت: (پێویستە لەسەر خەلیفە بە خۆی سەرپەرشتی کاروبارەکان بکات و سەرنجی حاڵەتەکان بدات بۆ ئەوەی بە سیاسەتی گەڵ و پاسەوانی میللەت ڕاپەڕێت و ئەو کارە بە کەسێکی تر نەسپێرێت).

٢- بەرگری لە دەوڵەت بکات لە رێگەی بەرەنگاربوونەوەی دوژمن بە ئامادەکردنی سوپا و پتەوکردنی پارێزگاری و دابینکردنی هێز و ئامادەکردنی کەل و پەل و گشت پێداویستییەکانی سەربازی.

٣- پارێزگاریکردن لە ئاسایشی دەوڵەت و سیستەمی گشتی.

٤- سەرپەرشتیکردنی بەرێوەچوونی دادپەروەری لە نێوان خەڵکی.

٥- سەرپەرشتیکردنی کارگێری دارایی.

٦- هاوکارەکانی لەسەر بنەمایەکی راست و دروست و لەو کەسانە هەڵبژێرێت کەوا شایستە و خاوەنی ئەزموون و لێزان و دڵسۆزن و هەست بە بەرپرسیارییەتی دەکەن[1].

## والییەکان و دەسەڵاتەکانییان:

ئەبو یەعلی لە (الاحكام السلطانية[2]) والیەکانی لە رووی دەسەڵاتەکانیان کردۆتە چوار بەش وەکو:

١- هەندێك والی لە کارە گشتییەکان دەسەڵاتێکی گشتییان هەیە و بریتین لە وەزیرەکان چونکە لەلایەن خەلیفە (سەرۆکی دەوڵەت) گشت کاروبارەکانیان پێسپێردراوە بەبێ دیاریکردن.

٢- هەندێك والی لە هەر دەوڵەتێك دەسەڵاتیان گشتییە بەڵام لە کارە تایبەتییەکان و بریتین لە ئەمیرەکان کەوا بەسەر هەرێمی دەوڵەت دابەشکراون و تایبەتمەندییان گشتییە بەڵام هەر یەکەیان لەو هەرێمە ئەو کارە ئەنجام دەدات کەوا

---

[1] - بۆ زیاتر درێژ بگەرێوە بۆ (الاحكام السلطانية و الولايات الدينية و للماوردي/ ابى الحسن على بن محمد حبيب) لە ٤٥٠ك کۆچی دوایی کردووە/ چاپی دووەم ١٩٦٦ ل١٥ و دواتر، (لاحكام السلطانية) للقاضي يعلي (محمد بن الحسن الفراء الحنبلي) لە ٤٥٨ك کۆچی دوایی کردووە چ٢/ ١٩٦٦ ل٣٧-٣٨.

[2] - بگەرێوە بۆ (الاحكام السلطانية) ئەبو یەعلی الفراء الجنبلي/ل٣٨ و دواتر.

بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ئەو هەرێمەی پێسپێردراوە و لەو کاتەی ئێستا نزیکەی وەکو (پارێزگارەکانی ئەمڕۆ).

٣- هەندێك والی لە کارە تایبەتەکان دەسەڵاتیان تایبەتە و لەو کارە گشتییانەی تایبەتن بە گشت گەڵ دەسەڵاتیان دیاریکراوە وەکو دادوەری دادوەران و ئێستا نزیکەی وەکو وەزیری داد، و نەقیبی سوپا و ئێستا نزیکەی وەکو وەزیری بەرگری، بەرپرسی دارایی گشتی لە رووی باج وەرگرتن و خەرجییەکان و وەکو وەزیری دارایی.

٤- هەندێك والی لە کارەتایبەتەکانی ناوچەیەکی تایبەت دەسەڵاتیان تایبەتە وەکو ئەو دادوەرەی کەوا تەنها لە ناوچەی تایبەتمەندی خۆی کاری دادوەری ئەنجام دەدات و بۆی نییە لە ناوچەیەکی تر یان لە شارێکی تر ئەو کارە بکات، وەکو بەرپرسی کۆکردنەوەی داهاتەکانی دەوڵەت لە شارێکی تایبەتی یان هەرێمێکی دیاریکراو لە هەرێمەکانی دەوڵەت، و بەڕێوەبەری پۆلیس لە هەرێمێکی دیاریکراو و ئێسا وەکو پارێزگا.

## وەزارەت:

دوای پۆستی خەلیفە (سەرۆکایەتی دەوڵەتی ئیسلامی) وەزارەت یەکێکە لە گرنگترین پۆستەکانی دەوڵەت لە سەردەمی خەلافەت، ئیبن خەلدون لە (موقدیمەکەی) دەڵێت: (وەزارەت یان بریتییە لە نەخشەی سولتانی و پلەی پادشایەتی چونکە ناوی وەزارەت واتای هاوکاری دەگەیەنێت، کەواتە وەزارەت یان لە هاوکاری وەرگیراوە یان لە بارگرانی وەرگیراوە چونکە وەزیر بار گرانی سەرشانی خەلیفە (سەرۆکی دەوڵەت) هەڵدەگرێت).

### دروست بوونی وەزارەت:

هەندێك پێیان وایە (وەزیر) وشەیەکی فارسییە لە بنەڕەتدا لە (فرس) وەرگیراوە بەڵام لە قورئانی پیرۆز لەسەر زمانی پێغەمبەر موسا (ع - س) هاتووە و فەرموویەتی

﴿وَاجْعَل لِّي وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِي، هَارُونَ أَخِي﴾طه/٣٠و٢٩. واتا: خودایە یەکێك لە کەس و کارم بکە بە هاوکارم و حەزدەکەم هارونی برام بێت و پشتی منی پێ بەهێز بکە و لە کاروبارەکانم هاوبەشم بێت.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (ئەگەر خودای گەورە چاکەی بۆ بەندیەك بوێت وەزیرێکی راستگۆی بۆ دادەنێت و ئەگەر کارێکی لە بیر بێت هاوکاری دەکات و ئەگەر بیری چوو بیری دەهێنێتەوە، و ئەگەر چاکەی بۆ نەوێت وەزیرێکی خراپی بۆ دادەنێت کەوا ئەگەر کارێکی بیرچوو بیری ناهێنێتەوە و ئەگەر بیری بوو هاوکاری ناکات).

گەورە یاوەرانی پێغەمبەرﷺ بە ئەرکی وەزیر هەڵدەستان و لە کاروبارە دونییەکان و ئیجتیهادییەکان راوێژی پێ دەکردن و لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دەوڵەتی ئیسلامی هاوکاری پێغەمبەریان دەکرد.

هەروەها سیستەمی ویلایەت لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ دەستی پێی پێکردووە و چەند کار بەدەستێکی ناردووە بۆ هەرێمەکانی ژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەتی ئیسلامی ئەو کات.

زانایانی فیقهی ئیسلامی گرنگیان بە دارشتن و رێکخستنی ئەحکامەکانی وەزارەتەکان داوە لەوانە (الثعالبي و ابن طباطبا و ماوردی و ابو یعلي الفراء) و ئەو دووانەی کۆتایی باس لە جۆرەکانی وەزارەتەکان و دەسەڵاتەکانیان دەکەن هەریەکەیان لە کتێبەکەی بە ناوی (الاحکام السلطانیة[1]).

---

[1] – بڕگەڕێوە بۆ (الاحکام السلطانیة) ماوردی و بابی دووەم (تقلید الوزارة) ل٢٢– ٢٩، و (الاحکام السلطانیة) قاضي ابي یعلي الفراء/ ل٢٩ و دواتر.

**جۆرەکانی وەزارەتەکان:**

(ماوردی و فراء) وەزارەتەکانی دەوڵەتیان کردوونەتە دوو جۆر:

**وەزارەتی دەسەڵات پێدراو و وەزارەتی جێبەجێکردن:**

یەکەم: وەزارەتی دەسەڵات پێدراو:- بریتیە لەوەی کەوا پێشەوا (سەرۆکی دەوڵەت) یەکێك رابسپێرێت بۆ بەڕێوەبردنی چەند کاروبارێك بە ڕای خۆی و بە وازۆی خۆی و بە ئیجتیهادی خۆی رەفتار دەکات و بە شێوەیەکی گشتی لە ویلایەتەکان گشتگیر ترە و وەزیری دەسەڵات پێدراو گشت دەسەڵاتەکانی خەلیفەی هەیە تەنها سێ دەسەڵات نەبێت و بریتین لە:

١- جێنشین (ولي العهد) چونکە دەسەڵاتی دامەزراندنی جێنشین تایبەتە بە خەلیفە.

٢- یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی خەلیفە بریتیە لە بەخشینی گەڵ لە پێشەوایەتی.

٣- بەخشینی وەزیر لە پۆستەکەی.

لەبەر فراوانی دەسەڵاتەکانی وەزیری دەسەڵات پێدراو بە مەرج دانراوە کەوا مەرجەکانی پێشەوایەتی (سەرۆکی دەوڵەت)ی تیادا بێت و جگە لە مەرجەکانی پێشەوایەتی پێویستە وەزیری دەسەڵات پێدراو مەرجێکی تریشی تیادا بێت کە بریتیە لەوەی کەوا شایستەی ئەو کارە بێت کەوا پێی سپێردراوە جا کاروباری جەنگ بێت یان دارایی و لەو کاروبارانە پسپۆڕ و لێزان بێت[١].

---

[١] - (الاحکام السلطانیة للماوردي) ل٢٢.

**سروشتی هاوکاری له نێوان پێشەوا و وەزیری ڕاسپێردراو:**

دەکرێت ئەو هاوکارییە لەوەی خوارەوە کورت بکرێتەوە:

١- پێویستە لەسەر وەزیری دەسەڵات پێدراو چاودێری پێشەوا (سەرۆکی دەوڵەت) بکات لە گشت ئەو کاروبارانەی ئەنجامی داوە و ئەو ویلایەت و تەقلیدکردنەی جێبەجێی دەکات بۆ ئەوەی کارەکەی نەبێتە دەسەڵاتێکی زۆرداری و تاکڕەوانە.

٢- پێویستە لەسەر خەلیفە کارەکانی وەزیر و ئامادەکاری بۆ کاروبارەکان بپشکنێت بۆئەوەی دان بەو کارانەی دابنێت کەوا لەگەڵ ڕاستی گونجاون و ئەو کارانەی دووربخاتەوە کەوا پێچەوانە و سەرپێچین[١].

**دووەم: وەزارەتی جێبەجێکردن:**

ئەو وەزارەتە دەسەڵاتی لە وەزارەتی دەسەڵات پێدراو کەمترە چونکە ڕۆڵی وەزیری جێبەجێکردن - هەروەکو لە ناوەکەی دیارە - تەنها بریتییە لە جێبەجێکردنی ئەو کارەی خەلیفە فەرمانی پێکردووە و وەکو وەزیری دەسەڵات پێدراو بە ڕای خۆی و ئیجتیهادی خۆی ڕەفتار ناکات.

هاوسەنگی نێوان وەزارەتی دەسەڵات پێدراو و جێبەجێکردن:-

١- وەزیری دەسەڵاتی پێدراو بۆی هەیە کاری فەرمانڕەوایەتی بکات و سەیری ستەمەکان بکات و وەزیری جێبەجێکردن بۆی نییە ئەو کارە بکات.

٢- وەزیری دەسەڵات پێدراو بۆی هەیە دەربارەی تەقلیدکردنی والییەکان کار بە بۆچوونی خۆی بکات و وەزیری جێبەجێکردن بۆی نییە ئەو کارە بکات.

---

[١] - (الاحكام السلطانية للقاضي لبي يعلي الفراء) ل٢٩-٣٠.

٣– وەزیری دەسەڵات پێدراو بۆی هەیە دەستکاری سامانی گەنجینەی گشتی (بیت المال) بکات بە وەرگرتنی ئەوەی شایستەیەتی و دانی ئەوەی پێویستە بدرێت و وەزیری جێبەجێکردن ئەو دەسەڵاتەی نییە.

٤– وەزیری دەسەڵات پێدرلو بۆی هەیە بە تەنها کاروبارەکانی سوپا و کاروبارەکانی جەنگ بەڕێوە دەبات وەزیری جێبەجێکردن ئەو دەسەڵاتەی نییە.

**مەرجەکانی دامەزراندن لە پۆستی وەزارەتی جێبەجێکردن:**

پێویستە ئەو کەسەی پۆستی وەزارەتی جێبەجێکردن وەردەگرێت ئەو مەرجانەی خوارەوەی تیادا بێت:

١– دەستپاکی: بۆئەوەی ناپاکی لەو شتە نەکات کەوا کراوەتە ئەمین لەسەری.

٢– راستگۆیی: بۆئەوەی متمانە بە قسەکانی بکرێت.

٣– لەلایەن خەڵکی کەسێکی گونجاو و قەبوڵکراو بێت.

٤– زیرەك و ئازا بێت بۆ ئەوەی فێڵی لێ نەکرێت.

٥– ملکەچی هەوا و هەوەسی نەبێت تاکو هەوا و هەوەسی لە راستییە بەرەو نارەوایی نەبات[1].

## دیوانەکان:

کاتێك دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامی فراوان بوو بۆ هەر هەرێمێك (والییەك) دیاریکرا و ئەو والییە کاروبارە ئاینی و دادوەری و سەربازی و داراییەکانی ئەو ناوچەیەی دەگرتە ئەستۆ و لەو کاتی پێویست بە دامەزراندنی چەند دیوانێك هەبوو وەکو ناوەندە گشتییەکانی ئێستا و تایبەتمەندییەکانیان دیاریکرا بەو جۆرەی خوارەوە:

---

[1] – سەرچاوەی پێشوو.

أ- ديوانی سوپا (ديوان الجيش): تێكۆشان لەسەر گشت پياوكێك پێويستە كەوا بتوانێت چەك هەڵگرێت و بەرگری لە راستی و ئاين بكات و ديوانی سوپا بەرپرسيارە لە رێكخستن و دابينكردنی كەرەستەكانی سەربازی و كۆتايی هاتنی خزمەت لە سوپا و قەرەبووكردنەوەی ئەو چەك و كەرەستانەی لەناوچوونە و دابينكردنی خەرجييەكانی سەفەر و خەرجييەكانی شەهيدەكان ... و جگە لەوە هەركارێكی پەيوەست بە كاروبارە سەربازييەكان.

ب- ديوانی باج و سەرانە (ديوان الخراج): ئەو ديوانە چەند لقێكی هەيە و هەر لقێك بەرپرسيارييەتی كۆكردنەوەی باج و سەرانە دەگرێتە ئەستۆ و سەربەخۆيە بەڵام لە سەردەمی ئەمەوييەكان و عەباسييەكان ديوانی سەرانە و باج لە سەنتەری خەلافەت (پايتەخت) بوو و گشت دارايی دەوڵەتی بەرێوە دەبرد و بەرێوەبردنی ناوەندی دارايی دەگرتە ئەستۆ.

ج- ديوانی پۆستە (ديوان البريد): (معاوية) يەكەم كەس بوو كەوا سيستەمی پۆستەی لە دەوڵەتی ئيسلامی دامەزراند و يەكەم جار تايبەت بوو بە پۆستەی دەوڵەت و دواتر بووە دەزگايەكی گشتی كەوا ميللەت دەيتوانی لە كەل و پەلەكانيان بەكاری بهێنن.

## ئامرازەكانی گواستنەوەی پۆستە:

ئامرازەكان تەنها بريتی بوون لەو رێگايانەی خوارەوە:

١- رێگەی بەكارهێنانی وڵاغ بۆ گواستنەوەی پۆستە.

٢- رێگەی عارەبانەكان كەوا لە حالەتەكانی بە پەلە و لە كاروبارە سەربازييە تايبەتەكان وڵاغەكان رايان دەكێشان.

٣- كۆتری نامەبەر (پۆستەی ئاسمانی).

٤- ديوانی پۆستە ئەركی دامەزراندنی فەرمانبەران و كرێكارەكانی دەوڵەت دەگرێتە ئەستۆ و هاوشێوەی ئەنجوومەنی خزمەتی ئێستا بوو.

## سیستەمی حیسبە:

بریتیە لە فەرمانکردن بە چاکە واتا بەو شتەی کەوا سوودی بۆ تاك و کۆمەڵگە هەیە، و قەدەغەکردنی خراپە واتا ئەو شتەی بۆ تاك و کۆمەڵگە زیانبەخشە، و حیسبە لە ئیسلامدا (فەرزی کیفایە)یە و لە سەر گشت خەڵکی پێویستە بە بڕیاری قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەرﷺ.

أ- قورئانی پیرۆز: یەکێك لەو ئایەتانەی فەرمان بە پیادەکردنی سیستەمی حیسبە دەکات بریتیە لەوەی خودای گەورە فەرموویەتی ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾آل عمران/١٠٤.
واتا: ئێوە ببن بە نەتەوەیەك کەوا بانگەواز بۆ خێر و چاکە بکەن و خراپە قەدەغە بکەن و ئەو نەتەوەیە سەرکەوتووە.

ب- فەرموودەی پێغەمبەرﷺ: یەکێك لەو فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ کەوا داوای پیادەکردنی سیستەمی حسیبە دەکات فەرموویەتی (هەر یەکێك لە ئێوە خراپەیەکی بینی با بە دەستی بیگۆڕێت و ئەگەر نەیتوانی با بە زمان بیگۆڕێت و ئەگەر نەیتوانی با بە دڵ پێی ناخۆش بێت ئەوەی کۆتایی لاواز ترین باوەڕە)، و فەرموویەتی (خراپترین نەتەوە ئەو نەتەوەیە کەوا فەرمان بە چاکە ناکەن و خراپە قەدەغە ناکەن).

# وانەی دەیەم

## دادگا و ڕێگاکانی سەلماندن

## القضاء و وسائل الاثبات

دادگا بریتیە لە دادوەریکردن لە نێوان خەڵکی بە ڕاستی و ڕەوا[1].

هەر لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ ئیسلام لە ڕووی ڕێکخستن و پیادەکردن گرنگی داوە بە دادگا چونکە بەرزترین زانستە و بە هێزترین پێگەی هەیە و باسکردنی شکۆمەندییە و گیانەکان دەپارێزێت و ڕێگە دەگرێت لە خوێن ڕژان و لە ناوبردنی کاڵا و کەلّ و پەلەکان قەدەغە دەکات و خاوەندارێتی سامان دەسەلمێنێت.

ڕاڤەکاران دەڵێن: مەبەست لە (الحکمة) لە فەرموودەی خودای گەورە ﴿.... وَآتَيْنَاهُ الْحِكْمَةَ وَفَصْلَ الْخِطَابِ﴾ص/٢٠. بریتیە لە زانستی دادگا.

پێغەمبەرﷺ بە خۆی کاری دادگای ئەنجام دەدا و فەرمانی بە یاوەرانی دەکرد ئەو کارە بکەن و هەندێك لە یاوەرانی ناردوون بۆ ئەوەی لە ناوچەکانی ژێر فەرمانڕەوایەتی ئیسلامی دادوەری بکەن و زانایانی گشت مەزهەبە جیاجیاکانی فیقهی ئیسلامی پەرتووکێك یان دەروازەیەکی سەربەخۆیان تەرخانکردووە بۆ باسکردنی دادگا لە ڕووی ئاکار و ئەرکەکانی دادوەر و مەرجەکانی دەستنیشانکردن بۆ پۆستی دادگا.

---

[1] – بدائع الصنائع للكاساني/ ٦/٤٠٧٨.

هەروەها زانایان راستەوخۆ دوای دادگا گرنگیان داوە بە بەڵگەکانی سەلماندن چونکە پەیوەندی لە نێوانیاندا هەیە.

هەر یەك لە دادگا و بەڵگەکانی سەلماندن لە باسێکی سەربەخۆ باس دەکەین بە مەبەستی زیاتر روونکردنەوە و سوودی زیاتر.

# باسی یەکەم:
# دادگا

## القضاء

ئەو باسە رەوایەتی و حوکمی دادگا و مەرجەکانی دادوەر و ئادابەکانی دادگا لەخۆ دەگرێت.

**رەوایەتی دادگا – مشروعیة القضاء:**

رەوایەتی دادگا بە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرﷺ و کۆدەنگی زانایان (الاجماع) سەلمێندراوە.

أ- **قورئانی پیرۆز:** زۆر لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز باس لە دادگا و ئەحکامەکانی دادگا دەکەن و لەوانە فەرموودەی خودای گەورە ﴿وأن الحکم بینهم بما أنزل الله ....﴾[1] واتا: بەپێی ئەوەی خودای گەورە دابەزاندووە دادوەریان لە نێواندا بکەن.

---

[1] – المائدة/٤٩.

ب- **فەرموودەی پێغەمبەرﷺ:** پێغەمبەرﷺ بە خۆی کاری دادگای ئەنجام دەدا و بڕیاری لەسەر زۆر لە ناکۆکییەکانی خەڵکی داوە و یاوەرانی هانداوە لەسەر دادوەریکردن و فەرموویەتی (ئەگەر دادوەر حوکمی دا و راستی کرد دوو پاداشتی هەیە و ئەگەر حوکمی داو هەڵەی کرد یەك پاداشتی هەیە[1]).

خەلیفەکان و یاوەران و گەورە زانایانی فیقهی لە رووی گرنگیدان بە دادگا شوێنکەوتەی پرۆگرامی پێغەمبەرﷺ کەوتوون.

ج- **کۆدەنگی زانایان (الاجماع):** زانایانی فیقهی ئیسلام لە هەر سەردەمێك کۆك بوونە لەسەر ئەوەی کەوا دادگا یەکێکە لە پێویستییەکانی رێکخستنی ژیان.

## حوکمی دادگا:

لە رووی سەیرکردنە خود و چۆنیەتی دادگا لە ژیان ئیسلام دادگای بە فەرزی کیفایەی داناوە واتا پێویستە لەسەر گشت تاکەکانی میللەت و ئەگەر هەندێك ئەو کارەیان ئەنجامدا ئەرکەکە لەسەر گشتیان لادەچێت بەڵام سەبارەت بەو کەسەی کاری دادگا ئەنجام دەدات سێ ئەحکامی هەیە:

أ- ئەو کەسەی شایستەیی دادگا و مەرجەکانی دادگای تیادا نەبێت حەرامە لەسەری ئەو کارە.

ب- ئەو کەسەی لە ناوچەکەی شیاوی و مەرجەکانی تیادایە و چەند کەسی تریش هەبن شایستەی ئەو کارە بن دروستە بۆی ئەو کارە بکات.

ج- ئەو کەسەی تەنها ئەو شایستەی کاری دادگایە پێویستە لەسەری ئەو کارە بکات.

---

[1] - سُبل السلام/١٥٥/٤.

## مەرجەکانی دادوەر:

زانایان لە بارەی مەرجەکانی دادوەر بیروڕای جیاوازییان هەیە و (ئیبن قودامە[1]) لە سێ مەرج کورتی کردوونەتەوە و بریتین لە:

١- تەواو بوون.

٢- دادپەروەری.

٣- شایستەی ئیجتیهادکردن بێت.

زۆربەی زانایانی فیقهی لەوانە ئیمامی مالك و شافیعی و ئەحمەد ئاماژەیان بە مەرجی ئیجتیهاد کردووە بە قیاسکردن لەسەر فەتوادەر چونکە دروست نییە فەتوادەر کەسێکی عەوام و موقەلید بێت و بە هەمان شێوە پێویست ترە دادوەر کەسێکی عەوام و موقەلید نەبێت چونکە بڕیاری دادوەر فەتوایە و ئەگەر بڕیاری دادوەر فەتوا نەبێت پابەندبوون پێوە پێویست نییە[2].

حەنەفی و یاوەرانی پێیان وایە: شایستەی ئیجتیهادکردن مەرج نییە بەڵکو دەنگونجێت بە زانستی یەکێتی تر و بە گەڕانەوە بۆ وتەکانی زانایانی فیقهی بڕیار بدات[3].

## ئادابەکانی دادگا:

عومەری کوڕی خەتتابﷺ لە نامەکەی بۆ (ئەبو موسای ئەشعەری) بە کورتی ئاماژەی بە ئاداب و ئەرکەکانی دادگا کردووە ئەوەش دەقی نامەکەیە[4]:

---

[1] - المغني/٩/٤٠.

[2] - المغني/ سەرچاوەی پێشوو/ الرملي نهاية المحتاج/٨/٢٢٦.

[3] - البدائع للكساني/ ٩/٤٠٧٩.

[4] - دەقی ئەو نامەیە لە زۆر لە سەرچاوەکان هاتووە لەگەڵ ئەوەی هەندێك جیاوازی لە دەستەواژەکانی هەیە.

به ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

لە بەندەی خودا عومەری کوڕی خەتتاب فەرمانڕەوای باوەڕداران بۆ ئەبو موسای ئەشعەری سەلامی خودات لەسەر بێت و دادگا پێویستە و ڕێبازێکە گیردراوەتەبەر و پێویستە لەسەرت بە عەقڵ و تێگەیشتن و زۆربیکردنەوە بڕیار بدەیت کەواتە ئەگەر پیاوێك بەڵگەیەکی خستییە بەردەمت تێبگە و ئەگەر تێگەیشتی بڕیار بدە و ئەگەر بڕیارتدا بەڕێی بکە چونکە قسەکردنی بە راستی ئەگەر کاری پێنەکرێت سوودی بۆی نییە و لە رووخسارت و دادپەروەریت و دانیشتنت و بڕیاردانت لەگەڵ خەڵکی یەکسانبە بۆ ئەوەی کەسی بەهێز سوود لە نەرمیت وەرنەگرێت و بێهێزیش لە دادپەروەریت بێ ئومێد نەبێت.

پێویستە لەسەر داواکار بەڵگە و شاهێدی هەبێت و پێویستە لەسەر داوالێکراو سوێند بخوات ئەگەر نکولی کرد، دروستە مسولمانان ئاشبنەوە تەنها ئەو ئاشتبوونەوە نەبێت کەوا حەڕام حەلال دەکات یان حەلالێك حەڕام دەکات، و هەر کەسێك بانگەشەی مافێکی نادیار یان بەڵگەیەکی نادیاری کرد مۆڵەتی پێ بدە تاکو ئامادەی بکات، و ئەگەر بەڵگەکەی ئامادەکرد مافی بۆ وەربگرەوە و ئەگەرنا بڕیاری ئاراستە بکە، و ئەوەش لە بیانو بەهێزترە، و بڕیاردانت لەسەر کێشەی ئەو لە دوێنی گەڕانەوەت بۆ عەقڵی خۆت، و تێگەیشتنت ڕێگر نییە لەبەردەم گەڕانەوەت بۆ راستی، کەواتە راستی کۆنە و گەڕانەوە بۆ راستی باشترە لە بەردەوام بوون لەسەر ناڕاستی، و تێبگە لەوەی لەناو سینگتدایە و لە کتێبی خودا و فەرموودەی پێغەمبەرﷺ نییە، و دواتر شتەکان و هاوشێوەکان بناسە، لەو حالەتە کاروبارەکان قیاس بکە لەسەر یەکتری، و پێداگری لەسەر ئەو شتە بکە کەوا نزیکترە لە خودای گەورە و زیاتر هاوشێوەی راستییە.

مسولمانان هەندێکیان دەبنە فیدای هەندێکیان تەنها ئەو کەسە نەبێت کەوا حەددی لێدەر دەکرێت یان شاهێدی درۆی داوە یان تاوانباری ولایەت یان رەچەڵەك یان خزمایەتی و خودای گەورە لە رەفتارە شاراوەکانتان ئاگادارە و بەڵگە و

باوەڕهێنـان بـە گوماناوییـەكانتان لـێ دوور دەخاتـەوە، و دووریـە لـە تووڕەبـوون و دڵەڕاوكێی و بێزاربوون و ئازاردانی خـەڵكی لـە كـاتی نـاكۆكی و خۆگـۆڕین لـە كـاتی ناكۆكی چونكە دادگای بە راستی خـودای گـەورە پاداشـتی بـۆ دادەنێت و بـە باشـە باسی دەكات[1].

زانای فیقهی حەنەفی ناسراو بە (كاسـانی) گـرنترین ئـاداب و ئەركـەكانی دادوەری لەو نامەیە دەرهێناوە و بریتین لە:

١- دەبێت تێبگات لەو ناكۆكییەی دەخرێتە بەردەمی بەجۆرێك كـەوا موتابەعـەی وتەكانی لایەنە ناكۆكەكان بكات و گوێیـان لـێ بگرێـت بۆئـەوەی بـە حـەق و راسـتی بكات.

٢- دەبێت دەروونی حەساوە بێت و دڵەڕاوكێی نەبێت و بێزار نەبێت بۆ ئەوەی لە كـاتی موتابەعـەكردنی رووداوەكـانی كێشـەكە و گـوێگرتن لـە بەڵگـەكانی لایەنـە ناكۆكەكان سەرقاڵ نەبێت.

٣- نابێت تووڕە بێت.

٤- لـە دانیشـتن و هەسـتان یەكسـانی لـە نێـوان لایەنـە ناكۆكـەكان بكـات بـەبێ جیاوازی.

٥- لە رووی مامەڵەكردن و توندی و نەرمی لەگەڵ ناكۆكەكان یەكسان بێت.

٦- نابێت بەبێ ئاگاداری ئەوی تر گوێ لە یەكێكیان بگرێـت كـەوا ئـەو گوێگرتنـە دڵخۆشی بكات.

٧- دیارییەكان وەرنەگرێت چونكە دەبێتە بەرتیل.

٨- رێگە بۆ شاهێد و بۆ ناكۆكەكان دانەنێت.

٩- دڵنیا بێت لە دادپەروەری شاهێدەكان.

١٠- نووسەرێك دابنێت بۆ تۆماركردنی داواكان و روونكردنەوەكان و بڕیارەكان.

---

[1] - بدائیع الصنائع في ترتیب الشرائع للكاساني ٤٠٩٣/٩، و لاپەڕەكانی دواتر.

١١- کۆمەڵێك لە کەسانی شارەزا لە زانستی فیقهی لەگەڵی دابنیشن و راوێژییان پێ بکات و لە بڕیاردان پشت بە بیروڕاکانیان ببەستێت.

١٢- دەبێت وەرگێڕێکی هەبێت بۆ ئەوەی لە دانیشتنی دادگایکردنی ئەو داواکار و داوالێکراو و شاهێدە ئامادە بێت کەوا دادوەر لە زمانیان تێناگات.

# باسی دووەم:
# ڕێگاکانی سەلماندن

## وسائل الاثبات

بواری ڕێگاکانی سەلماندن لە فیقهی ئیسلامی زۆر لە بواری فیقهی ڕۆژئاوا و یاسای دەستکرد فراوانترە چونکە بە بۆچوونی ئەو فیقهە جگە لە تاوانەکانی حدود و قیصاص ئازایەتی و باوەڕی دادوەر گرنگە.

لەبەرئەوەی ڕێگاکانی سەلماندن لە فیقهی ئیسلامی زۆر و جۆراوجۆرن و (ئیبن قەیمی جەوجزی) لە کتێبیەکەی بە ناوی (الطرق الحكمية في السياسة الشرعية) باسی بیست و پێنج ڕێگای کردووە، و (فەرحون) لە کتێبەکەی خۆی بە ناوی (تبصرة الحكام في اصول الاقضية و مناهج الاحكام) ڕێگایەکی تری بۆ زیادکردووە.

سەرەڕای ئەوە فیقهی ئیسلامی لە ڕووی وردبینی و جیاکردنەوە و دابەشکردنی ئەو مافانەی لەبەردەم دادگا داوا دەکرێن لە فیقهی ڕۆژئاوا و یاسای دەستکرد جیادەکرێتەوە چونکە مافەکانی کردووەتە دوو بەش یەکەم ئەو مافانەی تەنها مافی خودای گەورەن کە لە یاسا پێیان دەگوترێت مافە گشتییەکان، و دووەمیان مافەکانی تاك و لە یاسا پێیان دەگوترێت مافە تایبەتییەکان و دواتر هەریەك لەو مافانەی لە ڕووی گرنگی و مەترسی بەسەر چەندین جۆر دابەشکردووە چونکە لێرەدا مافێك هەیە کەوا بە یەکێك لە ڕێگاکانی سەلماندن دەسەلمێندرێت و بە هیچ بەڵگەیەکی تری سەلماندن ناسەلمێندرێت و بەڵگەیەك هەیە بۆ سەلماندنی مافێك دەگونجێت و بۆ

سەلماندنی مافێکی تر ناگونجێت و ئەو بەشە چەند نموونەیەکی ئەو مافانە و بەڵگەی سەلماندن لەخۆدەگرێت.

## مافەکان:

زانایانی فیقهی مسولمان گوتویانە[1] مافەکان لە رووی سەلماندنیان بە شاهێد دوو بەشن: مافی خودای گەورە (مافی گشتی) و مافی ئادەمیزاد (مافی تایبەتی).

**مافەکانی خودای گەورە سێ جۆرن:**

١- ئەو مافەی خودای گەورە کەوا دوو شاهێدی پیاوی پێویستە و بریتیە لەو مافەی کەوا پەیوەست نییە بە کاروبارە داراییەکان و بە زۆری پیاو لەو مەسەلانە ئاگادارن وەکو تەلاق و مارەبڕین و کوشتنی بە ئەنقەست و حەددەکان جگە لە تاوانی زینا.

٢- مافێکی تر بە شاهێدی دوو پیاو یان پیاوێك و دوو ئافرەت و یەك شاهێد و سوێند خواردن دەسەلمێندرێت و بریتیە لەو مافەی کەوا تەنها پەیوەستە بە سامان.

٣- مافێك بە شاهێدی یەك ئافرەت دەسەلمێندرێت و بریتیە لەو مافەی کەوا بە زۆری تەنها ئافرەت لێی ئاگادارە وەکو منداڵبوون و سووری مانگانە و پەردەی کچێنی و عەیبەکانی زاوزێی ئافرەتان.

٤- مافێك تەنها بە چوار شاهێد دەسەلمێندرێت و بریتیە لە مافی سەلماندنی تاوانی زینا بە مەبەستی پیادەکردنی سزای زینا.

---

[1] - بۆ زیاتر درێژە بگەڕێوە بۆ (البدائع للکاساني) سەرچاوەی پێشوو/٩/٤٠٩٣ و لاپەڕەکانی دواتر.

## بەڵگەکانی سەلماندن:

گوتمان بەڵگەکانی سەلماندن لە فیقهی ئیسلامی زۆرن لەبەر چەند مەبەستێك لەوانە باوەڕهاتنی دادوەر جگە لەو تاوانانەی سزاکەیان دیاریکراوە (جرائم الحدود) و تاوانەکانی قیصاص چونکە ئەو تاوانانە تەنها بە بەڵگەی بنبڕ نەبێت ناسەلمێندرێن بەجۆرێك کەوا دادوەر دڵنیا بێت لە ڕوودانی تاوانەکە و ڕاستی بەڵگەکە.

لەو قۆناغەی خوێندن مەجالی باسکردنی گشت ئەو بەڵگانە نییە و تەنها هەندێکیان دەخەینەڕوو لەوانە: (شاهێد و، دانپێدانان و، بەڵگە و، لێزان و، زانیاری دادوەر و، نووسین و، سوێندخواردن).

### یەکەم: شاهێدی (الشهادة):

لە زمانەوانی بریتیە لە: وتەیەك کەوا بە هۆی زانیاری بینین دەردەچێت، و لە زاراوەی شەرعی بریتیە لە: هەواڵدان بە ڕاستی بە مەبەستی سەلماندنی مافێك لە دانیشتنی دادوەر.

### بە بەڵگەبوونی شاهێدی:

بە پێی قورئان و فەرموودە و ئیجماع شاهێدی بەڵگەیەکی شەرعییە.

أ- **قورئانی پیرۆز:** خودای گەورە فەرموویەتی ﴿.... وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ[1] ﴾ واتا: با کەسانی دادپەروەر لە ئێوە شاهێدی بدەن، و دەفەرموێت ﴿.... وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ ... [2]﴾ واتا: دوو کەس لە پیاوانتان بکەن بە شاهێد و ئەگەر دوو پیاو نەبوون پیاوێك و دوو ئافرەت بکەن بە شاهێد، و دەفەرموێت: ﴿... وَأَشْهِدُوْاْ إِذَا تَبَايَعْتُمْ .... [3]﴾ واتا: ئەگەر کڕین و

---

[1] – سورة الطلاق/٢.

[2] – البقرة/ ٢٨٢.

[3] - البقرة/ ٢٨٢.

فرۆشتنتان کرد شاهێد دابنێن.

ب- فەرموودەی پێغەمبەرﷺ: و فەرموویەتی: (ئایا باشترین شاهێدیتان پێ بڵێم؟ بریتیە لەو کەسەی کەوا شاهێدی بدات پێش ئەوەی پرسیاری لێ بکرێت[1]).

ج- ئیجماع: زانایانی فیقهی ئیسلامی کۆکن لەسەر ئەوەی کەوا شاهێدیدان ئەگەر مەرجەکانی راست و دروستی تیادا بێت بەڵگەیەکی پێویستە و پێویستە لەسەر دادوەر کاری پێ بکات.

**حوکمی شاهێدی:**

ئەگەر شاهێد داوای لێکرا بێت پێویستە لەسەری شاهێدی بدات چونکە خودای گەورە فەرموویەتی ﴿..وَلاَ تَكْتُمُواْ الشَّهَادَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ ....﴾ واتا: شاهێدی مەشارنەوە و هەر کەسێك شاهێدی بشارێتەوە دڵی تاوانبارە.

**مەرجەکانی شاهێدی:**

زانایانی فیقهی دەربارەی دیاریکردنی مەرجەکانی شاهێدی بیروڕای جیاوازییان هەیە و گرنگترنیان:

أ- دەبێت شاهێد بالیغ و عاقیلْ بێت.

ب- دەبێت دادپەروەر بێت (واتا درۆزەن و دووڕوو نەبێت).

ج- دەبێت لە کاتی شاهێدیدان ئاگاداری ئەو مەسەلەیە بێت کەوا شاهێدی لەسەر دەدات.

**ژمارەی شاهێدەکان:**

ژمارەی شاهێدەکان بە پێی جیاوازی مافی داواکراو جیاوازە بەوجۆرەی خوارەوە:

١- لە تاوانی زینا چوار شاهێد پێویستە چونکە خودای گەورە فەرموویەتی ﴿وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَاسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعةً مِّنكُمْ[1]﴾ واتا: ئەو

---

[1] - ئیمامی موسلم گێڕاویەتییەوە، سبل السلام/١٦٦/٤.

ئافرەتانەتان کەوا کاری بەد ڕەوشتی ئەنجام دەدەن چوار کەس لە ئێوە ببن بە شاهێد لەسەریان. چونکە تاوانی زینا زیان بە ئابڕووی خانەوادە دەگەیەنێت بۆیە ئیسلام توندە لە سەلماندنی ئەو تاوانە.

٢- لەو تاوانانەی سزایان بۆ دیاریکراوە (جرائم الحدود) - جگە لە تاوانی زینا - و تاوانەکانی قیصاص و لە کێشەکانی تر جگە لە کێشەکانی دارایی دوو شاهێد پێویستە وەکو مارەبڕین، و تەلاق و گەڕاندنەوەی ئافرەتی تەلاقدراو[٢].

٣- لە مامەڵەکانی دارایی و ئەو کوشتنەی کەوا خوێنبایی پێویستە پیاوێك و دوو ئافرەت دەبن بە شاهێد، دانانی دوو ئافرەت لە بەرامبەر یەك پیاو لە شاهێدیدان کەمکردنەوەی پێگەی ئافرەت نییە بەڵکو لەبەرئەوەی زۆر سەرقاڵە بە ئەرکەکانی ماڵەوە و ئەرکەکانی تر تووشی لە بیرچوون دەبێت کەواتە ئەگەر یەکێك بیری چوو ئەوەی تر بیری دەهێنێتەوە هەروەکو خودای گەورە فەرموویەتی ﴿.... وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء أَن تَضِلَّ إْحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى ....﴾[٣] واتا: دوو کەس لە پیاوانتان بکەن بە شاهێد و ئەگەر دوو پیاو نەبوون پیاوێك و دوو ئافرەت بکەن بە شاهێد لەوانەی کەوا ئێوە رازین ببن بە شاهێد ئەگەر یەکێکیان بیری چوو ئەوەی تر بیری بهێنێتەوە.

---

[١] - النساء/١٥.

[٢] - المهذب (٢/٣٣٣) (جگە لە سامان و جگە لەو شتانەی مەبەست تیایدا سامانە و پیاوان ئاگاداری دەبن وەکو مارەبڕین و تەلاق و گەڕاندنەوەی ئافرەتی تەلاق دراو و بریکاری و سپاردن و کوشتنی بە ئەنقەست جگە لە زینا تەنها بە دوو شاهێدی پیاو نەبێت ناسەلمێندرێت چونکە پێغەمبەر (ص) فەرموویەتی (مارەبڕین بە ئامادەبوونی وەلی و دوو شاهێد نەبێت دروست نییە).

[٣] - البقرة/ ٢٨٢.

٤- شاهێدێك و سوێندخواردن لە کێشەکان و کاروبارە داراییەکان و حوکمەکە تەنها بە شاهێد دەسەلمێندرێت و سوێندخواردن بەهێزی دەکات و پاڵپشتە بۆ شاهێدی[1].

٥- لە مامەڵە داراییەکان یەك پیاو دەبێتە شاهێد ئەگەر دادوەر زانی راستگۆیە، و لە کاروبارەکانی ئافرەتان یەك ئافرەت بەسە بۆ شاهێدی[2].

**حوکمی شاهێدی لەسەر شاهێدی:**

ئەگەر ئەو مەرجانەی خوارەوەی تیادا بێت دروستە شاهێدی لەسەر شاهێدی بدرێت:

١- مانەوەی شایستەیی شاهێدی بنەڕەتی تاکو کاتی کۆتایی هاتنی شاهێدیدانی شاهێدی لاوەکی.

٢- شاهێدی بنەڕەتی بە هۆی نەخۆشی یان دواکەوتنی یان پیری لەبەردەم دادگا بیانو بهێنێتەوە.

٣- شاهێدی بنەڕەتی نکوڵی لە شاهێدیدانی شاهێدی لاوەکی نەکات.

٤- بە هەمان شێوەی شاهێدی بنەڕەتی مەرجەکانی شاهێدی لە شاهێدی لاوەکی بهێنەدی.

**دووەم: دانپێدانان (الاقرار):**

بریتیە لە دانپێدانانی داوالێکراو لەبەردەم دادگا بە گشت یان بەشێك لەو شتەی داوای لێکراو.

بەپێی قورئان و فەرمووده و ئیجماع دانپێدانان بەڵگەیە و پابەندبوون پێیەوە پێویستە.

---

[1] – الطرق الحكمية في السياسة الشرعية: سەرچاوەی پێشوو، ل٦.

[2] – نظرية الاثبات في الفقه الجنائي الاسلامي/ د.احمد فتحي بهنسي/ل١٢٧.

أ- **قورئانی پیرۆز:** خودای گەورە فەرموویەتی ﴿وَلْيُمْلِلِ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ وَلاَ يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْئًا[1]﴾ واتا: ئەو کەسەی مافی کەسێکی بەسەرەوەیە با لە خودا بترسێت و راستی بڵێت و هیچ مافێك نەشارێتەوە.

ب- **فەرموودەی پێغەمبەرﷺ:** پێغەمبەرﷺ بەپێی دانپێدانانی تاوانبار چوار جار لەبەردەمی بڕیاریداوە بە سزای تاوانی زینا و فەرمانی کردووە بە جێبەجێکردنی ئەو سزایە وەکو کێشەی (ماعز).

ج- زانایانی فیقهی مسولمان کۆکن لەسەر ئەوەی ئەگەر دانپێدانان مەرجەکانی تیادا بێت دەبێتە بەڵگە لەسەر خاوەنەکەی.

**مەرجەکانی دانپێدانان:**

بۆ ئەوەی دادوەر کار بە دانپێدانان بکات پێویستە ئەو مەرجانەی خوارەوەی تیادا بێت:

١- دەبێت دانپێدانەر بالیغ و عاقیلْ بێت.

٢- دەبێت دانپێدانان هیچ عەیبێکی ویستی تیادا نەبێت وەکو زۆرلێکردن و سەرخۆشی.

٣- دەبێت دانپێدانان لەبەردەم دادگا بێت.

**سێیەم: بەڵگە (القرينة):**

بەپێی قورئان و کاری خەلیفەکانی راشیدین و پێشەوایانی فیقهی قەرینە بە بەڵگە دادەنرێت:

أ- **قورئانی پیرۆز:** خودای گەورە دەربارەی چیرۆکی یوسف (ع- س) فەرموویەتی ﴿قَالَ هِيَ رَاوَدَتْنِي عَن نَّفْسِي وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَا إِن كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ الكَاذِبِينَ، وَإِنْ كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِن الصَّادِقِينَ،فَلَمَّا

[1] - البقرة/ ٢٨٢.

رَأَى قَمِيصَهُ قُدَّ مِن دُبُرٍ قَالَ إِنَّهُ مِن كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ[1]﴾ واتا: گوتی لە دەروونی خومدا دوو دڵ بووم و یەکێك لە خزمی ئافرەتەکە بوو بە شاهێد و گوتی ئەگەر کراسەکەی لە پێشەوە دڕابێت ئافرەتەکە راست دەکات و پیاوەکە درۆ دەکات و ئەگەر کراسەکەی لە پشتەوە دڕابێت پیاوەکە راست دەکات و ئافرەتەکە درۆ دەکات و کاتێك بینی کەوا کراسەکە لە پشتەوە دڕاوە و گوتی ئەوە مەکر و فێڵی ئێوەی ئافرەتانە و بە ڕاستی فێڵی ئێوە زۆر گەورەیە.

شێوازی وەرگرتنی بەڵگە لەو ئایەتە ئەوەبوو کەوا لە ڕێگەی دڕانی کەراسەکە لە پشتەوە توانی راستگۆ لە درۆزەن جیا بکاتەوە و ئەوەش بریتیە لە حوکمدان بەپێی بەڵگەکان و شاهێد حالەکان.

عومەری کوڕی خەتتاب (ﷺ) فەرمانیکرد بە سزادانی ئافرەتێکی سکپڕ بە تاوانی زینا چونکە ئەو ئافرەتە مێردی نەبوو[2].

**چوارەم: لێزانی (الخبرة):-**

لێزانی بریتیە لە شارەزایی کەسێك لە یەکێك لە بوارەکان، زانایانی فیقهی مسولمان گوتوویانە: دادوەر بۆی هەیە پشت بە لێزانەکان ببەستێت بە مەبەستی وەرگرتنی بیروڕاکانیان و حوکمدان لە ژێر تیشکی بیروڕای لێزانەکان، و بەڵگە لەسەر بە بەڵگەدانانی لێزانی:-

أ- **قورئانی پیرۆز:** خودای گەورە فەرموویەتی ﴿فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ[3]﴾ واتا ئەگەر ئێوە نەزانن پرسیار لە کەسانی شارەزا بکەن.

ب- **فەرموودەی پێغەمبەرﷺ** بۆ یەکێك لە یاوەرانی کەوا دەربارەی شتی دۆزراوە پرسیاری کرد (بزانە لە ناو چ کیسەیەك دانراوە و بە چی گرێ دراوە و دواتر یەك ساڵ

---

[1] – یوسف/ ٢٨،٢٧،٢٦.

[2] – الطرق الحكمية/ سەرچاوەی پێشوو/ل٩.

[3] – الانبياء/٧.

داوای خاوەنەکەی بکە و ئەگەر خاوەنەکەی هات و ئەگەرنا بە ویستی خۆت چی لێ دەکەیت بیکە[1]).

**پێنجەم: نووسین (الکتابة):**

بەڵگە لەسەر بە بەڵگەبوونی نووسین خودای گەورە فەرموویەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ[2]﴾ واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر قەرزتان دا بە یەکتری بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بینووسن و با نووسەرێك بە دادپەروەری لە نێوانتان بنووسێت.

ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر دەربارەی قەرزی بنەڕەتی یان بڕی قەرزەکە یان ماوەی دانەوەی یان هەرشتێکی تر ناکۆکی کەوتە نێوانیان دادوەر کار بە نووسینی دادنووس دەکات.

**شەشەم: سوێند (الیمین):**

بەڵگە لەسە بە بەڵگەبوونی سوێند پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (لەسەر داواکار پێویستە شاهێد بهێنێت و لەسەر نکولیکار پێویستە سوێند بخوات) و لە حاڵەتی نکولیکردن دادوەر کار بە سوێندی داوالێکراو دەکات، و نکولیکردن شاهێدی نییە لەسەر داوالێکراو و دانپێدانان نییە لەلایەن داواکار بەڵکو بەڵگەیەکی لاوازە و بە بەڵگە دانانرێت بەڵام ئەگەر داوالێکراو سوێندی خوارد لایەنی ئەو بە هێز دەبێت، کەواتە شاهێد لەلایەن داواکار و سوێند خواردن لەلایەن داوالێکراو لە جیاتی دوو شاهێدە[3].

---

[1] – سبل السلام/٣/١٢٣.
[2] – البقرة/٢٨٢.
[3] – الطرق الحكمية، سەرچاوەی پێشوو/ل١١٦.

**حەوتەم: زانیاری دادوەر (علم القاضي):**

زانایانی مسولمان دەربارەی وردەکاری ئەو مەسەلەیە بیروڕای جیاوازییان هەیە بەو جۆرەی خوارەوە:

أ- جمهور دەڵێن: دادوەر بۆی نییە تەنها بە پێی زانیاری خۆی بڕیار لەو کێشەیە بدات کەوا خراوەتە بەردەمی چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (من تەنها مرۆڤێکم و ئێوەش کێشەکانتان دەهێننە لای من و لەوانەیە هەندێکتان قەسەزان تر بن لە هەندێك و بەپێی وتەکانی بڕیاری بۆ بدەم).

گوتویانە: بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا دادوەر تەنها بەپێی ئەوەی بیستوویەتی بڕیار دەدات نەك بەپێی زانیاری لە ڕێگەی بینین[1].

ب- هەندێکی تر گوتوویانە لەوانە (ابو یوسف) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێت: دادوەر بۆی هەیە بەپێی زانیاری خۆی بڕیار بدات بە بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ کاتێك (هیندی خێزانی ئەبو سوفیان) بە پێغەمبەری گوت: (ئەبو سوفیان پیاوێکی رەزیلە و ئەوەند بژێوی و خەرجیم پێنادات کەوا بەشی من و منداڵەکانم بکات، و پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەشی خۆت و منداڵەکانت بەپێی داب و نەریت وەربگرە).

کەواتە بەبێ شاهێد و بەبێ دانپێدانانی داوالێکراو و بەپێی زانیاری خۆی لەسەر راستگۆی هیند بڕیاری بۆدا.

بەڵام ئەوەی باوەڕپێکراوە بریتیە لە بۆچوونی (ئەبو حەنیفە) (رەحمەتی خوای لێبێت) کە دەڵێت: لە مافەکانی خودای گەورە دادوەر تەنها بەپێی زانیاری خۆی بڕیار دەدات چونکە مافەکانی خودا لەسەر هاوکاری و لێبوردەیی دامەزراون.

---

[1] – بڕوانە/ المغني لابن قدامة، ٩/٥٤.

# وانەی یانزەهەم

## راڤەکردنی چەند نموونەیەك لە ڕێسا فیقهییە گشتگیرەکان

## شرح نماذج من القواعد الفقهية الكلية

**ڕێسا (القاعدة):**

**لە ڕووی زمانەوانی:** بریتیە لە بناخەی هەر شتێك[1].

**لە زاراوەی زانستی:** بریتیە لە حوکمێکی گشتگیر کەوا لەسەر گشت لایەنەکانی پەیوەست بە خۆی پیادە دەکرێت بە مەبەستی دەرهێنان و وەرگرتنی ئەحکامەکانی ئەو لایەنانە لەو ڕێسایە. بۆ نموونە: ڕێسای (گرێبەستی پووچەڵ هیچ شوێنەوارێکی لێناکەوێتەوە) حوکمێکی گشتگیرە و لەسەر هەر گرێبەستێکی پووچەڵ پیادە دەکرێت و دەڵێن: ئەو گرێبەستە هیچ شوێنەوارێکی لێ ناکەوێتەوە چونکە پووچەڵە، و ئەو بە کرێگرتنە هیچ شوێنەوارێکی لێ ناکەوێتەوە چونکە پووچەڵە ... و هتد.

هونەری ڕێساکان لە ڕاهێنانی مرۆڤ لەسەر بیرکردنەوە و تێگەیشتن لە ئەحکامەکان و بنەماکانی لقەکان (اصول الفروع) زۆر گرنگە، و هەروەها سەبارەت بەو فیقهەی کەوا مەسەلەکانی هەژمار ناکرێن و لقەکانی ڕێك ناخرێن تەنها بە ڕێگەی

---

[1] – لە صیحاح دا هاتووە: ڕێساکانی خانوو بریتین لە بنچینەکەی، ٢/٧٤، و لە فەرهەنگی (المحیط للفیروز ابادی) هاتووە (قواعد الهودج خشبات لربع تحته رکب فیهن) ١/٣٤٠.

ڕێساکان نەبێت، و بە شێوەیەکی تایبەتی بۆ کەسانی یاسایی بە سوودە لە رووی راهێنانی عەقڵیان لەسەر وەرگرتنی ئەحکامەکان لە دەقەکان و دۆزینەوەی چارەسەری بۆ ئەو کێشانەی دەقی روون و راشکاوانەیان لەسەر نییە لە رێگەی رێسا گشتگیرەکان.

زۆر لە زانا پێشینەکانی فیقهی مسولمان گرنگیان بە خوێندنی رێساکان داوە چونکە لە هەردوو بواری زانستی و پیادەکردن گرنگن. کۆمەڵێك لە زانایانی دوای ئەوانە (العلماء المتأخرين) بە تەنها باسی رێسای گشتگیر و گشتییەکانیان کردووە و کتێبێکی سەربەخۆیان دەربارەی داناوە، و دیارترین ئەو زانایانە: (الحافظ ابو الفرج عبدالرحمن بن رجب الحنبلي) لە ساڵی ۷۹۵ك کۆچی دوایی کردووە و کتێبی (القواعد)ی لە فیقهی حەنبەلی داناوە، و زرکشی (بدر الدين محمد بن بهادر الشافعي) (۷٤٥ — ۷۹٤ك): (المنشور في القواعد) و سیوطی (جلال الدين عبدالرحمن) لە ساڵی (۹۱۱ك) کۆچی دوایی کردووە (الاشباه و النظائر في قواعد و فروع فقه الشافعية) و نزیکە بەو جۆرە باس لە رێساکان بکە کەوا تەقلیکردنی بۆ مەزهەبەکەی تیادا نەبێت و (المحقق زين العابدين بن ابراهيم بن محمد بكر) ناسراو بە (ابن نجيم المصري) لە ساڵی (۹۷۰ك) کۆچی دوایی کردووە و کتێبی (الفوائد الزينية في فقه الحنفية)ی داناوە.

## ڕێساکان و ئەو حوکمانەی کەوا لە ڕێساکان دروست دەبن:

### ١- ڕێسا (القاعدة): (یەقین بە گومان لاناچێت – اليقين لايزول بالشك):

یەقین: زانایانی مەنتیق بەوجۆرە پێناسەی دەکەن کەوا بریتیە لە باوەڕبوونێکی یەکلاکەرەوە و جێگیر و هاوتا لەگەڵ واقیع و پێی دەگوترێت (زانست — زانیاری) و ئەگەر هاوتا نەبوو لەگەڵ واقیع پێی دەگوترێت (دووجار نەزانی — جهلا مركبا) و ئەگەر جێگر نەبێت پێی دەگوترێت تەقلید و ئەگەر یەکلاکەرەوە و بنبڕ نەبێت پێی دەگوترێت (گومان) و گومان بریتیە لە لایەنی راجح بۆ بینایی مرۆڤ و لایەنی مرۆڤ دەبێتە مەرجوح و پێی دەگوترێت (خەیاڵ).

**(دوو دڵی – الشك):**

بریتیە لە دووڵبوون لە نێوان بوون و نەبوونی شتێك بەبێ ئەوەی بەڵگەیەك هەبێت كەوا لایەنێك لەسەر لایەنەكەی تر زاڵ بێت.

پێویست نییە لەسەر دادوەر تەنها كار بە یەقین بكات بەڵكو بەسە تەنها بڕیار لەسەر داوالێكراو بدات یان داواكە رەتبكاتەوە ئەگەر گومانی زۆر بوو كەوا پێویستە حوكم بدرێت بەڵام بە هیچ شێوەیەك بۆی نییە بەپێی شەك و دوودڵی حوكم بدات.

**ئەو رێسایە چەند حوكمێكی لێ دروست دەبێت لەوانە:**

أ- ئەگەر كەسێك ون بوو بەجۆرێك كەوا چارەنووسی ژیان و مردنی دیار نەبوو و مردنی گومانی تیادایە و پێش ون بوونی زیندوبوونی گومانی تیادا نەبوو كەواتە یەقینی زیندووبوونی پێش ون بوونی بەو گومانە لاناچێت كەوا دوای ونبوونی دەبارەی مردنی دروست بووە.

بەوپێیە میراتگرانی ئەو كەسە بۆیان نییە میراتەكەی دابەش بكەن و خێزانەكەی بۆی نییە هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێكی تر بكات تاكو بە بەڵگە چارەنووسی بە گەڕانەوە یان بە مردن دەرنەكەوێت كەواتە ئەگەر ئەو چارەنووسەی دەرنەكەوت تاكو چوار ساڵ بەسەر راگەیاندنی ون بوونی تێدەپەڕێت ئەگەر لە باروبۆخەكانی سروشتی ون بوبێت یان دوو ساڵ بەسەر راگەیاندنی ونبوونی تێدەپەڕێت ئەگەر لە باروبۆخەكانی ناسروشتی ونبووبێت وەكو باروبۆخەكانی جەنگ و لافاو و بڵاوبوونەوەی پەتا و زەمینلەرزە ... لەو حالەتە كەسی پەیوەندار و خاوەن بەرژەوەندی بۆی هەیە داوا بۆ دادوەری بەرز بكاتەوە و داوا بكات بڕیار بدرێت بە مردنی و دادوەر بۆی هەیە دوای پرسیاركردن دەربارەی چارەنووسی بە رێگاكانی راگەیاندن و دوای بێ ئومێد بوون لە زانینی ژیانی یان مردنی بڕیار بدات بە مردنی ئەو كەسە، و میراتی بۆ ئەو كەسانە دەگەڕێتەوە كەوا ئێستا لە ژیاندا ماوون و لە كاتی بڕیاردان بە مردنی زیندووبن ئەگەر مردنەكەی بە بەرواری پێشتر تۆمار نەكرابێت پاڵپشت بە بەڵگەی مردنی پێش ئەوەی حوكمی مردنی دەربچێت، هەروەها سەبارەت

به خێزانەکەی لە بەرواری بڕیاردان ، ە مردنی عیددەی مردن بەسەر دەبات ئەگەر مردنەکەی بە بەرواری پێشتر تۆمار نەکرابێت.

ب– ئەگەر کەسێك گومانی هەبوو لەوەی بڕێك پارە قەرزداری یەکێکی ترە و بەپێی ئەو گومانە بڕێك پارەی پێدا لەو حالەتە پارەی بە کەسێك داوە کەوا شیاوی نەبووە و بڕیتیە لە دەستکەوتنی سامان بەبێ هۆ بۆیە پێویستە لەسەر ئەو کەسەی پارەکەی وەرگرتووە پارەکە بگەڕێنێتەوە ئەگەر بە بەڵگەی باوەڕپێکراو نەیتوانی قەرزەکەی بسەلمێنێت چونکە لە بنەڕەتدا هەر کەسێك ئەستۆی پاکە (واتا قەرزدار نییە و تاوانبار نییە) ئەو حالەتەش گومانی تیادا نییە بۆیە بە گومانی لابەلا لاناچێت[1].

**٢- ڕێسای (لە بنەڕەتدا هەر شتێک بەو جۆرە دەمێنێتەوە کە هەبووە – الأصل بقاء ماكان على ماكان[2]):**

واتا ئەگەر حوکمێك بە بەڵگەی شەرعی سەلمێندرا بێت لە بنەڕەتدا ئەو حوکمە وەکو پێشووی دەمێنێتەوە تاکو بە پێچەوانەی دەسەلمێندرێت چونکە مانەوە وەکو پێشوو حالەتێکی بنەڕەتییە و نەبوون حالەتێکی لەلاراهاتووە و بۆ حوکمدان کار بە حالەتی بنەڕەتی دەکرێت و حالەتی ئەگەری و ئیحتیمالی وەرناگیرێت.

**ئەو حوکمانەی لەو ڕێسایە دروست دەبن:**

ئەو ڕێسایە چەندین حوکمی فەرعی لێ دەکەوێتەوە لەوانە:

أ– ئەگەر قەرزدار بانگەشەی ئەوەی کرد کەوا قەرزەکەی داوەتەوە بە خاوەن قەرز و خاوەن قەرزیش نکوڵی لەوە کرد و قەرزداریش هیچ بەڵگەیەکی نەبوو بۆئەوەی باوەڕی پێ بکرێت لەو حالەتە باوەڕ بە سوێندی قەرزدار دەکرێت و داوای شاهێد ناکرێت چونکە قەرزەکە پێشتر لە ئەستۆی قەرزدار بووە و لە بنەڕەتدا وەکو پێشتر

---

[1] – علي حيدر (درر الاحكام شرح مجلة الاحكام) ١/٢٠.

[2] – ابن نجيم، الاشباه و النظائر، المجلة المادة (٥).

دەمێنێتەوە تاکو بەپێی شاهێد و بەڵگە یان دانپێدانانی داواڵێکراو دەسەلمێندرێت کەوا داواکەی راستە.

ب- ئەگەر ئافرەتێکی بە مێرد لە بەردەم دادگا بانگەشەی ئەوەی کرد کەوا مێردەکەی تەلاقیداوە (یان مردووە) و عیددەکەشی بەسەرچووە و داوایکرد مارەبڕین لەگەڵ ئەو کەسە ئەنجام بدات کەوا دەیەوێت ببێتە هاوبەشی ژیانی، لەو حالەتە دادوەر بۆی نییە وەڵامی ئەو داواکارییە بداتەوە بەڵکو پێویستە لەسەری داواکە رەتبکاتەوە بەپێی رێسایی (لە بنەڕەتدا هەر شتێك بەو جۆرە دەمێنێتەوە کەوا هەبووە) ئەگەر ئافرەتی داواکار نەیسەلماند بێت کەوا پیاوەکەی تەلاقیداوە یان مردووە و عیددەی مردنی کۆتایی هاتووە دوای ئەو سەلماندنە دادوەر بۆی هەیە رەزامەندی بدات لەسەر مارەبڕینی لە پیاوێکی تر[1].

**٢- رێسای (لە بنەڕەتدا خەسڵەتە لەلاراهاتووەکان بە نەبوون دادەنرێن - الاصل في الصفات العارضة العدم[2])؛**

خەسڵەتەکانی شتەکان دەکرێنە دوو جۆر:

**جۆری یەکەم: خەسڵەتە بنەڕەتییەکان (الصفات الاصلية)؛** بریتین لەو خەسڵەتانەی کەوا بە شتەکانەوە بەستراونەتەوە و بە دەربڕینێکی تر بریتین لەو حالەتانەی کەوا لە کاتی بوونی خاوەنەکانیان بە بوون دادەنرێن وەکو بێ عەیبی شتی فرۆشراو و سوود وەرگرتن لە شوێنی بە کرێگیراو لە ماوەی بە کرێگرتن.

**جۆری دووەم: خەسڵەتە لەلاراهاتووەکان (الصفات العارضة)؛** بریتین لەو خەسڵەتانەی کەوا بە شتەکانەوە نەبەستراونەتەوە بەڵکو دوای هاتنەدی شتەکان دێنەکایەوە واتا بەپێی ئەو حالەتانە پەیدا دەبن کەوا بەسەر شتەکە دادێن وەکو

---

[1] - الاستاذ منير القاضي/ شرح المجلة/ ١/٥٨.

[2] - ابن نجيم، الاشباه و النظائر/ ١/٩٢.

دەستکەوتنی قازانج لە سەرمایەی کۆمپانیا (شرکة) و روودانی عەیبێك لە ئۆتۆمبێلەکە دوای بەکارهێنانی.

**ئەو حوکمانەی لەو رێسایە دروست دەبن:**

حوکمەکانی ئەو دوو جۆرە خەسڵەتە بەو جۆرەی خوارەوە جیاوازن:

١- خەسڵەتە بنەڕەتییەکان لە بنەڕەتدا بە بوون دادەنرێن، و پێویستە لەسەر ئەوەی بانگەشەی نەبوونی دەکات بەڵگەی هەبێت ئەوەش ئەو حوکمانەی خوارەوەی لێ دەکەوێتەوە لەوانە:

أ- ئەگەر کڕیار بانگەشەی ئەوەی کرد کەوا شتە فرۆشراوەکە عەیبێکی کۆنی هەیە و داوای کرد گرێبەستەکە هەڵبوەشێتەوە و فرۆشیاریش نکولی لەوە کرد کەوا پێش فرۆشتن یان وەرگرتن عەیبی هەبوو بێت پێویستە لەسەر کڕیار بەڵگەی هەبێت چونکە لە بنەڕەتە شتەکە بێ عەیبە و عەیب یەکێکە لە خەسڵەتە لەلاراهاتووەکان و لە بنەڕەتدا ئەو خەسڵەتانە بە نەبوون دادەنرێن.

ب- ئەگەر ئەو کەسەی سامانەکەی بە کرێ داوە داوای کرێی کرد و بە کرێگر کرێیەکەی پێنەدا بە بیانووی ئەوەی سوودی لەو سامانە وەرنەگرتووە چونکە ئەو سامانە لە ماوەی بە کرێگرتن نەگونجاوە بۆ سوود لێ وەرگرتن پێویستە لەسەری بە بەڵگە و شاهێد بسەلمێنێت چونکە داوای شتێکی پێچەوانەی بنەڕەتی کردووە لە بەرئەوەی لە بنەڕەتدا سامانە بە کرێگیراوەکە سوودی لێ وەردەگیرێت.

٢- لە بنەڕەتدا خەسڵەتە لە لاراهاتووەکان نیین بۆیە پێویستە لەسەر ئەو کەسەی بانگەشەی بوونی ئەو خەسڵەتانە دەکات بە بەڵگە و شاهێد بسەلمێنێت و ئەوەش چەند حوکمێکی لێ دروست دەبێت لەوانە:

أ- ئەگەر فرۆشیار داوای پارەی لە کڕیار کرد و کڕیار بانگەشەی ئەوەی کرد کەوا شتە فرۆشراوەکەی وەرنەگرتووە و فرۆشیاریش بانگەشەی ئەوەی کرد کەوا وەریگرتووە و قسەی کڕیارەکە بەسەند دەکرێت و پێویستە لەسەر فرۆشیار شاهێدی هەبێت چونکە وەرگرتن خەسڵەتێکی لەلاراهاتووە و لە بنەڕەتدا نییە.

ئەگەر کەسێك جێڵێكی كڕی بێت و دواتر داوایكرد بێت گرێبەستەكە هەڵبوەشێندرێتەوە چونكە شیری نییە و بانگەشەی ئەوەشی كرد كەوا بەو مەرجەی كڕیوە كە شیری هەبێت و فرۆشیاریش نكوڵی لەو مەرجە كرد و قسەی فرۆشیار پەسەند دەكرێت چونكە مەرجی ناوبراو خەسڵەتێكی لەلاراهاتووە كەوا لە بنەڕەتدا نییە[1].

٤- ڕێسای (لە بنەڕەتدا ڕووداو دەدرێتە پاڵ نزیكترین كاتەكانی – الاصل اضافة الحادث الى اقرب اوقاته)[2]:

مەبەست لە ڕووداو ئەو شتەیە كەوا نییە و دواتر دێتە بوون و ئەگەر دەربارەی كاتی ڕوودانی و هۆكارەكەی جیاوازی هەبوو و ئەگەر درانە پاڵ كاتی پێشووی نەسەلمێندرا بێت دەدرێتە پاڵ نزیكترین كات چونكە بوونی لە كاتی دوور گومانی تیادایە، و بوونی لە نزیكترین كاتەكانی گومانی تیادا نییە چونكە هەر كەسێك گومانی وابێت لە كاتی دوور ڕوویداوە و نكوڵی ناكات لە بوونی لە كاتی نزیك.

**ئەو حوكمانەی لەو ڕێسایە دروست دەبن:**

ئەو ڕێسایە چەند حوكمێكی لێ دەكەوێتەوە لەوانە:

أ- ئەگەر ئافرەتێكی مێرد مردووی و تەلاقدراو بانگەشەی ئەوەی كرد كەوا پیاوەكەی لە نەخۆشی سەرەمەرگ سێ بە سێ تەلاقیداوە و لەبەرئەوە (تەلاقی ڕاكردن – الطلاق الفار)ە و ئەو ئافرەتەش تاكو ئێستا لە عیددە دایە بۆیە بەپێی ڕای تەواوی زانایانی فیقهی ئیسلامی ئەو ئافرەتە میرات دەگرێت، بەڵام ئەگەر میراتگرانی پیاوەكە بانگەشەی ئەوەیانكرد كەوا لە حاڵەتی تەندروستی تەڵاقی داوە نەك لە

---

[1] – هەروەها ئەگەر هاوبەش یان زیادكەر بانگەشەی ئەوەی كرد قازانجی نەكردووە قسەی كەی پەسەند دەكرێت چونكە لە بنەڕەتدا قازانج نییە چونكە خەسڵەتێكی لەلاراهاتووە و هەروەها ئەگەر گوتی تەنها بەوە نەبێت قازانجی نەكردووە چونكە لە بنەڕەتدا زیادە نییە، ابن نجیم: الاشباه و النظائر ١/٩٣.

[2] – ابن نجیم: الاشباه و النظائر ١/٩١.

نەخۆشی سەرەمەرگ و تـەلاقی راکـردن نییـە بۆیـە ئافرەتەکـە مـیرات ناگرێـت: لـەو مەسەلەیە قسەی ئافرەتەکە پەسەند دەکرێت و پێویستە لەسەر میراتگران شاهێدیان هەبێت چونکە تەلاقدان رووداوێکە و دوای ئەوەی نەبووە و هاتوتـەبوون و رووداویـش دەدرێتەن پالْ نزیکترین کاتەکانی کە بریتیە لە کاتی نەخۆشی سەرەمەرگ[1].

ب- ئەگەر ئەو کەسـەی بـۆی هەیـە لـە گرێبەسـتی فرۆشـتن پەشـیمان ببێتـەوە بانگەشـەی ئـەوەی کـرد کـەوا لـە مـاوەی پەشـیمان بوونـەوە گرێبەسـتەکەی هەلّوەشاندۆتەوە، و ئـەوەی تـر بانگەشـەی ئـەوەی کـرد کـەوا هەلّوەشـانەوە دوای کۆتایی هاتنی ماوەی پەشیمان بوونـەوە بـووە لـەو حالەتـە قسـەی ئـەوەی کۆتـایی پەسـەند دەکرێـت چـونکە هەلّوەشـاندنەوە رووداوێکـە و دەدرێتـە پـالْ نـزیکترین کاتەکانی و بەوە دادەنرێت کەوا دوای بەسەرچوونی ماوەکە روویداوە بۆیـە پێویسـتە لەسەر لایەنی یەکەم داواکەی بە شاهێد بسەلمێنێت[2].

ج- ئەگـەر میراتگـران بانگەشـەی ئـەوەیانکرد کـەوا مردووەکـەیان لـە نەخۆشـی سەرەمەرگ سامانەکانی بەخشیوە بۆیە دەچێتە خانـەی وەسـیەت و نابێـت لـە یـەك لەسەر سێی میراتەکە زیاتر بێت و ئەو کەسەی سامانەکەی پیّ بەخشراوە بانگەشەی ئەوەی کرد کەوا لە کاتی تەندروستی سامانەکەی پیّ بەخشیوە بۆیە ناچێتە خانـەی وەسیەت لەو حالەتە قسەی میراتگران پەسەند دەکرێت بەپێی رێسـای (رووداوەکـان دەدرێنە پالْ نزیکترین کاتەکانیان) و پێویستە لەسەر ئـەو کەسـەی سـامانەکەی پـیّ بەخشراوە بە شاهێد داواکـەی بسـەلمێنێت و ئەگـەر نـەیتوانی بەخشـینەکان دەچـنە خانەی وەسیەت و بڕیارەکانی وەسیەتییان لەسەر پیادە دەکرێن[3].

---

[1] – علی حیدر، درر الحکام ١/٢٥، منبر القاضي، سەرچاوەی پێشوو ١/٦٨.

[2] – بن نجیم، سەرچاوەی پێشوو.

[3] –دادگـای تـەمییز لـە بڕیـاری ژمـارە ٢٥٣/دەسـتەی گشـتی یەکـەم/ ٩٦٣ لـە ١٩٧٤/٣/٣ – بلاوکراوەی دادوەری ع١ س٥ ل١٤٦ بڕیاریداوە بە وەی :کەوا کەسی تووش بوو بە شـێرپەنجە جەرگ بە نەخۆشـی مـردن دادەنرێـت ئەگـەر دوای ئـەوەی نەخۆشـیەکەی زیـادی کـرد پـێش ←

**٥- رێسای (ناچاری مافی یەکێکی تر پووچەڵ ناکاتەوە - الاضطرار لایبطل حق الغیر[1]):**

ناچاری بریتیە لەوەی کەوا مرۆڤ ناچار بکرێت لەسەر ئەنجامدانی کارێکی قەدەغەکراو بەجۆرێك کەوا بۆی هەیە ئەو کارە قەدەغەکراوە ئەنجام بدات.

ناچاری دوو جۆرە: ناوخۆیی (خودی) و دەرەکی: ناچاری ناوخۆیی وەکو برسێتی کەوا پاڵ بە کەسی برسییەوە دەنێت بۆ ئەوەی سامانی یەکێکی تر بخوات بەبێ مۆڵەت، و ناچاری دەرەکی وەکو زۆرلێکردن بریتیە لەوەی کەوا بە ناڕەوا زۆری لە کەسێك بکرێت لەسەر ئەنجامدانی کارێك بەبێ ڕەزامەندی خۆی.

زانایانی حەنەفی زۆرلێکردنیان کردۆتە دوو جۆر: ناچاری و ناناچاری (ملجيء و غیر ملجيء): چونکە ئەگەر زۆرلێکردن بە هەڕەشەکردن بە کوشتن یان لە کارخستنی ئەندامەکان بێت یان ئەو لێدانە بێت کەوا مەترسی مردن یان لە دەستدانی ئەندامێکی لێدەکرێت بریتیە لە زۆرلێکردنی ناچاری و تەواو و کاریگەری لەسەر ڕەزامەندی دەبێت و ئەو کەسە ئازاد نییە.

بەڵام ئەگەر هەڕەشەی حەبسکردنی سادە یان گرێدان یان لێدانێکی ئەو های لێ بکات کەوا نەبێتە هۆی مردن یان لەدەستدانی ئەندامێك پێی دەگوترێت زۆرلێکردنی ناتەواو (ناناچاری) و ڕەزامەندی ناهێڵێت بەڵام ئازادی هەر بەردەوامە چونکە زۆرلێکراو دەتوانێت بەرگەی ئەو ئازارە بگرێت کەوا هەڕەشەی لێ دەکرێت.

یەکێکی تر لەو زانایانە جۆری سێیەمیشی زیاد کردووە کە بریتیە لەو

---

تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر نەخۆشییەکەی مرد بێت یەکسانە لەسەر جێگا بوو بێت یان نا و ئەگەر نەخۆش لە ماوەی نەخۆشییەکەی بەڵگەنامەیەکی نووسی بێت و بەڵگەنامەکە هیچ بەروارێکی فەرمی لەسەر نەبێت بە نووسین لە ماوەی مرد دادەنرێت بەو پێیەی ڕووداوەکە دەدرێتە پاڵ نزیکترین کاتەکانی و ئەگەر لە بەڵەنامەی ناوبراو دانی نابێت بە قەرز بۆ یەکێك لە میراتگرانی لەو حاڵەتە قەرزەکە تەنها یەك لەسەر سێی میراتگرات دەگرێتەوە.

[1] – مجلة الاحكام العدلیة/ ماددەی (٣٣).

زۆرلێکردنەی ڕەزامەندی و ئازادی لە بەین نابات بۆ نموونە ئەگەر هەڕەشەی لێ بکات بە حەبسکردنی باوکی یان منداڵەکەی و هەر خزمێکی تری[1].

ئەگەر ئەو کارەی بە هۆی ناچارەی ڕێگەی پێداوە پەیوەندی بە مافی کەسێکی ترەوە هەبوو ئەو مافە بە هۆی ناچاری پووچەڵنا بێتەوە بەڵکو خاوەنی ئەو مافە بۆی هەیە پابەند بێت بە مافەکەی خۆی، بۆ نموونە ئەگەر مرۆڤێك بە هۆی ناچاری سامانی یەکێکی تری لە ناوبرد ئەوا ئەو ناچارییە نابێتە هۆی ئەوەی ئەو کەسە بەرپرسیار نەبێت لە لەناوبردنی ئەو سامانە بەڵکو پێویستە لەسەری قەرەبووی ئەو سامانە بکاتەوە جاهەرجۆرە لەناوبردنێك بێت.

**ئەو حوکمانەی لەو ڕێسایە دروست دەبن:**

ئەو ڕێسایە چەند حوکمێکی لێ دەکەوێتەوە لەوانە:

أ– ئەگەر کەسێك برسی بێت و دووچاری لەناوچوون بوویێتەوە بۆی هەیە بەپێی پێویستی خۆی و بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی خواردنی کەسێکی تر هەڵگرێت بەڵام پێویستە لە سەری وێنەی ئەو سامانە بگەڕێنێتەوە ئەگەر سامانی وێنەدار بێت و ئەگەر سامانی نرخدار بێت پێویستە لەسەری نرخەکەی بدات و بە هۆی ناچاری لە قەرەبووکردنەوەی ئەو سامانە ڕزگاری نابێت چونکە ناچاری مافی یەکێکی تر پووچەڵ ناکاتەوە.

ب– ئەگەر کەسێك کەشتییەکی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بە کرێگرت بێت بە مەبەستی گواستنەوەی کەل و پەلەکان بە ڕێگەی دەریایی لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر و ئەگەر ماوەی بە کرێگرتن بەسەرچوو بێت و کەشتییەکەش هەر لە ناو دەریا بێت و بە کرێگرتنەکە هەر بەردەوامە لەبەر ناچاری تاکو کەشتییەکە دەگاتە کەناری دەریا بەڵام ئەو ناچارییە مافی خاوەن کەشتی پووچەڵ ناکاتەوە لە وەرگرتنی کرێی ئەو ماوەیەی لە سێ ڕۆژەکە زیاتر بووە بەڵکو پێویستە لەسەری کرێی ئەو ماوەیەش

---

[1] – كشف الاسرار علی اصول البزدوي ٤/١٥٠٣، تكملة فتح القدير ٩/٢٣٣/ و دواتر.

بدات.

ج– ئەگەر کەسێك زۆری لە یەکێك کردبێت لەسەر لەناوبردنی سامانی یەکێکی تر و زۆرلێکراو لە ناوی برد بێت ئەوا بەو زۆرلێکردنە مافی خاوەنی سامانەکە لە بەین ناچێت بەڵکو بۆی هەیە داوای قەرەبووکردنەوە لەو کەسە بکات کەوا زۆری لێ کردووە ئەگەر زۆرلێکردنی ناچاری بوو بێت و ئەگەرنا ئەو کەسە بەر تۆڵە دەبێت کەوا ڕاستەوخۆ سامانەکەی لە ناوبردووە.

د– ئەگەر شوفێرێك لەبەر بوونی منداڵێك لە ناوەڕاستی شەقام ناچار بوو ئاراستەی خۆی بگۆڕێت و بووە هۆی ڕوخانی دیواری خانوویەکی سەر شەقام و تێك چوونی باخچەی ئەوماڵە ئەوا ئەو ناچارییە نابێتە مایەی بەخشینی لە قەرەبووکردنەوەی ئەو باخچەیە بەڵکو پێویستە لەسەری قەرەبووی زیانلێکەوتوو بکاتەوە[1].

٦- ڕێسای (ڕێگەپێدانی شەرعی بەرتۆڵەبوونی لێ ناکەوێتەوە – الجواز الشرعي ينافي الضمان):

وا دەردەکەوێت کەوا ئەو ڕێسایە لەگەڵ ڕێسای (ناچاری مافی یەکێکی تر پووچەڵ ناکاتەوە – الاضطرار لايبطل حق الغير) تێکدەگیرێت چونکە کاری کەسی ناچار ڕێگە پێدراوە بەڵام بەرپرسیارییەتی شارستانی لێ دەکەوێتەوە بەڵام ئەو تێکگیرانە دەبێتە هۆی کۆکردنەوەی هەردوو ڕێساکە بە یەکەوە چونکە دووجۆرە ڕێگە پێدانی شەرعی هەن: یەکێکیان بریتیە لەو ڕێگەپێدانەی لەسەر هۆکارێکی شەرعی بنەڕەتی دامەزراوە و دووەمیان بریتیە لە ڕێگەپێدانی جیاکەرەوەی شەرعی کەوا لەسەر عوزر و مۆڵەت پێدان دامەزراوە، و ڕێگەپێدان لە حالەتی ناچاری بریتیە لە ڕێگەپێدانی شەرعی جیاکەرەوە لە بەربوونی عوزری ناچاری کەواتە ئەو جۆرە

---

[1] – تكملة فتح القدير /٩/٢٤٣ و دواتر.

ڕێگەپێدانە بەرپرسیارییەتی لێ دەکەوێتەوە هەروەك لە نموونەکانی ڕێسای پێشوو دیارە.

بەڵام ئەو ڕێگەپێدانەی بەرپرسیارییەتی لێ ناکەوێتەوە بریتیە لەو ڕێگەپێدانەی لەسەر مافێکی جێگیر دامەزراوە.

**ئەو حوکمانەی لەو ڕێسایە دروست دەبن:**

ئەو ڕێسایە چەند حوکمێکی لێ دەکەوێتەوە لەوانە:

أ- هەر کەسێك چاڵێکی لەناو موڵکێکی تایبەتی خۆی دوور لە ڕێگای گشتی هەڵکەندبێت و ئەگەر شتێك کەوتە ناوی و لەناوچوو ئەو کەسە بەرپرسیار نییە لەبەرئەوەی کارەکەی مافێکی شەرعییە چونکە بۆی هەیە دەستکاری سامانی تایبەتی خۆی بکات نەك کارێکی ناچاری بێت، و دەستدرێژی نەکردۆتە سەر مافی کەسێکی تر.

ب- مرۆڤ بۆی هەیە لە دژی هەر هەڵمەتبەرێك (هێرش و دوژمنکاری و ستەم) بەرگری لە گیانی خۆی یان گیانی یەکێکی تر یان ناموسی خۆی یان ناموسی یەکێکی تر یان سامانی خۆی یان سامانی یەکێکی تر بکات چونکە خودای گەورە فەرموویەتی ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾ واتا: هەر کەسێك دەستدرێژی کردە سەر ئێوە بە هەمان شێوە بەرپەچی بدەنەوە و پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (برای خۆت سەربێخە جا چ ستەمکار بێت یان ستەملێکراو) سەرخستنی ستەمکار بریتیە لە قەدەغەکردنی لە ستەم کە بریتیە لە بەرگریکردن لە کاری شەرعی و ڕەوا بەڵکو هەندێك لە زانایان گوتوویانە ئەو کارە واجیبە و بە تایبەتی بەرگریکردن لە ناموس[1]. کەواتە ئەگەر تەنها بە کوشتن نەبێت بەرپەچی کەسی هێرشبەر و دەستدرێژیکار نەدەدرایەوە لەو حاڵەتە کوشتنی نەقیصاص و بە خوێنبایی و نە کەفارەتی لێ ناکەوێتەوە.

[1] - بگەڕێوە بۆ (شرح التحرير لشيخ الاسلام زكريا مع حاشية الشرقاوي) طبعة دار الكتب/ ٢/٤٢٠ و دواتر.

بـەرگری شـەرعی لـە شـەریعەتی ئیسـلامی و یاسـاکانی دەسـتکرد کـارێکی ڕێگەپێدراوە بەڵکو هەندێك جار پێویستە و لەناوچوونی گیانی یان سامانی یـان هـەر ئەندامێکی دەستدرێژیکار لە ئەنجامی ئەو بەرگریکردنە بەرپرسیارییەتی شارسـتانی و تاوانی لێ ناکەوێتەوە ئەگەر لە سنووری بەرگریکردن دەرنەچێت.

**٧- ڕێسای (سزای ئەو تاوانانەی سزایان دیاریکراوە بە گومانەکان لادەچن – الحدود تسقط بالشبهات[1]):**

ئەو ڕێسایە لە فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ وەرگیراوە لـە وانـە فەرموویـەتی: (تـا دەتوانن حەددەکان لە مسولمانان دووربخەنەوە و ئەگەر تەنها ڕێگایەك هەبوو ئازادی بکەن چونکە ئەگەر پێشەوا لە لێبوردن هەڵە بکات باشـترە لـەوەی لـە سـزادان هەڵـە بکات[2]).

**ئەو حوکمانەی لەو ڕێسایە دروست دەبن:**

ئەو ڕێسایە زۆر حوکمی لێ دەکەوێتەوە لەوانە:

أ- ئەگەر تاوانی زینا بە چوار شاهێد یان بە دانپێدانانی زیناکەری بالیغ و عاقیلّ و ئازاد لە بەردەم دادگا چوار جار نە سـەلمێندرا بێـت سـزای دیـاریکراو بـۆ ئـەو تاوانـە جێبەجێ ناکرێت و لەو حالەتە ئەگەر دادوەر بە ڕێگەی بەڵگەیەکی تر باوەڕی نـەهات کەوا تاوانەکە ڕوویداوە بڕیار دەدات بە بێتاوانی ئەو کەسە و ئەگەر بە پێی بەڵگەیەکی تر باوەڕی هات بە ڕوودانی تاوانەکە بۆی هەیە بڕیار بدات بە سزای تـەمبێکردن وەکـو حەبس.

ب- ئەگەر دزی لە نێوان ژن و مێرد ڕوویدا بێت و دزلێکراو داوای لەسەر دزیکـەر تۆمار کرد بێت دادوەر بۆی نییە بڕیـار بـدات بـە دەسـت بـڕین بـە پێـی فـەرموودەی خودای گەورە ﴿السارق و السارقة فاقطعوا أيـديهما...﴾ تەنانـەت ئەگـەر تاوانەکـەش

[1] – ابن نجيم الاشباه و النظائر ١/١٦١.

[2] – نيل الاوطال شرح منقي الاخبار من احاديث الامام محمد بن علي بن محمد الشوكاني ٧/١١٨.

سەلمێندرا بێت و کۆلگە و مەرجەکانیشی هاتبنەدی چونکە گومانی حەلال بوون هەیە لەبەرئەوەی ژن و مێرد لە ژیانی هاوبەش و خۆشەویستی بەشدارن و لە خۆشی و ناخۆشی یەکتر بەشدارن و هەروەها بڕیاری دزیکردن لە نێوان نەوەکان و باوان و نێوان هاوبەشەکان بەو جۆرەیە.

ج- هەر کەسێك بەپێی مارەبڕینی ناتەواو و واتا بیروڕای جیاواز هەبێت دەربارەی راستی و دروستی وەکو مارەبڕینی کاتی و مارەبڕینی ژن بە ژنە و مارەکردنی ژنی پێنجەم لە عیددەی ژنی چوارەمی سێ بە سێ تەڵاقدراو و دواتر لەگەڵ ئەو ژنە جووت بوو بێت یەکسانە زانی بێتی ئەو مارەبڕینە دروست نییە یان نا بە بۆچوونی تەواوی زانایانی فیقهی حەددی لەسەر نییە و رەچەڵەکیش دەچەسپێت و پێویستە لەسەر پیاوەکە مارەیی هاوشێوەیی بدات و پێویستە لەسەر ئافرەتەکە عیددە ببینێت و دادوەر بڕیار دەدات بەجیابوونەوەیان لە یەکتری.

بەڵام ئەگەر مارەبڕینەکە بەبێ جیاوازی دروست نەبێت وەکو مارەبڕینی دوو خوشك بە یەکەوە لەو کاتەی ئەگەر لەگەڵی جووت بوو بێت و نەیزانی بێت دروست نییە بە هەمان شێوە حەددی لەسەر نییە و شوێنەوارەکانی ناوبراوی لێ دەکەوێتەوە.

بەڵام ئەگەر زانی بێتی دروست نییە بە بۆچوونی کۆمەڵی زانایان جووت بوون بە تاوانی زینا دادەنرێت[1] و لەو حاڵەتە گومان نییە و جووت بوون شوێنەوارە ناوبراوەکانی لێ ناکەوێتەوە.

---

[1] - واتا جگە لە حەنەفی کەوا دەڵێت: بە هەمان شێوە لەو حاڵەتە گومان هەیە چونکە لە رووی شێوەیب گرێبەست هەیە.

**٨- رێسای (ناڕەحەتی و ئەزیەت هۆکارێکە بۆ ئاسانکاری – المشقة تجلب التیسر):**

ئەو رێسایە واتا ئەو ئاستەنگەی لە هەر شتێك دێتە بەردەم مرۆڤ هۆکارێکە بۆ ئاسانکاری و سووککردنی ئەو شتە بەوپێیە تەنگانە یان ناڕەحەتی هۆکارێکە بۆ ئاسانکاری لە دانانی حوکمەکان وەکو جیاکردنەوە لە رێسا گشتییەکان و ئەو جیاکردنەوەیە لەلایەن زانایانی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی پێی دەگوترێت (بەچازانین – الاستحسان) کەوا یەکێکە لە سەرچاوەکانی حوکمە فیقهییەکانی شەرعی هەروەکو بە جیاکراوە دەڵێن (مۆڵەتدان – رێگەپێدان– الرخصة).

ئەو ئاسانکارییە و گۆڕانە لە قورسەوە بۆ ئاسان بە مەبەستی لابردنی ناڕەحەتی قورئانی پیرۆز لە زۆر ئایەت دانی پێداناوە لەوانە خودای گەورە فەرموویەتی ﴿يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ [1]﴾ واتا: خودای گەورە ئاسانکاری بۆ ئێوە دەوێت و کاری قورسی بۆ ئێوە ناوێت، و خودای گەورە فەرموویەتی ﴿مَا يُرِيدُ اللّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ وَلَكِن يُرِيدُ لِيُطَهَّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾المائدة/٦. واتا: خودای گەورە نایەوێت ئێوە تووشی ناڕەحەتی بکات، بەڵام دەیەوێت پاکتان بکاتەوە و بەهەرەی خۆی بەسەرتان تەواو بکات بە ئومێدی ئەوەی سوپاسگوزار بن. بەو جۆرە ئاستەنگ یەکێکە لە هۆکارەکانی سووککردنی ئەو حوکمانەی لەسەر مرۆڤ پێویستکراون و زانایانی فیقهی عوزرەکانی سووککردنیان کردوونەتە حەوت بەش و بریتین لە: نەداری و.زۆرلێکردن و نەخۆشی و گەشت و لەبیرچوون و نەزانی و کەم و کوڕی ماددی یان مەعنەوی لە مرۆڤی راسپێردراو و سەرچاوەی ئەو حەوت عوزرە بریتیە لە رێسای (ناڕەحەتی و ئەزیەت هۆکارێکە بۆ سانکاری – المشقة تجلب التیسر) بۆیە ئەگەر یاسادانەر لە کاتی یاسادانان تێبینی ئەو حەوت عوزرە نەکات ئەو کارەی دەبێتە هۆی سەپاندنی شتێك بە سەر مرۆڤەکان کەوا لە توانایاندا نەبێت.

---

[1] – البقرة/١٨٥.

ئیسلام ئەو پرۆگرامە ناچارییە لە حوکمەکان بە شێوەیەکی بنبڕ رەتدەکاتەوە چونکە یەکێك لە بنەماکانی ئیسلام بریتیە لە درووخستنەوەی ئاستەنگ و نارەحەتی لە حوکمەکان.

هەروەها ئەگەر موجتەهید لە کاتی وەرگرتنی حوکمەکان لە (بەڵگەی درێژ – أدلة التفصيلية) رەچاوی رێگاکانی ئاسانکاری نەکات ئەوا ئەو حوکمانەی وەریگرتوون پێچەوانەی بنەچینەکانی شەریعەتی ئیسلامن چونکە ئەرکێکی قورسی سەپاندووە.

شایەنی ئاماژە پێکردنە رێسای (نارەحەتی و ئەزیەت هۆکارێکە بۆ سانکاری – المشقة تجلب التيسر) لە رووی ناوەرۆك و واتا هاوتایە لەگەڵ رێسای (ئەگەر کارەکە کەوتە تەنگانە فراوان دەکرێت – اذا ضاق الامر اتسع[1]).

**ئەو حوکمانەی لەو رێسایە دروست دەبن:**

ئەو رێسایە چەند حوکمێکی لێ دەکەوێتەوە لەوانە:

أ– رێگەدان بە گرێبەستی بە کرێگرتن لەگەڵ ئەوەی پێچەوانەی رێسا گشتییەکانە چونکە بابەتی گرێبەست بریتیە لە سوود وەرگرتن و ئەویش لە کاتی گرێبەست بوونی نییە و بەپێی رێسا گشتییەکان فرۆشتنی شتێکی نەبوو پووچەڵە بەڵام بە کرێگرتن بە دەق رێگەی پێدراوە لەبەر رەچاوکردنی بنەمای (نارەحەتی و ئەزیەت هۆکارێکە بۆ سانکاری – المشقة تجلب التيسر).

ب– هەر کەسێك شتێکی کڕی بێت و نەیبینی بێت سەرپشکە تاکو دەبینێت ئەگەر بیەوێت قەبولی دەکات و ئەگەر بیەوێت رەتی دەکاتەوە و ئەو سەرپشك بوونە پێی دەگوترێت (سەرپشکی بینینی – خيار الرؤية) و نهێنی نەمانی سەرپشکی بە بینینی نموونەی شتە فرۆشراوەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەوا ئەگەر کڕیار سەرپشك بێت تاکو گشت شتە فرۆشراوەکە دەبینێت زۆر لە مامەڵەکەکانی کڕین و فرۆشتن دەوەستن بە تایبەتی لەو شتانەی زۆرن و لەو

---

[1] – المجلة المادة (١٨) و ئەو رێسایە بەو دەستەواژەیەش هاتووە (الامر ان ضاق اتسع).

حاڵەتەی کەوا شتە فرۆشراوەکە لە وڵاتی یان شاری کڕیان نەبێت ئەوە دەبێتە هۆی ناجێگیری مامەڵەکان و ناڕەحەتی و ئاستەنگ و بارگرانی.

ج- ڕێگەدان بە فرۆشتنی وەرگرتنەوە و بریتیە لە فرۆشتنی شتێك بەو مەرجەی هەر کاتێك فرۆشیار پارەکەی گەڕاندەوە کڕیاریش شتە فرۆشراوەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە و ئەو جۆرە فرۆشتنە سەبارەت بە سوود وەرگرتنی کڕیار لەو شتە دروستە و سەبارەت بەوەی هەر دوولایەنەکە دەتوانن هەڵی بوەشێننەوە گرێبەستێکی پووچەڵە و سەبارەت بەوەی کڕیار ناتوانێت بیفرۆشێت بە یەکێکی تر وەکو رەهن وایە و زانایانی حەنەفی ڕێگەیانداوە بەو جۆرە فرۆشتنە بە پێی رەچاوکردنی ئەو ئەزیەت و ناڕەحەتییەی لە ئەنجامی وەرگرتنی قەرز لە کەسانی سەرمایەدار و رازی نەبوونی ئەو کەسانە بە دانی قەرز بەبێ سوود و بە سەیرکردنی قەدەغەکردنی ریباو و پووچەڵی گرێبەستی ریبا ئەو زانایانە پەنایان بردووە بۆ فەتوادان بە ڕێگەدان بەو جۆرە فرۆشتنە بە مەبەستی رەچاوکردنی ڕێسای ناوبراو.

د- دانانی تەلاق: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (زیاتر لە هەر شتێکی حەلال خودای گەورە رقی لە تەلاقە[1]).

لە ئیسلامدا بە مەبەستی رەچاوکردنی بنەمای (ناڕەحەتی و ئەزیەت هۆکارێکە بۆ سانکاری – المشقة تجلب التيسر) دانیناوە بە تەلاق لەگەڵ ئەوەی لە ناو حەلالەکان خودای گەورە زیاتر رقی لە تەلاقە و تەلاق خراپە و پێویستە چەندین مەرجی تیادا بهێتەدی لەوانە: نەگونجان و جیاوازی و لە یەکترنەچوونی خوو و ئارەزووی ژن و مێرد یان دەست تێوەردانی کەس و کار لە کاروباریان یان ڕوودانی ناکۆکی و دووبەرەکی بەردەوام لە نێوانیان یان خراپی باری ئابووری کەوا بە زۆری یەکێکە لە هۆکارە

---

[1] – رواه ابو داواد و ابن ماجة و صححه الحاكم و اقره الذهبي و يقول انه على شرط مسلم سبل السلام ٢/٢٢١.

سەرەکییەکانی تێکدانی ژیانی هاوسەرێتی یان ناپاکی هاوسەری یان جیاوازی تەمەن یان جیاوازی لە ئاستی رۆشنبیری و پێگەی کۆمەڵایەتی یان لاوازی هۆشیاری ئاینی یان منداڵ نەبوون، یان ئەو نەخۆشییەی کەوا رێگرە لەبەردەم بەجێگەیاندنی ئەرکەکانی هاوسەرێتی یان نەزانی ژن و مێرد و تێنەگەیشتنیان لە ژیانی هاوسەرێتی و دانەنانی رێز و پیرۆزی وەکو پێویست بۆ ئەو ژیانە یان جگە لەوانە سەدان هۆکاری تێکدانی پەیوەندی هاوسەرێتی و لەبەرئەوە رێگەدراوە بە تەلاق بۆئەوەی ژن و مێرد لەو ناڕەحەتی و تەنگانەیە بەردەوام نەبن کەوا دووچاری هەردووکیان یان یەکێکیان بۆتەوە بە رێگەی لابردنی ناڕەحەتی و پەنابردن بۆ ئاسانکاری بەو جۆرەی لە دەقی قورئانی پیرۆز هاتووە ﴿ .... يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ...﴾ {البقرة/١٨٥} کەواتە ئەگەر رێگە بە تەلاق نەدرابایە پێویست دەبوو کەوا ژن و مێردەکە رق و قینە بەرامبەر بە یەکتری بەکار بهێنن و رق و قینە دڵی هەردووکیان دەخوارد و هەریەکەیان لە جیاتی خۆشەویستی هەوڵی دەدا بۆئەوەی فێڵێك لە بەرامبەرەکەی بکات تاکو لە دەستی رزگار بێت.

**٩- رێسا (القاعدة): (هەر کەسێک پەلە لە شتێک بکات پێش ئەوەی کاتی خۆیدا بێت بەبێ بەش بوون لەو شتە سزا دەدرێت – من استعجل الشيئ قبل اوانه عوقب بحرمانه[١]):**

ئەو رێسایە بە چەند دەستەواژەیەکی تر هاتوو لەوانە (من استعجل ما اخره الشرع يجازى برده) و هەروەها (من استعجل شيئا قبل اوانه و لم تكن المصلحة في ثبوته عوقب).

---

[١] – السيوطي الاشباه و النظائر/ ل١٦٩، ابن نجيم، سەرچاوەی پێشوو، ١/١٩٠ گۆڤاری ماددەی (٩٩) و ئەو رێسایە لەلای (سيوطي) بەو جۆرەیە (من استعجل الشيئا قبل آوانه عوقب بحرمانه).

**ئەو ئەحکامەنەی لەو ڕێسایە دروست دەبن:**

ئەو ڕێسایە چەند ئەحکامێکی فیقهی فەرعی لێدەکەوێتەوە لەوانە.

أ‌- ئەگەر کەسێك ئەو کەسەی کوشت بێت کەوا میراتی لیٚ دەگرێت یەکسانە ئەنجامدەری سەرەکی بوو بێت یان هاوبەشی تاوانەکە بوو بێت یان شاهێدی بە درۆی دابێت و شاهێدییەکەی بووبێتە هۆی دەرچوونی بڕیاری لەسێدارەدان لەسەر ئەو کەسە و لەو حالەتە بکوژەکە بە سزای دیاریکراو بۆ تاوانی کوشتن سزا دەدرێت و لە میراتی کوژراوەکەش بێبەش دەکرێت وەکو سزایەکی پاشکۆیی بۆ سزای تاوانی کوشتن چونکە لەو حالەتە بەوە تۆمەتبار دەکرێت کەوا مەبەستی ئەو کەسە لە کوشتن دەستکەوتنی میراتی کەسی کوژراو بووە و ئەو بێبەش بوونەش لە دەقی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ ئاماژەی پێکراوە کە فەرموویەتی: (بکوژ میرات ناگرێت) بەڵام بنچینەی ئەو دەقە و حیکمەت لە حوکمی ئەو دەقە و فەلسەفەی دانانی ڕێسای ناوبراو بریتیە لە پاراستنی گیانی کەسانی بێتاوان و بوار نەدان بە تاوانبار کەوا سوود لە تاوانەکەی وەربگرێت.

ب‌- هەر کەسێك سامانی بۆ یەکێك وەسیەت بکات ئەوا دوای مردنی ئەو کەسە خاوەندارێتی سامانەکە بۆ کەسی وەسیەت بۆ کراو دەگوازرێتەوە، کەواتە ئەگەر وەسیەت بۆ کراو وەسیەتکارەکەی بکوژێت سەرەڕای سزای بنەڕەتی تاوانبارەکە بە سزایەکی پاشکۆیش سزا دەدرێت کە بریتیە لە بێبەشکردن لە وەسیەتەکە، چونکە وا لێك دەدرێتەوە کەوا مەبەستی لە کوشتن دەستکەوتنی وەسیەتەکە بووە بۆیە بەبیٚ بەشکردن لە وەسیەت سزا دەدرێت.

ج‌- هەر کەسێك لە نەخۆشی سەرەمەرگ خێزانەکەی تەلاق دابێت بەبیٚ ڕەزامەندی ئافرەتەکە و بەبیٚ ئەوەی ئافرەتەکە کەم و کوڕی هەبێت بەوە تۆمەتبار دەکرێت کەوا مەبەستی لە تەلاقدانی هاوسەرەکەی بێبەشکردن بێت لە میرات بۆیە پێی دەگوترێت (تەلاقی ڕاکردن – طلاق فار) و زانایانی فیقهی ئیسلامی کۆکن لەسەر

ئەوەی کەوا تەلاقەکە دەکەوێت بەڵام میرات دەگرێت بەڵام دەربارەی لەدەستچوونی ئەو مافە سەبارەت بە ماوەی نێوان تەلاق و مردن مردنەکە رای جیاوازییان هەیە.

حەنەفی گوتویەتی[1]، ئەگەر پیاوەکە مرد و ئافرەتەکە هەر لە عیددە دابوو میرات دەگرێت.

حەنبەلی گوتویەتی[2]، ئەگەر ئافرەتەکە مێردی نەکردبێتەوە میرات دەگرێت ئەگەر مێردی کردبێتەوە مافی میراتی نامێنێت.

جەعفەری گوتویەتی[3]، ئەگەر مێردی نەکردبێتەوە و ساڵێك بە سەر تەلاق تێنەپری بێت میرات دەگرێت، ئەگەرنا مافی میراتی نامێنێت.

مالیکی[4]، و ئیباضیة گوتویانە[5] بە شێوەیەکی گشتی میرات دەگرێت چونکە هۆکارەکە هەر ماوەتەوە و بە بەسەرچوونی ماوە ئەو مافە لەدەست ناچێت.

شافیعی [6] بۆچوونێکی پێچەوانەی بۆچوونی هەر یەکێك لەو مەزهەبانەی هەیە.

**١٠- رێسا (القاعدة)ی (ئیجتهاد بە ئیجتهادی هاوشێوەی خۆی هەڵناوەشێتەوە – الاجتهاد لاینقض بمثله)[7]**

ئەو رێسایە واتا ئەحکامەکانی ئیجتیهادی پێشوو بە ئیجتیهادی دواتر هەڵناوەشێنەوە یەکسانە ئەو ئیجتیهادەی دووەم لەلایەن هەمان موجتەهید کرابێت یان لەلایەن موجتەهیدێکی تر، کەواتە ئەگەر موجتەهیدێك لە مەسەلەیەك ئیجتیهادی کرد بێت بەپێی لێکدانەوەی راست و دروستی خۆی حوکمێکیدا بێت ئەوا دروست

---

[1] – المبسوط للسرخسي/ ٦/١٥٤.

[2] – المغني لابن قدامة ٦/٣٣٠.

[3] – الكافي للكليني ٦/١٣٢.

[4] – المنتقى شرح موطأ ٤/٨٥.

[5] – شرح النيل و شفاء العليل ٨/١٧٦.

[6] – المهذب لابي اسحاق ٢/٥٢.

[7] – السيوطي، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٣.

نییە ئەو حوکمەی پووچەڵ بکرێتەوە، چونکە ئیجتیهادی دووەم لە رووی بە هێزی و بەڵگایەتی وەکو ئیجتیهادی یەکەمە، چونکە رێگەدان بە پووچەڵکردنەوەی ئیجتیهادێك بە ئیجتیهادێکی تر دەبێتە مایەی تێکچوونی ئەحکامەکان و نارێکی مامەڵەکان، و جێگیرنەبوونی مافەکان، و دەبێتە هۆی ئازار و زیانگەیاندن بە تاکەکانی کۆمەڵگە و لەگەڵ ئەوە زانایان کۆکن لەسەر ناوەڕۆکی ئەو رێسایە، چونکە لە سەردەمی یاوەران وا رێکنەکەوتووە کەوا یاوەرێك ئیجتیهادی یاوەرێکی تر هەڵبوەشێنێتەوە بۆ نموونە (ئیمامی ابو بکر – ﷺ) لە زۆر لە مەسەلەکان بە لێکدانەوەی خۆی حوکمیدا و (ئیمامی عمرﷺ) لەو مەسەلانە بە پێچەوانەی ئەو حوکمیداوە بەڵام حوکمی (ئیمامی ئەبو بەکر)ی هەڵنەوەشاندۆتەوە و هەروەها تەواوی یاوەران بەوجۆرە بوون و حوکمی هیچ یەکێك لە یاوەران بە ئیجتیهادی ئەوەی دواتر هەڵنەوەشاوەتەوە.

گشتییان کۆکن لەسەر ئەو پرۆگرامە فیقهییە دەربارەی هەڵنەوەشانەوەی حوکم بە ئیجتیهادێکی تر. تێبینی دەکرێت کەوا ئەو رێسایە پەیوەستە بەو حوکمانەی کەوا دادوەر بەپێی ئیجتیهادی خۆی دەریان دەکات ئەگەر موجتەهید بێت یان بەپێی ئیجتیهادی ئیمامەکانی دەریان دەکات ئەگەر تەقلیدی ئیمامێکی کرد بێت.

**ئەو حوکمانەی لەو رێسایە دروست دەبن:**

ئەو رێسایە زۆر حوکمی لێ دەکەوێتەوە لەوانە:

أ– دروست نییە ئەو حوکمانەی دادوەر دەریان دەکات لەلایەن دادوەرێکی تر هەڵبوەشێندرێنەوە هەروەها دادوەر بۆی نییە لە یەك مەسەلە لە حوکمی پێشووی پاشگەز ببێتەوە کە لەو مەسەلەیە دەری کردووە تەنها ئەگەر بە بەڵگە دەرکەوت کەوا هەڵەی کردووە.

ب– وەك چۆن موجتەهید بۆی هەیە دادوەریش بۆی هەیە بە پێچەوانەی حوکمی یەکەم لە مەسەلەی یەکەم بڕیار لە مەسەلەی دووەم بدات.

ج- ئەو حوکمەی بەپێی ئیجتیهادی خۆی دەری کردووە ئەگەر پێچەوانەی دەقی روون و راشکاوانە یان ئیجماع یان قیاسی ئاشکرا بوو هەڵدەوەشێتەوە چونکە هەر یەکێك لەو بەڵگانە بەهێزترن لە ئیجتیهاد و هەروەها ئەگەر دەرکەوت حوکمەکە هەڵەیە هەڵدەوەشێتەوە بۆ نموونە ئەگەر بەپێی بەڵگەی ساختە حوکمدرا بێت و دواتر دەرکەوێت ساختەیە.

**١١- رێسای (القاعدة)؛ (بەرهەم و بەروبوومی سامان لە بەرامبەر گرەنتییە - الخراج بالضمان):**

الخراج: بریتیە لەو شتەی کەوا لە سامانی مرۆڤ دەردەچێت واتا بەرهەم و قازانجی سامانەکە وەکو شیر و بەرهەمی ئاژەڵ، و کرێی خانووبەرە، و بەرهەمی زەوی و هەر جۆرە سوودێکی سامانی گوێزەرەوە و نەگوێزەرەوە.

الضمان: بریتیە لە پابەند بوونی کەسێك بە شتێك لە کاتی لە ناوچوونی ئەو شتە و دانانی ئەو شتە بە بەشێك لە سامانەکەی بەوپێیە (ضمان) بریتیە لە پێویستکردنی دانەوەی شتێك لە ئەستۆی کەسێك ئەگەر مەرجەکانی تیادا هاتەدی، و بە قەرەبووکردنەوەی ئەو سامانەش دەگوترێت کەوا لەناوچووە کەواتە هەر کەسێك گرەنتی شتێك بکات لە ناوچوون بۆی هەیە سوودی لێ وەربگرێت لە بەرامبەر ئەو گرەنتییەی لە کاتی لەناوچوونی پێویست بووە لەسەری کەواتە مادام زیانەکەی بۆ ئەو بگەڕێتەوە پێویستە سوودەکەشی بۆ ئەو بگەڕێتەوە.

**ئەو حوکمانەی لەو رێسایە دروست دەبن:**

ئەو رێسایە چەند حوکمێکی فیقهی فەرعی لێ دەکەوێتەوە لەوانە:

أ- ئەگەر کڕیار شتە فرۆشراوەکەی بە هۆی عەیبێك گەڕاندبێتەوە و بۆ ماوەیەك بەکاری هێنا بێت پێویست نییە لەسەری کرێیەکەی بدات چونکە ئەگەر پێش گەڕاندنەوە لە دەستی ئەو لەناوچووبایە بەشێك بوو لە سامانی کڕیار واتا زەرەکەی لە ئەو دەکەوت و فرۆشیار لە ئەنجامی ئەو لەناوچوونە هیچ زەرەی

نەدەكرد[1].

ب- ئەگەر سامانێك بە خەسڵەتێكی مەرغوب فرۆشرا بێت و دەركەوێت كەوا فرۆشراوەكە ئەو خەسڵەتەی تیادا نییە كڕیار سەرپشكە ئەگەر بیەوێت گرێبەستەكە هەڵدەوەشێنێتەوە و ئەگەر بیەوێت بە گشت پارەی باسكراو هەڵی دەگرێت و ئەگەر هەڵوەشاندنەوەی هەڵبژارد و فرۆشراوەكەی بۆ كەسی فرۆشیار گەڕاندنەوە فرۆشیار بۆی نییە داوای گەڕاندنەوەی بەرهەمی ئەو ماوەیەی شتە فرۆشراوەكە لە كڕیار بكات چونكە ئەگەر ئەو شتە لەناو چوویایە لە كڕیار دەچوو بۆیە لە بەرامبەر ئەو زەرە بەرهەمەكە بۆ ئەوە.

**١٢- رێسای (ئەو شتەی بە پێچەوانەی قیاس سەلمێندراوە شتەكانی تری لەسەر قیاس ناكرێت - ماثبت علی خلاف القیاس فغیره لایقاس علیه ):**

واتا ئەو شتەی بە دەق رێگەی پێدراوە بە پێچەوانەی قیاس (واتا پێچەوانەی رێسا گشتییەكان) ئەوە تەنها ئەو شتانە دەگرێتەوە كەوا لە دەقەكە هاتوون و حوكمەكەی لەسەر شتێكی تری هاوشێوەی خۆی پیادە ناكرێت مادام لە دەقەكە ئاماژە بەوە نەكرا بێت كەوا حوكمەكە ئەویش دەگرێتەوە.

**ئەو حوكمانەی لەو رێسایە دروست دەبن:**

ئەو رێسایە زۆر حوكمی فیقهی فەرعی لێ دەكەوێتەوە لەوانە:

أ- فرۆشتنی بەرهەمی درەختەكان پێش دەركەوتنیان دروست نییە بە قیاسكردن لەسەر دروستكردنی شتێك (الاستصناع) چونكە دەستكارەكان بە پێچەوانەی قیاس بە دەقێكی تایبەتی سەلمێندراون و شتەكانی هاوشێوەی خۆیان لەسەر قیاس ناكرێن.

---

[1] - ابن نجیم، سەرچاوەی پێشوو ١/١٨٢، گۆڤاری ماددەی (٨٥).

ب- هاوتەنیشتی - لە یەکتر کڕینەوە - (الشفعة) بە پێچەوانەی قیاس سەلمێندراوە چونکە بریتیە لەوەی کەوا کەسێك بە زۆر مولکی یەکێکی تر دەکاتە مولکی خۆی بە پێچەوانەی بنەمای شەریعەت و بنەمای ڕەزامەندی وەکو خودای گەورە فەرموویەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ وَلاَ تَقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾النساء/٢٩.

مادام وایە هیچ شێوازێکی تری خاوەندارێتی بەبێ ڕەزامەندی لەسەر شوفعە قیاس ناکرێت هەروەها گۆڕینەوە و بەرامبەرایەتی لە شوفعە نییە چونکە مافێکی پوخت و تایبەتە و مافە تایبەتەکان قیاسییان لەسەر ناکرێت[1].

### ١٢- ڕێسای (زیان بە کەس مەگەیەنە و لە بەرامبەر زیانلێکەوتنت زیان بە کەسی بەرامبەر مەگەیەنە - لا ضرر و لا ضرار[2]):

ئەو ڕێسایە لەسەر زمانی پێغەمبەرﷺ هاتووە و واتا: دروست نییە بۆ هیچ کەسێك زیان بە سامانی یان جەستەی یان ناموسی یان ناوبانگی یەکێکی تر بگەیەنێت، چونکە ئەو کارە ستەمە و ستەمیش لە ڕووی عەقڵ ناشیرینە و لە شەرع و یاساش ڕێگە پێنەدراوە و لە ڕووی مەنتیقی کارێکی باش نییە و لە داب و نەریتیش ڕەتکراوەتەوە ئەوەیە بریتیە لە ناوەڕۆك و واتای (لاضرر) بەڵام مەبەست لە (لاضرار) بریتیە لەوەی کەوا ئەو کەسەی یەکێك زیانی پێگەیاندووە بۆی نییە لە بەرامبەر ئەو زیانە زیان بە بەرامبەرەکەی بگەیەنێت بەڵکو پێویستە لەسەری سەردانی دادگا بکات و زیانەکە و ئەو لایەنە دیاری بکات کەوا بووەتە هۆی زیانەکە و داوای قەرەبووکردنەوەی دادپەروەرانە بکات بەجۆرێك کەوا هاوسەنگ بێت لەگەڵ ئەو زیانەی ڕوویداوە بەو جۆرە هاوسەنگی ئابووری دەگەڕێتەوە بۆ کاتی پێش ڕوودانی

[1] - منير القاضي شرح المجلة ١/٧٤ چاپخانەی عانی ١٩٤٩.

[2] - رلوه أحمد بن ماجة سبل السلام ٣/١١٠ و ئەو فەرموودەیە لە ماددەی (١٩) لە (مجلة) هاتووە.

زیانەکە و ئەگەر رێگە بدرێت بەو کەسانەی کەوا لە ئەنجامی رەفتارەکانی کەسانی تر زیانیان پێکەوتووە لە بەرامبەر زیانەکەیان زیان بە بەرامبەریان بگەیەنن دەبێتە هۆی ئاژاوە و بەرەڵایی و تێکچوونی سیستەم و ئەو کارە لە رووی شەرع و یاسا و عەقڵ و داب و نەریت کارێکی ناشیاوە.

**ئەو حوکمانەی لەو رێسایە دروست دەبن:**

ئەو رێسایە چەند حوکمێکی فیقهی فەرعی لێ دەکەوێتەوە لەوانە:

أ- ئەگەر یەکێك سامانی یەکێکی تری لە ناو برد بێت خاوەن سامان بۆی نییە سامانی ئەو کەسە لەناوببات بەڵکو پێویستە لەسەری سەردانی دادگا بکات بۆ ئەوەی بە رێگەی دادگایی زیانەکەی قەرەبوو بکرێتەوە.

ب- ئەگەر یەکێك مافی هاوتەنیشتی (ارتفاق)ی بۆ زەوییەکەی هەبێت خاوەنی زەویەکەی بۆی نییە قەدەغەی بکات لە بەکارهێنانی ئەو مافەی وەکو مافی تێپەربوون و مافی ئاوەڕۆ و مافی ئاو خواردنەوە ... چونکە ئەو کارە دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بەو کەسە و زیانیش بەبێ پاساو لە شەریعەت و یاسا رەتکراوەتەوە.

**١٤- رێسای (ئەو شتەی وەرگرتنی حەرامە دانی بە کەسێکی تریش حەرامە -- ما حرم اخذه حرم اعطاؤه[1]):**

واتا ئەگەر وەرگرتنی شتێك لە خەڵکی قەدەغەکرا بێت بە هەمان شێوەی دانی ئەو شتە بە یەکێکی تریش قەدەغەکراوە واتا بۆ هەریەك لەو کەسەی وەریگرتووە و ئەوەی داویەتی حەرامە و هەردووکیان لە لایەنی شارستانی لەو رەفتارە بەرپرسیارن و هەردووکیان وەکو بەشداربوو لەو تاوانە سزا دەدرێن.

---

[1] – (مجلة) ماددەی (٢٤).

**ئەو حوكمانەی لەو ڕێسایە دروست دەبن:**

ئەو ڕێسایە چەند ئەحكامێكی فیقهی فەرعی لێ دەكەوێتەوە لەوانە:

أ- ئەگەر یەكێك بەرتیلی بە یەكێك دابێت ئەوا بەرتیل خۆر و بەرتیلدەر هەردووكیان بە شێوەیەكی یەكسان لە رووی تاوانی بەرپرسیارن.

ب- هەر كەسێك دراوێكی ساختە كرد بێت و بە یەكێكی تری دابێت بۆ ئەوەی لە بازاڕ رەفتاری پێ بكات و كەسی وەرگر بزانێت ئەو دراوە ساختەیە ئەوا هەردووكیان بەرپرسیارن و شایەنی سزادانن.

١٥- ڕێسای (هەر شتێك بەپێی داب و نەریت قەدەغەكراو بێت وەكو ئەو شتەیە كەوا بە شێوەیەكی راستەقینە قەدەغەكرا بێت - الممتنع عادة كالممتنع حقيقة[١]):

واتای ئەو ڕێسایە: ئەو شتەی بەپێی داب و نەریت ڕوودانی لە شتە قەدەغەكراوەكان بێت ئەوا وەكو ئەو شتەیە كەوا بە هەمان شێوە ڕوودانی قەدەغەیە.

ئەو شتەی ڕوودانی كارێكی مەحاڵ بێت ئەوا لە حوكمدان كار بە داب و نەریت دەكرێت و سەیری بوونی ئەو شتە بە شێوەیەكی كرداری ناكرێت.

**ئەو حوكمانەی لەو ڕێسایە دروست دەبن:**

ئەو ڕێسایە چەندین ئەحكامی فەرعی لێ دەكەوێتەوە لەوانە:

أ- ئەگەر كەسێكی ناسراو بە هەژاری بانگەشەی ئەوە بكات كەوا بڕە پارەیەكی زۆری بە یەك جار بە قەرز داوە بە فولان كەس ئەوا پێویستە لەسەر دادوەر داواكەی رەت بكاتەوە چونكە ئەو شتەی بانگەشەی دەكات لە رووی داب و نەریت قەدەغەیە و هەروەها ئەگەر بانگەشەی ئەوە بكات كەوا فولان كەس ئەو موڵكەی زەوتی كردووە یان ئەوەندە مەڕ و ماڵاتی زەوتكردووە داواكەی رەت دەكرێتەوە چونكە ئەو كەسە هیچ شتێكی نییە كەوا لێی زەوت بكرێت.

---

[١] - (مجلة) ماددەی (٢٨).

ب- ئەگەر کەسێك تۆمەتبارکرا بە ئەنجامدانی تاوانێك لە کات و شوێنێکی دیاریکراو بۆ نموونە ئەگەر تۆمەتبار کرا کەوا لە ڕۆژی ١٩٨٧/٥/٢٥ تاوانێکی لە پارێزگای بەغدا ئەنجامداوە و تۆمەتبار لەو کاتی لە دەرەوەی عیراق بوو بێت یان لە پارێزگایەکی تر بوو بێت ئەوا تاوانەکە لە ڕووی داب و نەریت قەدەغەیە هەر چەندە لە ڕووی عەقڵ ڕوودانی گونجاو بێت و ئەو شتەی لە ڕووی داب و نەریت قەدەغە بێت لە ڕووی عەقڵیش قەدەغەیە بۆیە پێویستە لەسەر دادوەر بڕیار بدات بە بێتاوانی تۆمەتبار لەو تاوانە.

١٦- ڕێسایی (گۆڕانی حوکمەکان بەپێی گۆڕانی کات و سەردەم نکوڵی لێ ناکرێت - لاینکر تغیر الاحکام بتغیر الزمان):

ناوەڕۆکی ئەو ڕێسایە بریتیە لەوەی کەوا حوکمە لاوەکییەکانی ڕوودداوەکان ئەگەر لەسەر داب و نەریت دامەرزابن واتا پەیوەست بن پەیوەندییەکانی مرۆڤایەتی لە ڕووی دارایی یان کارگێری یان ڕۆشنبیری یان تەندروستی یان ئابووری یان سەربازی یان هەر شتێکی لەو جۆرە ئەوا ئەو حوکمانە بەپێی گۆڕانی داب و نەریت و خواستەکانی ژیان دەگۆڕێن.

بەڵام ئەو حوکمانەی لە دەقە بنەڕەتییەکان هاتوون وەکو خودای گەورە فەرموویەتی ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ﴾النساء/١١. واتا: خودای گەورە فەرمانتان پێدەکات کەوا لە منداڵەکانتان هەر کوڕێك بە قەد دوو کچ میرات وەربگرێت، یان ئەحکامە بیروباوەڕییەکان وەکو باوەڕهێنان بە خودا و هەر شتێکی پەیوەست بە باوەڕهێنان بە خودا یان حوکمەکانی پەیوەست بە خواپەرستییەکان وەکو واجیب بوونی نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج یان ئەحکامە خوڕەوشتییەکان وەکو ڕاستگۆیی و دەستپاکی و دڵسۆزی.

کەواتە ئەو حوکمانە بەپێی گۆڕانی کات و سەردەم ناگۆڕێن و حوکمی جێگیرن و پێشکەوتنی ژیان کاریان تیادا ناکات چونکە بە شێوەیەکی بنبڕ لە لایەن خودای زانا

و دانا بۆ رابردوو و ئێستا و داهاتوو بڕیار دراوون.

**ئەو حوکمانەی لەو ڕێسایە دروست دەبن:**

ئەو ڕێسایە چەند حوکمێکی لێ دەکەوێتەوە لەوانە:

أ- هەندێك لە زانایان وەکو ئیمامی شافیعی (رەحمەتی خوای لێبێت) بە مەرجی داناوە لە مارەبڕین دوو شاهێدی دادپەروەر واتا گوناهی گەورەیان ئەنجام نەدابێت[1] و بەردەوام نەبن لەسەر گوناهە بچووکەکان ئامادەی مارەبڕین بن ئەو حوکمە هەرچەندە بۆ سەردەمی شافیعی گونجاو بوو چونکە سەردەمی چاکە و لە خواترسی بوو بۆ سەردەمێك ناگونجێت کەوا کەسی دادپەروەر زۆر دەگمەن بێت بۆیە زانایانی فیقهی دواتر فەتوایانداوە کەوا دروستە دوو شاهێدی تاوانباریش لە مارەبڕین ئامادەبن.

ب- یەکێك لەو حوکمانەی کەوا زانایانی فیقهی تابیعی بۆ بەرژەوەندی گشتی بڕیاریانداوە بریتیە لە نرخدانان بۆ خواردەمەنییەکان و جگە لە خوادەمەنییەکان دوای ئەوەی لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ ئەو کارە قەدەغەبوو چونکە لە مەدینەی پیرۆز نرخی مادده خواردەمەنییەکان بەرزبوویەوە و خەڵکی گوتیان ئەی پێغەمبەری خوداﷺ نرخ لە مەدینە بەرز بۆتەوە و نرخمان بۆ دابنێ (واتا بڕیار بدە بە دانانی نرخ لەسەر مادده خواردەمەنییە پێویستەکان) و فەرمووی (خودا نرخدانەرە و رۆزی دەبڕێت و رۆزی دەدات و من تەمەننا دەکەم بگەمە خودا و یەکێك لە ئێوە داوام لێ نەکات کەوا من لە خوێن یان سامان ستەمم لێ کردبێت[2]).

---

[1] - گوناهە گەورەکان وەکو زینا و کوشتن و پاشەمەلە باسکردن و دەستپیسی و درۆ و بەلام گوناهە بچووکەکان وەکو سەیرکردنی ئافرەتی نامەحرەم بۆ پیاوان و سەیرکردنی پیاوی نامەحرەم بۆ ئافرەتان و دەرخستنی عەورەت و هەر کارێکی لەو جۆرە.

[2] - بڕوانە/ نیل الاوطال ٥/٢٢ سبل السلام ٣/٢٥.

دەقـی ئـەو فەرموودەیـە وادەگەیـەنێت کـەوا پێغەمبـەرﷺ دیـاریکردنی نرخـی قەدەغـەکردووە و ئـەو دیاریکردنـەی بـە سـتەم زانیـوە و هۆکـاری بەرزبوونـەوەی نرخـەکان لـەو کـاتی بریتـی نـەبوو لـە چاوچـنۆکی و باڵادەستی بازرگانـەکان بـەڵکو هۆکـاری کـەمی وەبـەرهێنان و بەرهـەم بـوو و ئـەو بەرزبوونەوەیـە لەسـەر بنچـینەی نمایشکردن و داواکاری بوو و لەو کاتی داواکردن لە بەرهەم هێنان زیاتر بوو.

ئـەوەیان لەسـەردەمی پێغەمبـەرﷺ بـەڵام کاتێـك سـەردەمی شـوێنکەوتەکان (تابعین) هات دەروونەکان گۆڕانکارییان بەسەردا هات و خەڵکی چاوچنۆك و ستەمکار بوون و لایەنی ماددی بەسەر لایەنی مەعنەوی زاڵبوو و خەڵکی کەرەستە پێویستەکان و پێداویسـتییە بنچـینەییەکانیان بـە نرخێکـی زیـاتر لـە بـەهای راسـتەقینە لـە بەرهەمێنەرەکان دەکڕی و لەبەرئەوە زانایانی تابیعی لەوانە (سعیدی کوڕی موسەیەب و رەبیعەی کوڕی عبدالرحمن و یەحیای کوڕی سعیدی ئەنساری) جگـە لەوانـە پێیـان وابوو پێویستە نرخ لەسـەر کەرەسـتەکان دابنرێـت چـونکە ئـەو دیاردەیـە سـتەمێکە دەرهـەق کەسـانی بەکاریـەر دەکرێـت و هـەر کاتێـك سـتەمیش لـە هـەر سـەردەمێك دەرکەوت پێویستە رێگەی لێ بگیرێت و لێرەدا لە دەرەنجامی گۆڕانی بارودۆخەکان و دەروونەکان حوکمی پێشووی سەردەمی پێغەمبەرﷺ کە بریتی بوو لە دانـەنانی نـرخ گۆڕا بۆ ئەو حوکمەی لەسەردەمی تابیعین دەرچوو[1].

۱۷- رێسای (لە کاتی بوونی دەق ئیجتیهاد رۆڵی نییە – لامساغ للاجتهاد في معرض النص):

نـاوەڕۆکی ئـەو رێسـایە بریتیـە لـەوەی کـەوا موجتەهیـد و دادوەر و مـوفتی یـان یاسادانەر بۆیان نییە لە مەسەلەیەکی شەرعی لێکدانەوە بکـەن کـەوا دەقـی لەسـەرە چونکە ئیجتیهاد تەنها لەو مەسەلانە دەکرێت کەوا دەقی لەسەر نییە.

ئـەوەی دیـارە ئەوەیـە واتـای رێسـاکە بـەڵام ئـەو رێسـایە لـە رووی تێگەیشـتن و

---

[1] - بڕوانە – کێتبەکەمان (فلسفة الشريعة)، ل١٧٧ و دواتر.

پیادەکردنی بەو جۆرە بێ سنور و رەها نییە چونکە دەقەکان لە رووی گەیاندنی حوکمەکان دوو بەشن:

أ- ئەو دەقانەی بە شێوەی بنبڕ حوکمەکان دەگەیەنن وەکو فەرموودەی خودای گەورە ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ .....﴾النور/٢، وەکو فەرموودەی پێغەمبەرﷺ (بزن و مەڕ ئەگەر ژمارەیان چل تاکو سەد و بیست سەر بوو یەك سەر دەبێتە زەکات و ئەگەر لە سەد و بیست تاکو دوو سەد بوون دوو سەر دەبنە زەکات) بەجۆرێك کەوا دەقی یەکەم واتای ئەوە دەگەیەنێت کەوا سزای زینا سەد قامچییە و بە شێوەی بنبڕ ئەو حوکمە دەگەیەنێت و مەجالی ئیجهتیهاد و سووککردنی تیادا نییە و هەروەها دەقی دووەم واتای بنبڕ دەگەیەنێت سەبارەت بەوەی کەوا هەر کەسێك ئەو ژمارە مەڕ و بزنەی هەبێت و ساڵێکی بەسەردا سوڕابێتەوە پێویستە لە ژمارەی یەکەم یەك سەر و لە ژمارەی دووەم دوو سەر بدات بە کەسانی شایستە وەکو ئەو زەکاتەی پێویستە لەسەری، و ئەو دەقە بنبڕە و مەجالی لێکدانەوە و ئیجتیهادی تیادا نییە.

ب- ئەو دەقانەی بە شێوەی گومانی (ظني) حوکمەکان دەگەیەنن: ئەگەر دەقەکە بە شێوەی گومانی حومەکەکان بگەیەنێت بەجۆرێك کەوا زیاتر لە یەك واتا بگەیەنێت یان واتای زیاتر لە یەك حوکم بگەیەنێت لەو کاتەی پێویستە ئیجتیهاد بکرێت بۆ گەیشتن بە واتای مەبەست لە دەقەکە، بۆ نموونە خودای گەورە فەرموویەتی ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَاثَةَ قُرُوءٍ ......﴾{البقرة/٢٢٨} و (قرء) وشەیەکی هاوبەشە لە نێوان خاوێنی و سوری مانگانە و ناکرێت مەبەست هەردوو واتاکە بێت بە یەکەوە چونکە دژی یەکترن بۆیە پێویستە یان مەبەست خاوێنی بێت هەروەکو هەندێك لە زانایانی فیقهی وای بۆچوون یان مەبەست پێی سوری مانگانە بێت هەروەکو زانایانی تر وای بۆچوونە و هەر یەکێك لەوانە باوەڕی وایە کەوا مەبەست لە دەقەکە ئەو واتایەیە بە ڕێگەی ئیجتیهاد.

دوای ئەو روونکردنەوەیە واتای رێساکە بەو جۆرەیە، دروست نییە ئیجتیهاد بکرێت بۆ گەیشتن بە حوکمی مەسەلەیەك ئەگەر دەقێك هەبێت کەوا بە شێوەیەکی بنبڕ حوکمی ئەو مەسەلەیە بگەیەنێت بەڵام ئەگەر واتای دەقەکە گومانی بێت ئیجتیهاد دروست بێت بەڵکو بۆ دیاریکردنی واتای مەبەست و حوکمی مەبەست لەو دەقە ئیجتیهاد پێویستە.

**١٨- رێسای (ئەو شتەی بووەتە داب و نەریت وەکو ئەو شتەیە کەوا بە مەرج دانراوە – المعروف عرفا كالمشروط شرطا[1])**

ناوەرۆکی ئەو دەقە: واتا ئەو کاروبارانەی لە مامەڵەکان لە نێوان خەڵکی بوونەتە داب و نەریت و وەکو ئەو کاروبارانەن کەوا لە کاتی ئەنجامدانی ئەو مامەڵانە بە مەرج دانراون بۆ نموونە ئەگەر گرێبەستێك لەسەر مەسەلەیەك بەسترا و بەپێی داب و نەریت هەردوو لایەنەکانی گرێبەستەکە چەند ئەرکێکان لەسەر پێویست بێت پێویستە جێبەجێیان بکەن چونکە مادام بوونەتە داب و نەریت وەکو ئەو ئەرکانەن کەوا بە شێوەیەکی روون و راشکاوانە لە گرێبەستەکە ئاماژەیان پێکراوە.

**ئەو حوکمانەی لەو رێسایە دروست دەبن:**

ئەو رێسایە چەند حوکمێکی لێ دەکەوێتەوە لەوانە:

أ– ئەگەر کەسێك سامانی یەکێکی بەکار هێنابێت و ئەو سامانە بۆ بەرهەم هێنان ئامادەکرا بێت پێویستە لەسەری کرێی هاوتا بدات چونکە داب و نەریت وایە ئەو سامانەی بۆ بەکارهێنان ئامادەکراوە تەنها بە کرێ بەکار دێت[2].

ب– ئەگەر کەسێك لە شارێکی تر جگە لە شاری خۆی برێك دانەوێڵەی بە یەکێك فرۆشت بێت و بە پێی داب و نەریت کرێی گواستنەوە لەسەر کڕیارە و لایەنەکان لە کاتی بەستنی گرێبەست لەسەر ئەوە رێك نەکەوتبن پێویستە کار بە داب و

[1] – المجلة المادة (٤٣).

[2] – منیرالقاضي/ سەرچاوەی پێشوو ١/١٠٦.

نـەریت بکرێـت چـونکە وەکـو مـەرج وایـە و وەکـو ئـەو مەرجەیـە کـەوا بـە گرێبەسـتەکەوە بەسـتراوەتەوە و پێویسـتە جێبـەجێ نـەکرێت ئەگـەر لەگـەڵ خواستی گرێبەستەکە ناکۆك نەبێت بۆیە پێویستە کار بە داب و نەریت بکرێت و ئەو ئەرکـە جێبـەجێ بکرێـت کـەوا لەسـەر یـەکێك لـە لایەنـەکانی گرێبەسـتەکە پێویستە.

**١٩- رێسای (ئەگەر بەربەست لەگەڵ پێویستی تێکگیرا بەربەست پێشتر دەکەوێت – اذا تعارض المانع و المقتضی یقدم المانع[1]):**

ناوەڕۆکی ئەو رێسایە بریتیە لەوەی کەوا ئەگەر دوو شت لەگەڵ یەکتری تێکگیران یەکێکیان هۆکارێك بوو کەوا وای دەخواست کارێك بە هەنـد وەربگیرێـت و دووەمیـان بەربەستێك بـوو وای دەخواسـت کارەکـە بـە هەنـد وەرنـەگیرێت بەربەسـتەکە پـێش دەکەوێت چونکە حوکمدان لەسەر هۆکار دروست نییە مادام مەرجەکانی نەهاتبێتەدی و بەربەستەکانیشی دوورنەخرابێتەوە.

**ئەو حوکمانەی لەو رێسایە دروست دەبن:**

ئەو رێسایە چەند حوکمێکی فەرعی لێ دەکەوێتەوە لەوانە:

أ- ئەگەر قەرزدار ئـەو سـامانەی فرۆشـت بێـت کـەوا لەلایـەن خـاوەن قـەرز وەکـو بارمەتە (رهـن) دانـراوە گرێبەسـتەکە جێبـەجێ ناکرێـت بـەڵکو لەسـەر مۆڵـەتی خـاوەن قـەرز دەوەسـتێت چـونکە پەیوەسـتە بـە مـافی ئـەو و ئەگـەر بـە گرێبەستێکی جێبەجێکراو دابنرێت گڵدانەوەی سامانەکە نامێنێت کـەوا یەکێکـە لە حوکمەکانی رەهن کەواتە خاوەندارێتی قەرزدار بەسەر ئەو سامانەی بە رەهن دانراوە هۆکارێکی پێویسـتە بـۆ رێگـە پێـدان و دەسـتکاریکردنی ئـەو سـامانە و پەیوەسـت بـوونی ئـەو سـامانە بـە مـافی خـاوەن قـەرز بەربەسـتە لـە بـەردەم

---

[1] – المجلة المادة (٤٦).

جێبەجێکردنی گرێبەستەکە لە فیقهی ئیسلامی کەواتە پێش هۆکاری پێویستکردن دەکەوێت.

شایەنی ئاماژە پێکردنە رەهن لە فیقهی ئیسلامی بەریەستە بەڵام لە یاسا و فیقهی رۆژئاوا بەریەستی رەفتارکردن نییە.

ب- دوای مردن میراتی مردوو بۆ میراتگرانی دەگەرێتەوە بە رای زۆربەی زانایانی فیقهی لەو حالەتەشی کەوا کەسی مردوو قەرزدار بێت بەڵام قەرز بەریەستە لەبەردەم دەستکاریکردنی ئەو میراتە پێش دانەوەی قەرزەکان لەلایەن میراتگران یان لەلایەن هەر کەسێکی تر یان پێش مۆڵەتی خاوەن قەرزەکان یان دەست هەڵگرتنیان لە قەرزەکەیان و گشت رەفتارێکی میراتگران بەستراونەتەوە بە مۆڵەتی خاوەن قەرزەکان یان دانەوەی قەرزەکان لەو میراتە و خاوەنداریتی میراتگران هۆکارێکی پێویستە بۆ دەستکاریکردنی میراتگران بەڵام قەرزی پەیوەست بە میرات بەریەستە لەبەردەم رەفتارکردن بۆیە بەریەستەکە پێش هۆکاری پێویستکردن دەکەوێت و ئەگەر خاوەن قەرزەکان رەفتارەکەیان رەتکردەوە پووچەڵ دەبێت.

**٢٠- رێسای (بەخیشن تەنها بە وەرگرتن تەواو دەبێت – التبرع لايتم الا بالقبض[١]):**

ناوەڕۆکی ئەو رێسایە ئەوەیە کەوا هەر بەخشینێکی بێ بەرامبەر خاوەنداریتی بۆ کەسی بەرامبەر ناگوازرێتەوە تەنها دوای وەرگرتنی بەخششەکە نەبێت.

**ئەو حوکمانەی لەو رێسایە دروست دەبن:**

ئەو رێسایە چەند حوکمێکی لێ دەکەوێتەوە لەوانە:

أ- ئەگەر کەسێك سامانێکی گوێزەرەوەی بە دیاری دابێت بە کەسێك بە تەواوەتی نابێتە مولکی ئەو کەسە تاکو وەری نەگرێت.

---

[١] – المجلة المادة (٥٧).

ب- ئەگەر کەسێك سامانێکی بە قەرزی بێ سوود (اعارة) دابێتە یەکێك نابێتە خاوەنی سوود وەرگرتن لەو سامانە تاکو وەری نەگرێت.

ج- ئەگەر کەسێك بڕێك پارەی بە قەرز دابێتە یەکێك ئەو کەسە بۆی نییە دەستکاری بکات تاکو وەری نەگرێت.

د- ئەگەر کەسێك سامانێکی گوێزەرەوەی بە رەهن لە ژێر دەستی خاوەن قەرز دانا بێت خاوەن قەرز بۆی نییە پێش ئەوەی کاتی دانەوەی قەرزەکەی دابێت و قەرزدار نەیداتەوە بیفرۆشێت بۆ ئەوەی قەرزەکەی لە سامانەکەی بگێڕێتەوە تاکو وەری نەگرێت.